

# دەروازەیەك بۆ
# یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

عوسمان علی وەیسی



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **دەروازەیەك بۆ یاسای گشتیی نێودەوڵەتی**
- نووسینی: عوسمان عەلی وەیسی
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسین
- پیتچنین: جوان حەسەن خۆشناو
- بەرگ: جێگر عەبدولجەبار
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٨ چاپی دووەم ٢٠١٢
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی هێڤی (هەولێر)
- لە بەرێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٨٣٤) ساڵی (٢٠١١)ی پێی دراوە

**زنجیرەی کتێب (٣٠٦)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێڕست

# پێشەکی

بەهۆی پێشکەوتنی بەردەوامی کۆمەڵی مرۆڤایەتی، یاسای گشتیی نێودەوڵەتی بەردەوام لە پێشکەوتندایە. ئەم یاسایە ماوەیەکە قۆناغی گواستنەوەی لە فیکری کلاسیکییەوە تەواو کردووە و گەیشتۆتە قۆناغێکی نوێ کە تیایدا تا ڕاددەیەکی باش یاسای نێودەوڵەتی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا باڵادەست بووە، بۆیە شارەزابوون و وەردان و لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی ئەم بوارە، بە یەکێك لە ئەرکە زانستی و تەنانەت نیشتیمانییەکانیش دەزانرێت، نەك تەنیا بۆ قوتابی و زانایانی یاسا، بەڵکو بۆ هەر تاکێك لە هەرکوێیەك بێت، چونکە بەشێوەیەك لە شێوەکان بەم یاسایە مەحکومە، لە لایەکی تر بۆ سیاسەتوان، ڕۆشنبیر، شۆڕشگێر، حزبەکان و لە سەرروویانەوە بۆ کورد و بۆ کوردستان لە هەموو ئاستەکاندا بۆ ڕۆشنبیری تاکی کوردستانیش زۆر گرنگە بزانێت کە ئەم یاسایە، ماناو بنەماکان و ڕەهەندەکانی ڕێسای لقە جۆر بە جۆرەکانی، تا ڕاددەیەکی زۆر چارەنووسی نەتەوەیی، دیموکراسی و پێشکەوتنمان دیاری دەکەن.

گرفتی شۆڕنەبوونەوەو مامەڵەنەکردن و نەخوێندنەوەی دروست و واقیعییانەی ئەم یاسایە، کەمتەرخەمی ڕۆشنبیرانی یاسایی و سیاسی لە گەڵ ئەم لقە گرنگەی یاسا و کەڵك لێوەرنەگرتنی لە باشترین شێوەدا، بە ڕای ئێمە گرفت وکێشەیەکە، زۆر لە کێشە نەتەوەیی و دیموکراتییەکانی کوردستانی لە سەروبەند و لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان، پڕ کێشەتر کردووە، تا بە ئەمڕۆش دەگات مامەڵەیەکی سەرپێیی لەگەڵ ناوو ناوەڕۆکی ئەم یاسایە دەکرێت، لە ئەمڕۆدا کە جیهانی گلۆباڵە و لەلایەکەوە سنوورە گەورەکان کاڵبوونەتەوەو لە لایەکی تر سنووری بچووك و بچوکترو نییۆنەتەوەیی تر دروست بووە، ئەوەندەی تر گرنگی ئەم یاسایە لە سەرجەم بوارەکانی ژیان و کاردا خۆی نمایش دەکات بە شێوەیەك کە گرێدراوە

نێودەوڵەتیەکان بە جۆرێك رێکخراون کە پسپۆڕی تایبەتمەندی ئەم بـوارە دەتوانێـت تـەنها لـە بوارێك لە بوارەکانی ئەم یاسایە پڕۆفێشنالّی تەواو بێت، لێرەوە پێم وایە کە دەبێ لقەکانی ئەم یاسایە لە خوێندنی پرۆگرامەکانی خوێندندا پێگەی شایستە تری بۆ بکرێتەوە.

دەمێکە بەنیازی بەرهەمێکی لەم چەشنەم، بەلاّم دەستی نیاز کورت بـوو!! زۆر حەزدەکـەم زنجیرەیەك کتێب لەم بوارەدا پێشکەشی خوێنەری کوردو کتێبخانەی کـوردی بکـەم، لـە رووی تیۆرییەوە شەن وکەوی سەرجەم لقەکانی ئەم یاسایە بکەم، دواتر و بە بڕشتتر کێشەی کورد لـە یاسای نێودەوڵەتیدا قۆناغ بـە قۆنـاغ دەور بکەمـەوە، لـەم ناوەشـدا سـەردارانی کوردسـتان توێشووی بە بڕشتیان بۆ بەجێهێشتووین، بۆ ئـەوەی رۆڵـەکانی نەتەوەکـەم بـزانن کـە رابـەری نەتەوەی کورد بارزانی مستەفا خەرمانێکی بەبڕشتی لـەم بـوارەدا پێشـکەش بـە کوردسـتان کردووەو، دڵنیام کە تێزی جۆراو جۆر بە خۆوە دەگرێ، جگە لە پێویستی، بـە پێویسـتم زانـی وێنەیەك لە یاداشتەکانی لە پاشکۆدا بخەمە روو.

لە کۆتاییدا هیوادارین ئەم کتێبە هەوڵێك بێت بۆ خستنەڕووی هەندێ لایەنی ئەم یاسایە، هەروەها سوودبەخش بێت یۆ قوتابیانی یاسا لە زانکۆکـانی کوردسـتاندا، کـە بـۆ یەکـەمجارە دەروازەیەکی لەم چەشنە بە زمانی کوردی پێشکەش دەکرێت.

**دانەر**

## ١

## ناساندنی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی[1]

یاسای نێودەوڵەتی بەردەوام لە پێشکەوتندایە، بۆیە بەپێویستی دەزانین سەرەتا ناسینێکی سەرتاپاگیری بۆ بکەین، کە خۆی لە چەندین بابەتی وەك: گرنگی و قۆناغەکانی پێشکەوتن و خستنەڕووی کەسی یاسای نێودەوڵەتی و ناساندن و پێناسەو جیاوازیی لە گەڵ چەند یاسایەکی تردا دەبینێتەوە کە ڕۆڵیان لە ڕێکخستنی پەیوەندییەکاندا هەیە.

### ١-١:گرنگیی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

یاسای نێودەوڵەتی وەك ئامرازێك بۆ کۆتاییهێنان، یان کەمکردنەوەی گرفت و کێشە نێودەوڵەتییەکان، ڕێکخستنی پەیوەندییەکان و دروستکردنی هاوسەنگی لەنێوان بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی وڕێکخستنی پێداویستیەکانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی هاتۆتە ئاراوە، پێویستی بوونی ئەم یاسایە بەردەوامە، ئامرازی سەرەکی دەستەبەرکردنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتییە.

پەرەسەندنەکان و دەرهاوێشتەکانی جیهانگیری و شۆڕشی تەکنۆلۆژیاو زانیارییەکان، گۆڕانی ریشەییان لە هەموو بوارەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا بەگشتی هێناوەتە ئاراوە، یەکێك لە دیاردە هاوچەرخەکان ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان گەلان و تاکەکانی نێوان گەلاندا هاتۆتەدی، شێواز و جۆری پەیوەندییەکان لە سەرجەم بوارەکانی ژیان گەشەیان کردووە، ئەمەش گرنگی و بایەخی خۆی هەیە، بەشێوەیەك ئەستەمە چالاکییەکان لە چوارچێوەی سنووری سیاسی و جوگرافیدا قەتیس بکرێن. ئەم پەیوەندییە، داواکاری و پێداویستییەکانی

---

1. Public International Law

ژیانی مرۆڤایەتی وایان لە دەوڵەت و حکوومەت و دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان کردووە کە کار بۆ جێبەجێکردن و بەرەو پێشبردنی ئەم یاسایە بکەن.

ئاڵوگۆڕو پێشکەوتنەکانی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان لە بوارە جیاوازەکانی فیکری، رۆحی، سیاسی و ئابووری و.. هتد هاتوونەتەدی کە دەرئەنجامی باش و سەرکەوتن و پێشکەوتنیان لە هەردوو لایەنی فیکری و ماددی بۆ مرۆڤایەتی بە دەستهێناوە.[2]

دیارە بەرژەوەندیی گەلان لە سەردەمی ئێستادا تا رادەیەکی زۆر بەیەکەوە بەستراون و مەودای جوگرافیی نێوان گەلان بە ئاستەنگ ناژمێردرێت لە پەیوەندیی نێوانیاندا، هەر بۆیە بەرژەوەندیی دەوڵەتان بە کەنارگیری و لەیەکدی دابڕانی وڵاتان نایەتەدی. بوارەکانی رۆشنبیری و شارستانی بە جۆرێك ئاوێزانی یەکتربوون کە ئەمڕۆ بە موڵکی گشتیی جیهانی ناودەبرێن، هەر مرۆڤێك بیەوێت دەتوانێت لێیان بەهرەمەند بێت، لەلایەکی تر زۆر لە نهێنییەکانی زەوی و گەردوون ئاشکرابوون و دۆزراونەتەوە، بەشێوەیەك مرۆڤ لە دەست بەسەرداگرتن و زانیاری بەدەستهێنانی پێکهێنەرەکانیاندایە. لە گەڵ ئەمەشدا دۆزینەوە زانستییەکان کە بە خێروخۆشی بۆ مرۆڤایەتی دەگەڕێنەوە، سوود لێوەرگرتنیان، بەبێ لەبەرچاوگرتنی کات و شوێن و نەژاد و ئایین و رەنگ و شوێنی نیشتەجێبوون، پێویستی بە ساغ و سەلامەتی سیستەمی سیاسی و هێوری لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و هاوکاری لەنێوان دەوڵەتان و ئارەزووی خزمەتکردنی مرۆڤ و بەرجەستەکردنی مافی گەلان و دابینکردنی ئاشتی و تەنایی هەیە، هەموو ئەمانەش پێویستە بە یاسا رێکبخرێن.

هەروەها دەزانین مێژووی مرۆڤایەتی پڕە لە شەڕو کوشتارو پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ، ئەمەش ئاشتی و گیانی پێکەوەژیان و برایەتی و لەیەکدی تێگەیشتنی تووشی قەیران کردووە.

لەپێناو رووبەڕووبوونەوەو بەگژداچوونەوەی هۆکارەکانی ململانێیە نێودەوڵەتییەکان و سنووردانان بۆ جەنگ، خێرخوازان و ئاشتیدۆستان نەوە دوای نەوە داوایان کردووە کە پێویستە لە رێگەی رێسا و یاسای نێودەوڵەتییەوە سنوورێك بۆ ململانێ و هەڵوێستی نابەرپرسانەی دەوڵەتان دابنرێت.

سەرەتا هەندێ لە رەشبینان پێیانوابوو کە بوونی یاسایەکی لەم چەشنە نایەتەدی، بەڵام رووداوەکان ئەوەیان هێنایەپێش کە مرۆڤایەتی دوو جار لەسەدەی بیستەمدا رووبەڕووی شەڕو کاولکاری بۆوە، بۆیە دەبێت سنوورێك بۆ جەنگ و کاولکاری دابنرێ و دەوڵەتان و کۆمەڵی

---

٢. د. حسن الجلبي، القانون الدولي العام، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٦٤، ص٣.

نێودەوڵەتی بە پەیماننامەی نێودەوڵەتی پابەند بن و بۆ پاراستنی ئاشتی هاوکاربن و لەژێر سایەی ئاشتییەکی بەردەوامدا ژیان بگوزەرێنن، چونکە ئاشکرایە دۆزینەوەی نهێنییەکانی ئەتۆم و گەردیلە و داهێنانی رۆکێت و چەکی کۆکوژ و توانای لەناوبردنی مرۆڤایەتی لە چەند ساتێکی کەمدا، هەموو ئەوانە وایانکرد کە گەلان ئارەزوو بکەن پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیان بەرێکوپێکی و بەشێوەیەك رێکبخەن کە لە تواناییاندا بێت مەترسی لەناوبردنی مرۆڤایەتی کەمبکەنەوە، چونکە بە هەڵگیرسانی جەنگی سێیەمی جیهان مرۆڤایەتی دەبێتە لۆکەی لێکهەڵوەشاوە.[3]

وەکو ئاماژەمان پێکرد، بەدیهێنان و رێکخستنی ئەم ئامانجەش دەبێت بە یاسا بکرێ، بۆ ئەوەی قانوون رۆڵی خۆی ببینێ و پەیامی خۆی بگەیێنێت، بەو پێیەی یاسا، ئەو ئامرازەیە *کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان تاکەکان و نێوان گرووپەکان رێکدەخات لە پێناو بەرجەستەکردنی ئاشتی و ئارامی و هێنانەدی دادپەروەری و خۆشگوزەرانی، دیاریکردنی ماف و ئەرك و سزادانی پێشێلکارانی، یاسا* لە بواری نێودەوڵەتیدا، تەرخانچێتی- دەستدان (اختصاص- competence)ی گەلان و ماف و ئەرکیان لە بەرامبەر یەکتردا دیاری دەکات، رێوشوێنی رێکخستن و دەستەبەرکردنی پەیوەندیی و هاوکارییان نیشان دەدات، ئەو سیستەم و دەزگایانە هەڵدەسەنگێنێت کە کار بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان دەکەن بۆ ئەوەی ئامانج و مەبەستەکانی پێشوو بێنەدی. ئەمانەش وایانکرد لە سەدەی بیستەمدا چەندین رێکخراوی نێودەوڵەتی و لیژنە و دەزگای دەولی بۆ چەك داماڵین و پاراستنی ئاشتی، رێسای دەولی بۆ بەیەکەوەژیانی نێودەوڵەتی و یەکلاکردنەوەی کێشەکان بە رێگەی ئاشتییانە و پاراستن و گەشەپێدانی مافی مرۆڤ و ئازادییەکانی لە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتیدا بێتە ئاراوەو پەرەسەندنی بەرچاویش لەم یاسایە بێتەدی.

### ١-٢: بنەما سەرەکییە (هزر)ییەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

ئەگەرچی لە یۆنانیشدا بیری حکومەتی جیهانی و دنیابینی فراوان و پەیوەندی دەوڵەتان (دەوڵەتە شار) و چەند رێوشوێنێکی تر هەبووە، بەڵام دەکرێ بە شێوەیەکی سەرەکی ئاماژە بەم سێ بنەمایانەی خوارەوە بدەین [4]:

---

٣. د. محمد المجذوب، الوسیط في القانون الدولي العام، الدار الجامعیة للطباعة والنشر، ١٩٩٩، ص ص٥-٦.

٤. د. محمد المجذوب، المصدر السابق، ص١١ وما بعدها.

### ١. باوەڕی مەسیحی

ئەم باوەڕە دەڵێت رەگەزی مرۆڤایەتی یەك كۆمەڵگا پێكدێنێت، ئەمیش كۆمەڵگای مرۆڤایەتی یان كۆمەڵگەی تاكەكانە. ئەم تێگەیشتنە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا شێوەیەكی سیاسی بەخۆوەگرت، دەیەویست رێكخراوێكی گەورەی مەسیحی بێتەدی كە خاوەن سیستەمێكی یاسایی هاوبەش بێت و رێسای گشتی دەرهەق ئەم رێكخراوە پیادە بكات. ئەم بابەتەش بەگوێرەی رێنماییەكانی مەسیحیەت بەڕێوەچوو، زانایانی ئایینی بایەخیان بە مەسەلەی جەنگی رەوا دا، واتە لێكۆڵینەوە لەو مەرجانەی رێگەیان بە پاشایان دەدا هێز بەكاربهێنن بەبێ ئەوەی زیان بە رێنماییەكانی مەسیحیەت بگات یان لە نرخی رێنماییەكانی كەم بكرێتەوە، سەرئەنجام شان بە شانی دروست بوونی دەوڵەتی نەتەوەیی، ئەم یاسایە بە كردەیی هاتە ئاراوە.

### ٢. بیری رۆمانی

ئەم بیرە بۆ یاسای رۆمانی دەگەڕێتەوە، چونكە رۆمەكان جیاوازییان لەنێوان یاسای شارستانی و یاسای گەلان[٥] دا دەكرد. یەكەمیان بەمانای ئەوەیە كە یاسا لە ئاستی ناوخۆی دەوڵەتی رۆمادا جێبەجێ دەكرێت، واتە تەنیا دەرهەق بە رۆمەكان پەیڕەو دەكرا، ئەمەیان بە یاسای شارستانی دەناسرا، بەڵام دووەمیان ئەو یاسایەیە كە پەیوەندیی خەڵكی رۆمای بە خەڵكی دەرەوەی وڵاتی خۆیان لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتدا رێكدەخست، ئەم پەیوەندییەش، پێوەندی نێوان دەوڵەتان یان گروپە سیاسییەكان نەبوو، بەڵكو پەیوەندیی نێوان تاكەكان بوو، كە بەشێكیان لەناو رۆما و ئەوانی تریان لە دەرەوەی رۆما دەژیان، ئەم یاسایە گشتی بوو، پرینسیپی هاوبەش و گونجاوی بۆ سروشتی مرۆڤایەتی تێدا بوو. كەواتە یاسایەك لە چوارچێوەی كۆمەڵگای سیاسی لەناو دەوڵەتدا و یاسایەكی دی كە سنووری دەوڵەتی دەبەزاند و بۆ هەموو خەڵك بوو لە ناو قەڵەمڕەوی ئیمبراتۆر لە ئارادا بووەكە بە یاسای گەلان دەناسرا.

---

٥. Jus Gentium لە لایەن رۆمانیەكانەوە بە مانای یاسای نێودەوڵەتی بە كاردەهات، بۆ كاتی ئێستا لە گەڵ ناوەڕۆكی مەبەستی ئەم یاسایە ناگونجێت، چونكە لای رۆمەكان بە كۆمەڵە یاسایەكی تایبەت دەگوترا كە بێگانە لە هەموو نەتەوە پێشكەوتووەكانی ژێر دەسەلاتی رۆما لێی بەهرەمەند دەبوون، بەرامبەر ئەمە گوزارەی Jus civile بەكاردەهات كە ئەو یاسایانەی دەگرتەوە كە تەنها بە سەر رۆمانیەكان خۆیاندا جێبەجێدەكرا، دوزارشتی لاتینی لەم رووەوە كە قبوڵ كراوە بە ناوی یاسای نێوان نەتەوەكانە Jus intergentes. وەك لە دواتر ئاماژەی بۆ دەكرێت.

### ٣. بیری ئیسلامی

شەریعەتێکی سەربەخۆیە و کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان لەمەڕ یاسای بەراوردکاری ئەوەیان قبوڵ کردووە، وەك کۆنگرەی لاهای ساڵی١٩٣٧، توێژینەوەی نوێنەرانی عەرەب بۆ کۆمەڵەی گەلان لە ساڵی ١٩٣٩ و بۆ نەتەوە یەکگرتووەکانیش لە ساڵی١٩٤٥ ئەمەیان ڕوون کردۆتەوە. بیری ئیسلامی تەنیا بایەخ بە بیروباوەڕو خوداپەرستی و ڕێورەسمی ئایینی نادات، بەڵکو نیزامێکی رەوشتی و کۆمەڵایەتی و یاساییە، بە زانستەکانی شەریعەت ناسراوە، ئەو بەشەشی کە بە (السیر) ناسراوە، یان بەشی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی، لە یاسای ناوخۆ جیا نابێتەوەو وەك ئەو پابەندکارە. ئەم بەشە ڕێگای دەوڵەت لە بارەی جەنگ و شەڕ، هەروەها بایەخدان بە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان وەك جیهاد و دەستکەوت و جیاوازی دین و بازرگانی و...هتد روون دەکاتەوە. عبد الرحمان الأوزاعی (لوبنانی، ٧٠٧ز- ٧٧٤ز)، و محمد بن حسن الشیبانی (٧٥٠- ٨٠٤ز، عیراقی) لە زانا هەرە بەناوبانگەکانی عەرەبن لەم بوارەدا.

ئەم سێ ڕێبازو ئاراستە هزرییە کاریگەریی زۆریان هەبووە لەسەر نوسینەوەو دانانی بیردۆزو شیکردنەوەی بنەماکان بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەلایەن زانایانی ئەو سەردەمانە، ئەو بنەمایانەش بوونە هەوێنی سەرهەڵدانی یاسایەك بە ناوی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی.

هەر لە چاخی ڕێنیسانسەوە کاریگەریی زانایان بە یاسای رۆمانی لە برەو دابوو تا گەیشتە ئەوەی دەبێت پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان یان کۆمەڵەکان یان سیستەمە سیاسییە جۆراو جۆرەکان بە یاسایەك ڕێکبخرێت، لێرەدا یاساناسان بە تیۆریزەکردن و توێژینەوە پەرەیان بە پێشخستنی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی داوە.

### ١-٣: قۆناغەکانی پێشکەوتنی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

ئەوروپا، تا کۆتایی سەدەی پانزە، لە لایەك لەژێر رکێفی حوکمڕانێتیی سیستەمی ئایینی دابوو، پاپاو یاسای کڵێسا بەڕێوەیان دەبرد، لە لایەکی تریشەوە لەژێر رکێفی سیستەمی زەمەنی (دنیایی) دابوو کە ئیمپراتۆر و یاسای کاتی فەرمانڕوابوون.کاتێ ڕێنیسانس لە دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی جەرمانی لە ١٤٩٣ ز دەستی پێکرد، ئەوروپا لەبەر چەندین هۆکار بووە بە چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ. گۆڕانی سیستەمی دەرەبەگایەتی بۆ سیستەمی سەرمایەداری، دۆزینەوەی کیشوەری ئەمریکا و لەدایکبوونی هەستی ناسیۆنالیستی و سەرهەڵدانی بزووتنەوەی چاکسازیی ئایینی و دواتر دەرکەوتنی بیری نەتەوەیی و.... هتد،

گرنگترینی ئەو هۆیانە بوون کە وایانکرد یەکێتیی ئایینی لە ئەوروپا بەکۆتابێت و دەوڵەت لــە کەنیسە جیا ببێتەوە و سەرئەنجام ئەم یاسایەش تیۆریزەی بۆ بکرێ.

لـــەم ناوەشـــدا زانایـــانی بـــواری یاســـای نێودەولـــەتی پەیـــدا بـــوون، گـــرنگترین و بەناوبانگترینیشـــیان **هۆگــۆ گروســـیۆس** (١٥٨٣-١٦٤٥)[٦]ی هۆڵەنـدی بـوو، کـە بـە دامەزرێنەری یاسای گشتیی نێودەوڵەتی لەقەڵەم دەدرێت و بنەما تیۆرییە هاوچەرخەکانی دارشت و کتێبێکی بە ناوی یاسای جەنگ و ئاشتی دانا، کە زۆر لە دەوڵەتان بـۆ مـاوەی دوو سەدە زێتر کردیان بە دەستووری خۆیان بۆ رێکخستنی پەیوەندییەکانیان بـەهۆی ئـەو حوکم و سیستەمانەی کە لە یاسای نێودەوڵەتیدا هەبوون. مێژووی کۆن پڕە لە بەڵگە بـۆ بوونی پەیوەندیی نێودەوڵەتی لە سەردەمە دێرین و کۆنەکاندا. لێـرەدا بـەکورتی قۆناغـە جیاوازەکانی پێشکەوتنی یاسـای نێودەولـەتی دەخەینـە روو، بەسـەر چـەند قۆنـاغێکی مێژووییدا دابەش دەبێت:

١.  سەدە کۆنەکان، لە سەرەتای مێژووەوە تا رووخانی ئیمپراتۆریـەتی رۆمـا سـاڵی ٤٧٦ ز.

---

٦. Hougo Grotius (١٥٨٣-١٦٤٥) هۆگۆ گرۆسیۆس (١٥٨٣-١٦٤٥) لە شاری دلفت لە هولندا لەدايك بووە، لە خانەوادەیەکی بنەچە فەرەنسی، لە زانکۆی لاید لە هۆلەندا و دواتر لە زانکۆی اورلیان لە فەرەنسا کە دکتۆرای تێدا وەرگرت خوندويەتی، لە کاتێکدا ژیاوە لە ململانێ و ناکۆکی ڕێچکە گـەرایی ئـاینی لـە نێـوان کاسۆليك و پرۆتستانت لە لوتكەدا بوە، دوای ئەوەی خوێندن لە فەرەنسا تەواو دەكات دەگەڕێتـەوە هۆڵەنـدا و لەگەڵ زۆرانبازی سیاسیەکان هاوکـات دەبێـت، وەك پـارێزەرێکی لێهـاتوو ئەسـتێرەی دەگەشـێتەوەو دەبێتـە راوێژكار لە کۆمپانیای هیندی رۆژئاوایی، ئەم دەرفەتە دەقۆزێتەوە بۆ ئەوەی دوو کتێب لەسەر یاسای (غنائم) دابنێت لەساڵی ١٦٠٤ کە سەرەنجام تیۆرێك لەسەر ئازادی دەریاوانی دەخاتە ڕوو .

بەڵام کارو باری سیاسی و دەست گرتن بەو رێ و شوێنانەی کەدژی پادشای وولاتە، دەیگەێنێتە بەردەم دادگـا، لەساڵی ١٦١٨ بە زیندانی تا هەتایی حوکم دەدرێت، دواتر هەڵدێت و دەگەڕێتەوە فەرەنسا، لەلایەن سـەرۆکی فەرەنسا کە هاوڕێیەتی پێشوازی لێ دەکرێ و مافی پەنابەری دەدرێتی و پارێزگاری لویسی سـێزدە بـە دەسـت دێنیێ، لە فەرەنسا کتێبە بەناوبانگەکەی یاسای جەنگ و ئاشتی سـاڵی ١٦٢٥ دەنوسـێت کـە بـەناوبانگترین کتێبە لە بواری یاسای گشتی نێودەوڵەتیدا ، ساڵی ١٦٣٤ دەبێتە سەفیری سوید لە فەرەنسـا و ١٠ سـاڵ لـەم پلەیە دا دەمێنێ ، لە ٢٨ اب ١٦٤٥ لە ناو نقوم بوونی کەشتیەکدا گیان لە دەست دەدات .

٢. سەدەکانی ناوەراست، لە رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆماوە دەست پێ دەکات تا پەیماننامەی ویستڤالیای ساڵی ١٦٤٨ز، کە هەندێك ئەو پەیماننامەیە بە بەڵگەی لە دایکبوونی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی دەهێننەوە.

٣. سەردەمی هاوچەرخ، بە ئاشتیی ویستڤالیا دەستی پێکرد و بە جەنگی یەکەمی جیهان کۆتاییپێهات.

٤. *سەردەمی نوێ*، بە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهان دەست پێدەکات تا کۆتایی شەڕی سارد.[٧]

٥. سەردەمی ئێستا، بە رووخانی بلۆکی رۆژهەڵات لە ساڵی ١٩٩٠ دەست پێدەکات تا ئەمرۆ [٨].

### ١-٤: پەیماننامەی ویستڤالیا و دروستبوونی کۆمەڵی نێودەوڵەتی

شەڕی سی ساڵەی ئایینیی کاتۆلیك و پرۆتستانت لە ئەوروپا کە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا بە هۆی چاکسازی ئایینی روویدا، دواتر هۆکاری سیاسی بەخۆوە گرت، سەرئەنجام وڵاتانی ئەوەدەم لە شاری ویستڤالیا ساڵی ١٦٤٨ لە ئەڵمانیا کۆبوونەوەو بنەماو پرینسیپەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتیی نوێیان دارشت و کاریگەریی بنەڕەتییان لەسەر پێشکەوتنی کۆمەڵی نێودەوڵەتی هاوچەرخ دانا.

لە بنەما هەرەدیارەکانی ئەم پەیماننامەیە [٩]: پرینسیپی یەکسانیی نێوان دەوڵەتان لە ئەرك و مافدا، کاتۆلیك بێت یان پرۆتستانت، پادشایەتی بێ یان کۆماری. کەواتە دەوڵەتان بەگوێرەی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی هەموویان لەیەك پلەدا دەبن و هیچ جیاوازیەك بەهۆی ئایین یان بەهۆی سیستەمی حوکمڕانی لە ئارادا نامێنێ، ئەمەش لەم کۆنگرەیەدا هاتەدی کە

---

٧. بۆ زیاتر بڕوانە: د. محمد سامي عبدالحميد، اصول القانون الدولي العام، القاعدة الدولية، مؤسسة الشباب الجامعية، ط١، ١٩٧٢، ص١٢٦، وما بعدها.

٨. دانانی سەردەمی ئێستا بۆچوونی ئێمەیە، چونکە سیستەمی نوێ ی جیهانی، وێستگەیەکی سەرەکی گۆڕانکاری لە سەرجەم بوارەکاندا هاتۆتە دی، یاسای نێودەوڵەتیش لە هەر سێ لایەنی داڕشتن و جێبەجێکردن و دادوەریەوە وەرچەرخانی گرنگی بە خۆوە دیتووە.

٩. بۆ زیاتر بڕوانە: د.جيرهارد فان غلان، القانون بين الأمم (١)، ص ٢٤ وما بعدها، ود. محمد طلعت الغنيمي، الأحكام العامة في قانون الأمم (قانون السلام)، منشاة المعارف بالأسكندرية، ص ٦٨ وما بعدها.

لەسەر خواستی پاپا نەکرا، بەڵکو لەلایەن ئەوانەوە بوو کە خوازیـاری بەرژەوەنـدیی هاوبەشـی نێوان دەوڵەتان بوون، گرنگترین ئەو پرینسیپانەی لەم پەیماننامەیەدا دانیان پێدا نرا، ئەمانـەی خوارەوە بوون:

١. پرینسیپی سەربەخۆیی نێوان دەوڵـەتان، دوای ئـەوەی دەوڵـەتان کـە لـە سـەدەکانی ناوەڕاستدا لەژێر دەسەڵاتی پاپا و ئیمپراتـۆردا بـوون، ئـازاد و سـەربەخۆ بـوون، سـەروەرێتی شێوەیەکی رەهای وەرگرت، واتە بوونە حوکمڕانی رەها بوو لەناوخۆی وڵاتدا، بۆ هیچ لایەنێکی تر لە ئاسـتی دەرەوە ملکـەچ ناکـات. کەواتـە پاپـا سـەرۆکایەتیی دەوڵـەت ناکـات و تاکـە سەرۆکێك کە دەسەڵاتی هەبێت بەسەر هەموو دەوڵەتانی ئەوروپادا کۆتایی هات.

٢. پرینســـیپی هاوســـەنگیی نێودەوڵـــەتی، ئـــەم پرینســـیپە وەك گەرەنتییـــەك بـــۆ جێبەجێکردنی پەیماننامەی گۆرین هاتـەئاراوە کـە دەوڵـەتان بـەڵێنیان دا بـە هێشـتنەوەو پاراستنی بارودۆخی سیاسی و هەرێمایەتیی نێودەوڵەتی بۆ پاراستنی ئاشتی لـە ئـەوروپا ، بەو مانایەی کـە نـابێ دەسـەڵاتی سیاسـی و هـەرێمیی هـیچ دەوڵـەتێك لەسـەر حسـێبی دەوڵەتێکی تر فراوان بکرێت، هەروا بەرهەڵستی هەر چەشنە هەوڵێکی لەم چەشنە بکرێ کە ئاشتی نێودەوڵەتی تێکبدات.

٣. رێکخستنی پەیوەندییەکان، یەکێك لەو بابەتانەی کە ئـەم پەیماننامەیـە هێنایـەدی، رێکخستنی پەیوەندییەکان بوو، ئەویش بـە ئـاڵوگۆرکردنی نوێنەرایـەتیی دیپلۆماسـی، بۆیـە ئاڵوگۆری سیستەمی باڵیۆزخانەی کاتیـان پیـادە کـرد ، وەك وەڵامێـك بـۆ بەرەوپێشچـوونی پەیوەندیی بەردەوامی نێوان دەوڵەتان.

لەئاکامی بەرقەراربوونی پەیماننامەی ویستفالیاو جەختکردن لەسەر پرینسیپی یەکسانی و سەربەخۆیی و سەروەرێتی، بۆ یەکەمجار کۆمەڵی نێودەوڵەتی لەدایك بوو، واتە بوونی کۆمـەڵێ دەوڵەت کە دان بە سەربەخۆیی و یەکسانی یەکتردا بنێن و بەیەکەوە بەگوێرەی ئەو رێسـایانەی کە بە ویستی خۆیان قبوڵیان کردووە، بژین.

لەلایەکی ترەوە، یاسای گشتیی نێودەوڵەتی تـەنیا ئـەو یاسـایە نییـە کـە رێسـاکانی بـە یەکەوەژیانی نێوان دەوڵەتانی خاوەن سەروەر بێنێتە ئاراوە، واتە ئەو یاسا کلاسـیکییانەی کـە پەیوەندییە دیپلۆماتییەکان رێکدەخەن بۆ ئەوەی رێگە لە دوژمنایەتی و سنوور بەزاندن بگرێت و لانی کەمی ئاسایش و ئاشتی لە جیهاندا دابـین بکـات، بـەڵکو ئـەم یاسـایە ئـەو کۆمەڵـە رێسایانەش دەگرێتەوە کە هاریکارییەکی باش و بەبەرهەم لـەنێوان دەوڵەتانـدا بێنێتـەدی لـە پێناو ئایندەیەکی باشتر بۆ مرۆڤ، بە مانایەکی تر، یاسای نێودەوڵەتی تەنیا ئامرازێك نییە بـۆ

بەدەستهێنانی گەشەپێدان و خۆشگوزەرانی و هاریکاری لە کۆمەڵی نێودەوڵەتی، بۆیە پێویستە چاوپێداخشاندنەوە بە بنەما بنەڕەتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی و گۆڕانی پێویست بکرێت لەمەڕ ئەو بابەتانەی کە چارەسەریان دەکات و ئەو کەسانەش کە روویان تێدەکات و گوتاریان ئاراستە دەکات.[١٠] لە رۆژی ئەمڕۆشدا گرنگیپێدانی ئەم یاسایە تەنیا لەوەدا نییە کە مەرجەعی سەرەکی رێکخستنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و دیاریکردنی ئەرك و مافەکان بێت و چارەسەری ئەو مەسەلانە بکات کە پەیوەندییان بە کاروباری نێودەوڵەتییەوە هەیە، بەڵکو لەتەك ئەوانەدا هەندێ لە یاساناسان داوادەکەن چوارچێوەی ئەم بوارە فراوانتر بکرێت و بابەتی فراوانتر بگرێتەخۆ بۆ ئەوەی یاسای نێودەوڵەتی ببێتە یاسای گشتیی هەموو جیهان، لە لایەکی تر ئەم یاسایە گرنگییەکی تایبەتیش بە مافەکانی مرۆڤ دەدات، وەك ئامانج و مەبەست لە تاکەکەس دەڕوانێت، لە سۆنگەی ئەمەوە دەبێ دەوڵەتان لەپێناو تاکەکاندا کار بکەن و هەموو رێسا یاساییەکانی نێودەوڵەتی تایبەت بەم بوارە بەهەند وەربگرن.

## ١-٥: ناساندنی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

بۆ ناساندنی یاسای نێودەوڵەتی، بۆچوونی جۆراوجۆر هەن، بۆ تێگەیشتن لە ماناو ناوەڕۆکی ئەم یاسایە پێویست دەکات رێبازە یاساناسییەکانی ئەم لایەنە بخەینە روو، بەڵام ئەم رێبازە فیقهییانە، یاسای نێودەوڵەتی لە رێگەی باسکردن و خستنەڕووی کەسەکانی ئەم یاسایەوە تاوتوێ دەکەن، هەربۆیە سەرەتا پێویستە کەسی یاسای نێودەوڵەتی بناسین، ئینجا پێناسەی ئەم یاسایە بخەینەڕوو.

١- ٥-١:کەسێتی یاسایی لە بواری یاسای نێودەوڵەتیدا

کەس لە زمانی ئاسایی و لە دەرەوەی بواری یاسادا، لە زانستی فەلسەفەو ئەخلاق و دەروونزانی دا، بەمانای مرۆڤ دێت، بەڵام لە بواری یاسادا کەس ماناو رێسای خۆی هەیە، کەسی یاسایی هەر بوونیادێکی ماددی و مەعنەوی دەگرێتەوە کە یاسا رووی دەمی تێ دەکات و لێهاتوویی (شیاو - گونجاو) ئەوەی هەبێت ماف بەدەستبهێنێ و ئەرك وەئەستۆی خۆیەوە بگرێ.

مەبەست لە کەسی یاسای نێودەوڵەتی ئەوەیە هەر یەکێك بکارێت و بشێت ماف و ئەرك وەئەستۆی خۆی بگرێت، ئەو کەسە لە رووی یاساییەوە دەبێتە مەبەست و خاڵی بنەڕەتی ئەو

---

١٠. د. محمد المجذوب، المصدر السابق، ص ٧-٨.

یاسایە، کە بەهۆیەوە ئەو ماف و ئەرکانە بەرجەستە دەبن کە ئەم یاسایە بۆی دیاری کردووەو لەپێناوی ئەودا هاتوونەتەئاراوە.[11] لێهاتوویی کەسی یاسایی دوو جۆرە:

١. شیاوی هەمیشەیی (لێهاتوویی هەمیشەیی — شایستەیی ماف هەبوون — اهلیة الوجوب): شیاوێکی (مجرد)ە کە خاوەنەکەی بەهۆیەوە دەرفەتی ئەوەی پێدراوە سوود لە ماف وەربگرێت و ئەرك لەئەستۆ بگرێت.

٢. شیاوی راپەراندن (لێهاتوویی - توانایی راپەڕاندن - اهلیة الأداء): واتە کەسێك توانای ئەنجامدانی کارو هەڵسوکەوتی یاسایی هەبێت، بە شێوەیەك یاسا قبوڵی بکات و بتوانێ ماف وەدەست بخات و ئیلتیزامات هەڵبگرێت.[12] خاوەنی شیاوی یاسایی بە هەردوو جۆری هەمیشەیی و راپەراندن، یان کەسی سروشتییە یان کەسی مەعنەوی (واتایی). نموونە وەك تاکەکەس بۆ یەکەمیان لە یاسای ناوخۆی وڵاتاندا، دووەمیان لەسەر فیکرەیەکی ئیعتیباری وەستاوە کە کۆمەڵە کەسێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی دیاریکراو یەکدەگرن وەکو کۆمپانیا، رێکخراو، یان کۆمەڵە موڵکێکە دادەنرێت بۆ بەدیهێنانی قازانج وەکو بانك، کەسایەتیی یاسایی وەردەگرن و دەتوانن لەو ماف و ئەرکانە بەهرەمەند بن و بەهۆیەوە ئەو ئامانجانە بە دەستدەهێنن کە ئەم کەسە لەپێناویدا هاتۆتەدی و بە کەسی مەعنەوی دەناسرێت، نموونەی ئەم کەسە لە یاسای نێودەوڵەتیدا: دەوڵەت، رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، یەکێتییە نێودەوڵەتییەکان، هەرێمە نێودەوڵەتییەکان. هەنووکە تاکەکەسیش گرنگی زۆری لەلایەن یاسای نێودەوڵەتییەوە وەرگرتووە.

لێرەدا یاسای نێودەوڵەتی وەك هەر یاسایەکی تر ئەم دوو جۆرە لێهاتووییە دەناسێ، هەربۆیە هەموو دەوڵەتێك توانای (مجرد)ی هەیە بۆ وەرگرتنی ئەو ماف و ئەرکانەی کە ئەم یاسایە بۆی دیاری دەکات، واتە (اهلیة الوجوب - شیاوی هەمیشەیی). بەڵام هەموو دەوڵەتێك شیاوی راپەراندنی نییە، ئەگەر خۆی توانایەکی پراکتیکی بۆ بەئەستۆگرتنی شیاوی هەمیشەیی نەبێ، وەك ئەو دەوڵەتانەی لەژێر سیستەمی پاراستندان، کە هەموو

---

١١. بۆ زانیاری سەبارەت بە کەسی یاسایی بڕوانە: د. سليمان بو ذياب، المباديء القانونية، العامة، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشروالتوزيع، بيروت، ط١، ١٩٩٥، ص٥٩ دواتر.

١٢. بڕوانە: د. عوض احمد الزعبي، المدخل الى علم القانون، دار وائل للنشر، ط١، ٢٠٠١، ص ٤٣٢.

ئەو ماف و ئەركانەیان هەیە كە دەوڵەتێكی تر هەیەتی، بەڵام ناكارێ كەڵك لەو ماف و ئەركانە لە بەشێكی یان هەمووی وەربگرێ لەبەر چۆنیەتی پابەندبوون و ملكەچبوونی بە سیستەمی حیمایەوە.[١٣]

## ١-٥-٢: پێناسەی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

دوای ئەوەی زانیمان مەبەست لە كەسی یاسایی چییە، كەسی یاسایی نێودەوڵەتیمان ڕوونكردەوە، پێویستە پێناسەی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی بكەین، كە دەكرێ ئاماژە بە ڕێبازەكانی یاساناسان بكەین و بەگشتیی سێ ڕێبازمان بۆ پێناسەكردنی ئەم یاسایە هەیە:

١. ڕێبازی كلاسیكی: دەوڵەت، تاكە كەسی یاسایی نێودەوڵەتییە

یاساناسانی كلاسیكی پێیانوایە یاسای نێودەوڵەتی تەنیا بایەخ بە ماف و ئەركی دەوڵەتان دەدات، چونكە كاتێ كۆمەڵی نێودەوڵەتی بۆ یەكەمجار بەهاتنەئارای دەوڵەتە- نەتەوەكان Nation-States پەیدابوو، لە ئەوروپا لە سەدەی حەڤدە لە دایك بوو، تەنیا بایەخی بە دەوڵەت دەدا. هەربۆیە دەوڵەت بە تەنیا خاوەنی خاسیەتی كەسی یاسایی نێودەوڵەتی بوو.

ئەم پێناسەو ناساندنە زیاتر لە سێ سەدەی خایاندو وەكو خۆی مایەوە، لە ساڵی ١٦٢٥ز-ەوە، گروسیوس پێناسەی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی كرد: (ئەو یاسایەیە كە حوكمی پەیوەندییەكانی نێوان دەوڵەتان دەكات). لە سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەم و تەنانەت لە باری ئێستاشدا لایەنگرانی ئەم جۆرە ناساندنە هەن. هەربۆیە دادگای نێودەوڵەتیی هەمیشەییش بەم پێناسەیەی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٢٧دا دەڵێ: یاسای نێودەوڵەتی، ئەو یاسایەیە كە حوكمی پەیوەندییەكانی نێوان دەوڵەتە سەربەخۆیەكان دەكات.[١٤]

### هەڵسەنگاندنی ڕێبازی كلاسیكی

ڕێبازی كلاسیكی لەگەڵ ئامانجەكانی سێ سەدە لە مەوبەری یاسای نێودەوڵەتی و باری كۆمەڵی نێودەوڵەتی ئەودەمدا دەگونجا،كە كۆمەڵی نێودەوڵەتی تەنیا لە دەوڵەت و یاسای نێودەوڵەتیش تەنیا پەیوەندیی نێوان ئەو دەوڵەتانەی ڕێكدەخست.

---

١٣. د.حسن الجلبی، المصدر السابق، ص ١٦٥.

١٤. د. علی صادق أبو هیف، القانون الدولی العام، ط١١، الأسكندرية، ١٩٧٥، ص١٨.

بەلاّم ئەم ناساندنە لەگەلّ ئامانج و ئەو پەیوەندییانە ناگونجیّ کە ئێستا ئەم یاسایە ڕێکیاندەخات. چونکە ڕێکخستنی پەیوەندییەکان تەنیا لەنێوان دەولّەتاندا نییە،کۆمەلّی نێودەولّەتیش تەنیا لە دەولّەتان پێکنایەت و لەگەلّ ئامانجەکانی ئێستای ئەم یاسایەدا ناگونجێت. ئێستا کۆمەلّی نێودەولّەتی بێ لە دەولّەت، لە ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراو و کەسی نێودەولّەتیی تر پێکدێت، یەکێتییە نێودەولّەتییەکان، ڕێکخراوە نێودەولّەتی و هەرێمی و تایبەتییەکان، یەکێتییە کارگێڕییە نێودەولّەتییەکان، لیژنەی ڕووبارە نێودەولّەتییەکان، ئەو هەرێمانەی لەژێر سیستەمی چاودێریدان یان ئەم سیستەمە دەیانگرێتەوە، هەروەها تاك وکەسەکانی تری ئەم یاسایە، کە یاسای نێودەولّەتی ڕاشکاوانە ئاڕاستەی هەموو ئەو کەسانە دەکات و ماف و ئەرکیان بۆ دادەنێ و پەیوەندییەکانیان ڕێکدەخات. لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ڕێبازی کلاسیکی لەگەلّ ڕەوتی پێشکەوتن و پەرەسەندنی کۆمەلّی نێودەولّەتیی هاوچەرخدا ناگونجیّ.

٢. ڕێبازی بابەتی: تەنیا تاکەکەس، کەسی یاسای نێودەولّەتییە.

بە پێچەوانەی ڕێبازی کلاسیکی، ڕێبازی یاسای بابەتی دەلّێ تەنیا تاکەکەس، کەسی قانوونیی یاسای نێودەولّەتییە. یاساناسی ناسراوی فەرەنسی، دیگی [١٥]، بنیاتنەری ئەم بۆچوونەیە، کە نکولّی لە کەسایەتیی مەعنەویی دەولّەت دەکات و بە بۆچوونی ئەو دەولّەت تەنیا گریمانەیەکەو هیچ بەهایەکی نییە، دیارترین لاینگری ئەم قوتابخانەیە پرۆفیسۆر جورج سیل [١٦]، جەخت دەکاتەوە کە یاسای نێودەولّەتی تەنها ڕووی دەمی دەکاتە تاکەکان چونکە هەرخۆیان خاوەن هۆش و خواستن.

---

١٥. Leon Duguit لیون دوگی (١٨٥٩-١٩٢٨): لە بە ناوبانگترین یاساناسی فەرەنسایە، ڕاگری کۆلێژی یاسا بوو لە زانکۆی بوردو لە باریس تا کۆچی دوایی کرد، کتێبێکی گرنگی بە ناوی (یاسای گشتی) دانا، لە یەکێك لە کتێبەکانیدا تیۆری خۆی سەبارەت بە بنەماکانی یاسای گشتی نێودەولّەتی داناوە،کە تیۆری هاریکاری کۆمەلّیەتییە، تیایدا نکولّی لە کەسی یاسایە مەعنەوی دەکات. ڕێبازی دوگی لەکتێبە بەناوبانگەکەیدا بەناوی (باسێك لە یاسای دەستوریدا — المطول في القانون الدستوري ) دا هاتووە .

١٦. Georges Scelle جۆرج سیل –(١٨٧٨ -١٩٦١): لە بەناوبانگترین نوسەرانی یاسای گشتی نێودەولّەتیە لە فەرەنسا، مامۆستا بوو لە کۆلێژی یاسای زانکۆی باریس سالّی ١٩٣٣، دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە زانکۆی دیگۆن بوو، لە دیارترین لایەنگرانی عەمید دوگییە کە بنەمای ئەم قوتابخانەیە لە

پرسیار ئەوەیە کە ئایا بۆچی لای لایەنگیرانی ئەم ڕێبازە لەپێشەوەیان دیگی، تەنیا تاکەکەس بە کەسی یاسایی دەزانن؟ چونکە ئەم ڕێبازە نکوڵی لە خودی کەسایەتیی مەعنەوی دەکات جا چ بۆ دەوڵەت بێت یان کەسایەتییە مەعنەویەکانی تر، تەنیا تاکەکەس، کەسی یاساییە و خاوەن درکپێکردن و ئیرادەیە، کەواتە تەنیا کەسی سروشتی (خواسایی) خاوەن ئیرادەیەو قانوون دەتوانێ موخاتەبەی بکات و بە کەسی یاسایی دابنێ، ئەمەش لە ئاستی نێودەوڵەتی و ناوخۆییدا وایە. چونکە کەسی مەعنەوی بەپێی بۆچوونی ئەم ڕێبازە ناکرێ،کەسایەتیی یاسایی هەبێ.[١٧]

## هەڵسەنگاندنی ئەم ڕێبازە

نکوڵیکردن لەکەسایەتی یاسایی کەسی مەعنەوی و لەوانەش دەوڵەت لە لایەن ئەم ڕێچکەیەوە بە زیادەڕۆیی لەقەڵەم دەدرێت و ڕەخنەی لێ دەگیرێ کە لە ڕادەبەدەر واقیعی بارودۆخی کۆمەڵی نێودەوڵەتی پشت گوێ خستووە، چونکە دەوڵەت کەسایەتی سەرەکییە تێیدا، بەڵام تاکەکەس -بەگوێرەی- ڕای زۆر لە یاساناسانی نێودەوڵەتی — بەم شێوەیەو تا ئێستا نەبۆتە کەسی یاسایی نێودەوڵەتیی گشتی، هەروەها مامەڵەی نێودەوڵەتی لەگەڵ تاکەکەسدا لە ئاستی نێودەوڵەتی لەگەڵ یاسای نێودەوڵەتی ڕاستەوخۆ نییە، بەڵکو سەرەتا لە ڕێگەی دەوڵەتی خۆی و لە هەندێ باریشدا لە سەرووی دەوڵەتەوە دەتوانێ مامەڵە بکات.

---

وەدایە کە ( یاسا لەدایك بوونی هاریکاری کۆمەلأیەتییە و نکولّی لە بیری کەسێتی و سەروەری دەوڵەت دەکات) وەك بنەمایەك بۆ پێشخستنی یاسای نێودەوڵەتی دانا، ناسرا بوو بە بەهێزی و روونی بەڵگەکانی، لە بوارە جیاجیاکانی یاسای گشتی نووسیویەتی، بەلاّم لە بواری یاسای نێودەوڵەتیدا زیاتر بەناوبانگ بوو، کە پوختەی بۆ چوونەکانی لەم کتێبانەدایە :

باسێك لە یاسای گشتی نێودەوڵەتی (دووبەشە ) ١٩٣٣-١٩٣٤ .

پوختەیەك لە یاسای گشتی نێودەوڵەتی (١٩٤٣).

محازەرەکانی لە یاسای گشتی نێودەوڵەتی ١٩٤٨،

نەتەوەیەکگرتوەکان لە ساڵی ١٩٤٩ دا بۆ ئەندامی لیژنەی یاسای نێودەوڵەتی هەڵبژارد ، لە دیارترین ئەندمانی بوو تاکۆ چی دوایی کرد ، هەروەها ئەندام بوو لە دادگای دادی هەمیشەیی نێودەوڵەتی .

١٧. ليون دگی ، دروس في القانون العام، ترجمة د.رشدي الخالد، منشورات مركز البحوث القانونية، وزارة العدل، بغداد، ١٩٨١، ص٤٦ وما بعدها.

### ٣. ڕێبازە هاوچەرخەکان:

دەوڵەت، کەسی سەرەکی یاسای نێودەوڵەتیی گشتییە. زۆربەی یاساناسان پێیانوایە کە دەوڵەت تاکە کەسی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی نییە، بەڵکوکەسی سەرەکیی یاسای نێودەوڵەتی گشتییە، یاساناسانی ئەم ڕێبازە دەبنە سێ گروپ [١٨]:

گروپی یەکەم:

ئەم گروپە، دەوڵەت بە کەسی سەرەکیی یاسای نێودەوڵەتی دادەنێ، بەلاَم باس لە کەسانی تری سەرەکی یان ناسەرەکی ناکات، بەلای ئەوەشدا ناچێ کە کەسایەتییەکانی تر کامانەن، خۆی لە پێناسەکردنیان یان دیاریکردنی ژمارەیان دەپارێزێ. بۆ نموونە شتروب strupp پێناسەی ئەم یاسایە دەکات و دەڵێ کۆمەڵە ڕێسایەکی یاساییە کە ماف و ئەرکی دەوڵەتان دەگرێتە خۆی لەگەڵ ماف و ئەرکی کەسەکانی تری یاسای گشتی نێودەوڵەتی، شارل رۆسو Charles Rouseau بەم جۆرە پێناسەی ئەم یاسایە دەکات:

یاسای گشتیی نێودەوڵەتی ئەو یاسایەیە کە بەشێوەیەکی بنەڕەتی بایەخ بە ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتان دەدات، یان بەشێوەیەکی تر ئەو یاسایەیە کە پەیوەندیی نێوان کەسەکان ڕێکدەخات.

گروپی دووەم:

ئەم گروپە بە ئاشکرا پێی وانییەکە تاکەکەس یەکێك بێت لە کەسەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی.لویس دلبیز دەڵێ کۆمەڵە ڕێسایەکی یاساییە کە حوکمی پەیوەندی نێوان دەوڵەتان و پێکهاتەکانی تری نێودەوڵەتی تر دەکات – کڵێسای کاسۆلیکی – شۆڕشگێڕە دانپێدانراوەکان و دانپێدانەنراوەکان – نەتەوە یەکگرتووەکان ....هتد، واتە کە ناوی چەند کەسێکی یاسایی دێنێ، ڕاشکاوانە تاکەکەس دوور دەخاتەوەو بە کەسی یاسایی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی نازانێ، بۆ نموونە بادفان دەڵێ: یاسای نێودەوڵەتی، کۆمەڵە ڕێسایەکی یاساییە کە پەیوەندیی دەوڵەتە سەربەخۆیەکان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە جۆراوجۆرەکان لە پەیوەندییە دووقۆڵییەکاندا پابەند و ڕێکدەخات.

---

١٨. د.عصام العطية، القانون الدولي العام، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، بغداد، ٢٠٠٦، ط٦، ص١٤ وما بعدها.

**گروپی سێیەم:**

ئەم گروپە لە پاڵ دەوڵەت و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا جێگایەکی بەرتەسك بۆ تاکەکەس دادەنێ و لە پەراوێزدا بە کەسی یاسایی دادەنێت، لەوانە پرۆفیسۆر باستید کە پێناسەی ئەم یاسایە دەکات و دەڵێ: یاسای گشتیی نێودەوڵەتی ئەو کۆمەڵە ڕێسا یاساییەیە کە لە کۆمەڵی نێودەوڵەتیدا جێبەجێ دەبێت، لە نێوان دەوڵەتانی خاوەن سەروەری یان لە نێوان ڕێکخراوە لە پەیوەندیکانی نێوامنیان یان لە پەیوەندییان لە گەڵ دەوڵەتان، بە تایبەت لە نێوان ئەمان و چەند ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتتی..

لە خوێندنەوەی پێناسە سەرەکییەکانی ئەم سێ گروپەدا ئەوە دەبینین کە بەرەوپێشچوون و پێشکەوتنەکانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی ڕەچاو کراون. هەربۆیە چوارچێوەی ئەم یاسا نێودەوڵەتییە گشتییە فراوان دەکەن، بۆ ئەوەی سەرباری دەوڵەت کەسایەتی تری وەك ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و ڤاتیکان و کەسە نێودەوڵەتییەکانی ترو لە هەندێ باردا تاکەکەسیش بگرێتەوە، بۆ ئەوەی ڕێساکانی ئەم یاسایە هەموو کەسەکان بگرنەوە و بەسەریاندا جێبەجێ بن.

بەکورتی:

لە هەڵسەنگاندنی هەریەکە لە ڕێبازی کلاسیکی و بابەتی، دەبینین هەریەکەیان کەم وکوڕیی خۆی هەیە، چونکە کۆمەڵی نێودەوڵەتی لە کاتی ئێستادا جگە لە دەوڵەت و تاکەکەس، کەسی یاسایی تری هەیە و ڕێساکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتییان لەسەر جێبەجێ دەبێت.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم تێبینیانە، دەکرێ پێناسەی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی بکەین کە: یاسای گشتی نێودەوڵەتی بریتییە لە کۆمەڵە ڕێسایەکی یاسایی کە بڕیار لەسەر پەیوەندیەکانی نێوان کەسەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی دەدەن و دەسەڵات و وەدەستدانەکان و پابەندیەتی هەریەکەیان دیاری دەکەن.

### ١-٦: ناوی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

یاسای نێودەوڵەتی کە ڕۆمەکان گوزارەی یاسای گەلان Jus Gentium یان بۆ بەکارهێنا، لە لای ڕۆمانییەکان بە مانای کۆمەڵە یاسایەکی تایبەت دەهات کە بێگانە جا لە هەر نەتەوەو شارستانێتیەکی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریی ڕۆما سوودیان لێ وەردەگرێ، لە

بەرامبەر گـوزارەی یاسـای شارسـتانی Jus civile کـە تـەنیا بەسـەر هـاولاتی رۆمـانی-دا جێبەجێ دەکرا، هەروەك ئاماچەی بۆ کرا.

دواتر دەستەواژەوگوزارەی تری وەك یاسای جەنگ و ئاشتی و یاسای ڕەگەزی مرۆڤایـەتی و یاسای سیاسەتی دەرەوە و یاسای نێوان دەوڵەتان هاتنەناوەوەو بەکارهاتن. ئینجا یاسای نێـوان نەتـەوەکان Jus intergents کـە گوزارەیـەکی لاتینیـی پەسـندکراوە. دواجـار پرۆفیسـۆری ئینگلیزی بنتـام[19] یەکـەم کـەس بـوو کـە چـەمکی یاسـای گشـتیی نێودەوڵـەتی Public International Lawی بەکارهێنا و ئێستا ئەم چەمکە بەکاردێت.

زمانەوانی عـەرەبی دەڵێن: پێویستە بڵێین قانوونی دووەلی (القـانون الـدُّوَلي) واتـە دالەکـە زەممەی لەسەر بێت، واوی دووەم فەتحەی لەسەر بێت، چونکە بۆ کومەڵێ دەوڵـەت بـەکاردێت و بە مانای بەشداریی دەوڵەتان دێت تیایداو نەڵێین دەولی (الدَّولي)، چونکە بـۆ جیاکردنـەوە لـە گەلی یان عورفی یان یاسای هۆزایەتی و ئەم مانایانە بەکاردێت.

**١-٧: یاسای گشتیی نێودەوڵەتی و چەند رێسایەکی تر**

یاسای نێودەوڵەتی، بەتەنیا پەیوەندییە یاساییەکانی نێوان کەسەکانی یاسـای نێودەوڵـەتی ڕێکناخات، بەڵکو چەند رێسایەکی تر هـەن بەشـداری دەکـەن لـە دیـاریکردن و ڕێکخسـتنی پەیوەندیەکان، ئەمانەش جیاوازی بنەڕەتییان هەیە لەگەڵ یاسـای گشـتیی نێودەوڵـەتی. دوای ئەم ناساندنە سەراپاگیرە، گرنگە جیاوازی لەنێوان ڕێساکانی ئەم یاسایە و چەند ڕێسایەکی تردا بکەین وەك موجامەلەی نێودەوڵەتی و ڕەوشتتی - ئاکاری نێودەوڵـەتی و یاسـای سروشـتی و یاسای نێودەوڵەتیی تایبەت، وەك لە خوارەوە خراونەتەڕوو.

١- جیاوازی لەگەڵ ڕێسای موجامەلەی نێودەوڵەتی

موجامەلەی نێودەوڵەتی، کۆمەڵێك نەریتە کە دەوڵەتان بـۆ موجامەلـە بـۆ بەڕێوەچـوونی پەیوەندییەکانیان لەسەریان دەڕۆن، بەبێ ئەوەی هیچ پابەندبوونێکی یاسایی ڕەوشتییان لەسـەر

---

١٩. Jerry Bentham جـیری بنتـام (١٧٤٨- ١٨٣٢): فەیلەسـوفێکی ئینگلیزییـە، یەکـەم پـڕۆژەی نووسینەوەی یاسای نێودەوڵەتی دانا، هەروەها بە دامەزرێنەری قوتابخانەی سـوودمەندی (نفعـی ) دەزانرێـت، ئەگەرچی لە سەر خودپەرستی بنیـات نـراوە، بـەلام بنتـام ئەمـەی دەزانـی و مەبەسـتی بـوو کـە (زۆرتـرین بەختەوەری بۆ ژمارەیەکی زۆری خەڵك دەستەبەر بێـت)، هـەر بۆیـە بنـەمای یاسـایی لای ئـەو پێوانەیـەکی ژمارەیی ژمێریاری بوو، پێی وابوو کە بەم باوەڕە دەتوانێ زانستی رەوشـت و یاسـا وەك زانسـتی ماتمـاتیکی مامەڵەی لە گەڵ بکرێت.

بێت. کەواتە موجامەلەکردن، ئەنجامدانی کارێکە کە هیچ پابەندییەکی یاسایی یان ئیعتبارێکی ڕەوشتی لەسەر نییە، بەڵکو ئارەزوویەکی لەپشتە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندییەکان و توندوتۆڵکردنی هاوڕێیەتی و نیەتپاکی و راستگۆیی و پیادەکردنی پرینسیپی مامەڵەکردنی وەکیەك لەنێوان دەوڵەتاندا.[20]

نموونەی کاری موجامەلەی دوەلی وەك[21]:

١. بەخشینی گەورە فەرمانبەرانی دەوڵەتی بێگانە لە باجی هاتنە ناوەوە و مەرجەکانی مانەوە.

٢. پێدانی جیاوکی تایبەت بە ئەندامانی نێردراوەکانی دەوڵەتێك زیاتر لەوەی کە لە ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکاندا هاتووە.

٣. ئامادەکردنی خوانی فراوین و ئێواران بۆ سەرانی دەوڵەتی میوان.

٤. پێشوازی گەورە لێپرسراوان لە هاوێنە میوانەکانیان لە دەوڵەتی میوان.

٥. پێشوازی سەرۆکی دەوڵەت لە وەزیری دەرەوە یان وەزیرەکانی تر.

٦. پێشوازی سەرۆکی دەوڵەت، یان وەزیرەکان بۆ هاوێنانەکانیان لە دەروازەی نووسینگەی فەرمی.

٧. ڕێگەدان بە سەرۆکی دەوڵەتێکی بێگانە کە بەسەر ئاسمانی دەوڵەتدا بڕوات و ناردنی بروسکەی ڕێزو سوپاس لە کاتی ڕۆیشتنی.

٨. هەڵبژاردنی سەرۆکی دەوڵەت بۆ سەرۆکایەتی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی کە لەناو وڵاتی ئەودا دەبەستریێ.

جیاوازیی نێوان موجامەلەی نێودەوڵەتی و ڕێساکانی یاسای نێودەوڵەتی ئەوەیە کە ئەنجامنەدانی کارێکی موجامەلەی دوەلی بە هەڵوێستێکی ناڕەوا لەقەڵەم نادرێت و هیچ بەرپرسیارێتییەکی یاسایی نێودەوڵەتی لەسەر نییە، بەڵکو هەرچی لەئەنجام نەدانی موجامەلە دەکەوێتەوە ئەوەیە کە لایەنەکەی تر (دەوڵەت) بەهەمان شێوە مامەڵەی لە گەڵدا بکات، دەکرێ ڕێسای موجامەلەی نێودەوڵەتی بۆ ڕێسای یاسایی بگۆڕدرێت کاتێك لە چوارچێوەی دابونەریت یان ڕێککەوتندا خاسیەتی پابەندێتی وەردەگرێ، ڕێسا نێودەوڵەتییەکانی ئەمڕۆی

---

٢٠. د. محسن افكيرين، القانون الدولي العام، دار النهضة العربية، ط١، ٢٠٠٥، ص١٨.

٢١. د. سهيل حسين الفتلاوي ود. غالب عواد حوامدة، القانون الدولي العام، الجزء الأول، دار الثقافة للنشر والتوزيع، ط١، ٢٠٠٧، ص٣٩.

تایبەت بە پاراستن و جیاوکەکانی دیپلۆماسی لە سەرەتادا موجامەلەی نێودەولەتی بوون، هەروەها پەلامارنەدانی راوچی دەولەتێك لەکاتی جەنگدا موجامەله بوو، پالنەری مرۆڤایەتی وایکرد کە ببێتە ڕێسایەکی عورفیی ئیلزامی، دواتر لە ڕێکەوتننامەی لاهای سالی ١٩٠٧ دا تۆمار بکریّ. بەپێچەوانەشەوە دەکرێت رێسای یاسای نێودەولەتی خاسیەتی پابەندبوون لەدەست بدات و ببێتە موجامەله وەك سلاوی دەریایی کە سەرەتا ڕێسایەکی یاسایی پابەند بوو، دواتر بووە موجامەلەیەکی نێودەولەتی.[٢٢]

٢- جیاوازی لەگەلّ ڕێسای ڕەوشتی نێودەولەتی

ڕەوشتی نێودەولەتی، کۆمەلە پرینسیپێك و بەهایەکی مرۆڤانەیە کە ویژدانی جیهانی بەسەر دەولەتانی دادەسەپێنیّ، کە لە هەلسوکەوت و رەفتاریاندا بەهەندیان وەربگرن کە بە لای رای گشتیی جیهانیی گرنگن بەبیّ ئەوەی هیچ ئیلتیزامێکی یاساییان لەسەر بێت. هەربۆیە ڕەوشتی نێودەولەتی لەگەلّ ڕێسای یاسای نێودەولەتی گشتییدا کۆکە لەسەر ئەوەی کە بایەخ بە پەیوەندیی نێوان دەولەتان دەدات و خاسیەتێکی هەیە کە بەردەوام لە پێشکەوتندایە، بەلاّم لە یاسادا جودایە کە خاسیەتی ئیلزامی نییە، وبەرپرسیارێتی لەسەر نییە، تەنانەت نارەزایی و ئەنجامدانی کاری وەکیەکیش، بەلاّم لەکەدارکردن و پشتگوێخستنی پرینسیپەکانی ڕەوشتی نێودەولەتی بەرپرسیارێتی ئەوەی لەسەرە کە ڕای گشتیی نێودەولەتی دەوروژێنیّ. نموونەی ڕەوشتی نێودەولەتی[٢٣]:

١. پرسەو پیرۆزبایی بەبۆنەی جەژنی لەدایکبوون، جەژن و بۆنە نیشتمانییەکان.

٢. هاریکاریی مرۆڤایەتی و پزیشکی لەکاتی قەومانی کارەساتی سروشتی و بلاوبوونەوەی پەتاو یارمەتی لەکاتی جەنگدا، لە ڕێگەی ناردنی یارمەتی مالّی و پزیشکییەوە.

٣. بەداخەوە بوون و نارەزایی و هاودەردی دەربڕین سەبارەت بە کارێك یان دلنیاییکردنەوەی کارێکی لەم چەشنە لەلایەن ئەو دەولەتەوە بەرێز و خۆشی و بەباش وەردەگیریّ.

٤. پۆشینی جل و بەرگی فەرمیی تایبەت بە سەردان و بۆنەو دیمانەکاندا.

لە کۆتاییدا، هەروەك ئاماژەمان پێکرد ئەنجامنەدانی ئەم کارانە هیچ بەرپرسیارێتی و گلەییەکی لەسەر نییە و پەیوەندیی بەسروشتی پەیوەندییەکانی نێوان دەولەتانەوە نییە، دەکریّ

---

٢٢. د. عبد الحسين القطيفي، المصدر السابق، ص ص ٢٤- ٢٥.

٢٣. د. سهيل حسين الفتلاوي، الجزء الأول، المصدر السابق نفسه، ص٤١.

لەنێوان دوو وڵاتدا پەیوەندیی باش یان خراپ بێت، بەلاّم گوزارشت لە سروشتی کراوەی دەسەلاّتی فەرمانڕەواو پلەی بایەخدانی بەکێشە مرۆڤایەتییەکان دەکات.

دەکرێ ڕێسای ڕەوشتی نێودەوڵەتی بۆ ڕێسای یاسایی بگۆڕێ، جا چ لە ڕێگەی عورفی نێودەوڵەتییەوە بێت یان ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی، وەك ڕێککەوتننامەی ژنێڤی تایبەت بە باشکردنی رەوش و باری بریندار و نەخۆشان کە لە ٢٢ / أب / ١٨٦٤ دا بەستراو، چەندین جار هەمووارکرا تا دواجار لە ١٢/أب/١٩٤٩ چوار ڕێککەتننامەی لەم بارەوە لێکەوتەوە، هەروەها ڕێککەوتننامەکانی لاهای (١٨٩٩-١٩٠٧) و (١٩٢٩-١٩٤٩) تایبەت بە مامەڵەکردن لەگەڵ جەنگ، ئەم ڕێککەوتننامانە هەندێ پرینسیپی ڕەوشتییان کردە یاسای پابەندکار لەنێوان دەوڵەتاندا. نموونەی تریش وەك بازرگانیکردن بە کۆیلە، ئافرەت، منداڵ، بازرگانی ماددە هۆشبەرەکان، لەناوبردنی بەکۆمەڵ، جیاکاری نەژادپەرستی، هاوکاریی منداڵە بەدبەختەکان... هتد.

ڕێسای ڕەوشتی نێودەوڵەتی ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لەپڕکردنەوەی هەندێ کەلەبەرو گرێی یاسای نێودەوڵەتی، وەك ئەوەی کە لە دیباجەی ڕێککەوتننامەی ١٨ / تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٧ ی لاهای تایبەت بە یاساو دابی جەنگی وشکایی هاتووە، کە لەو بارانەی دەقێکی تایبەتی لە ڕێککەوتننامەکەدا نەهاتووە، ئەوا دانیشتوان و جەنگاوەران بە پرینسیپەکانی یاسای گەلان و یاساکانی مرۆڤایەتی و پێشهاتەکانی ویژدانی گشتیی پارێزگاری دەکرێن. هەروەها ئەوەی کە لە بڕگەی دوو ماددەی (١) لە پڕوتۆکۆڵی یەکەمی ١٠/حوزیرانی/١٩٧٧ دا کە تایبەتە بە پاراستنی قوربانیی ناکۆکییە نێودەوڵەتییە چەکدارییەکان، هاتووە لەو بارانەی کە لەم پڕۆتۆکۆڵەو لە ڕێککەوتننامەکاندا نەهاتووە، ئەوا هاولاّتیان و جەنگاوەران بە پرینسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی و پرینسیبی مرۆڤایەتی و ویژدانی گشتیی پارێزگاری دەکرێن.[٢٤]

**٣- جیاوازی لەگەڵ یاسای سروشتی**

یاسای سروشتی، کۆمەڵە بنەماو پرنسیپێکی جێگیرو نەمرە کە بۆ هەموو کات و شوێنێك وەك یەکە و گۆڕانی بەسەردا نایەت کە وێنەی هەرە باڵایە و عەقڵ پەی پێ دەبات و دەیدۆزێتەوە.

٢٤. بۆ زانیاری بڕوانە دەقی ڕێکەوتنامەی ژنێڤی ١٩٠٧ و بڕۆتۆکۆڵی یەکەمی ژنێڤ لە ١٠/حوزەیرانی/١٩٧٧.

لوفور بەم شێوەیە پێناسەی دەکات (یاسای سروشتی، کۆمەڵە ڕێسایەکی بابەتییە کە عەقڵ دەرکی پێ دەکات و پێش خواستی مرۆڤ دەکەوێت بۆ ئەوەی حوکمەکانی خۆی بەسەردا بچەسپێنێت). لە مەشەوە دەزانین کە یاسای سروشتی وێنەکردنێکی یاسایی تیۆرییە کە گوزارشت لە دادوەری و نموونەی باڵاو ویژدان دەکات، بەڵام یاسای نێودەوڵەتی، یاسایەکی دانراوەو هێزی خۆی لە جێبەجێکردندا دەبینێتەوە. دادگای نێودەوڵەتی، ڕێساکانی یاسای سروشتی جێبەجێ ناکات، چونکە ئەم ڕێسایانە بەدوای دادی ڕەهادا وێڵن، مەگەر لایەنەکان بە جێبەجێکردنیان ڕازی بن.[25] ئەمەش بڕگەی ٢ لە ماددەی ٣٨ی نیزامی بنەڕەتی دادگای دادی نێودەوڵەتی ئاماژەی پێداوە کە دەڵێ دادگا دەسەڵاتی یەکلاکردنەوەی هەر کێشەیەکی هەیە بەپێی پرینسیپەکانی یەکسانخوازی و ویژدانەوە حوکم بکات هەر کاتێك لایەنەکانی داوایەکە لەسەریان ڕازیبوون.

٤- جیاوازی لەگەڵ یاسای تایبەتی نێودەوڵەتی

یاسای نێودەوڵەتی تایبەت، لقێکی تایبەتی یاسای ناوخۆیە، کۆمەڵە ڕێسایەکی یاسایی دەگرێتەوە کە بە هۆیەوە بڕیار دەدات ئەو یاسا ناوخۆییە جێبەجێ ببێت، ئەگەر پەیوەندییەکی یاسایی هاتە ئاراوەو ڕەگەزێکی بێگانە لایەنێکی ئەو پێوەندییە بوو، واتە ئەو بارانە هەڵاوێر دەکات و گرنگییان پێدەدات کە مافی تاکی دەوڵەتێکی تری تێدا بێت.

یاسای نێودەوڵەتیی تایبەت، یاسایەکی بابەتییە، ڕەگەزنامەی ئەو کەسانە کە سەربە چ دەوڵەتێکن، هەروا پێگەی بێگانەکان (مركز الأجانب) دیاری دەکات و چارەسەر بۆ ئەو مەسەلانە دەخاتەڕوو کە یاساکانی وڵاتان ناکۆکییان لەنێواندا هەیە (التنازع الدولي للقوانين) دەخاتە ڕوو کە دەبێ پەیڕەوی لێبکرێ، یان ئەوە چ دادگایەك بۆی هەیە سەیری داوایەکە بکات، واتە (الاختصاص القضائي) ڕووندەکاتەوە.

بایەتە سەرەکییەکانی یاسای نێودەوڵەتیی تایبەت بریتین لە[26]:

هەردوو یاسای نێودەوڵەتیی گشتی و نێودەوڵەتیی تایبەت جیاوازن لە رووی بابەت و شوێنی جێبەجێکردنەوە، ڕێساکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی تایبەتن بە دەوڵەتان و ڕێکخراوەکان و کەسەکانی ترو، تایبەتمەندی و ئیلتیزاماتی هەریەکەیان دیاری دەکەن،

---

٢٥. د. محسن افكرين، المصدر السابق، ص.٢٠

٢٦. د.غازي حسن صباريني، المصدر السابق، ص ص١٧-١٨.

بەلاّم یاسای نێودەوڵەتیی تایبەت پەیوەندیی بەم کەسانەی سەرەوە نییە، بەڵکو بواری تاکەکانی دەوڵەتان، ڕەگەزنامەیان دیاری دەکات و باری بێگانان نیشان دەدات و ئەو لایەنەش ڕووندەکاتەوە کە مافیان چەندە، ئەو یاسایەی پێویستە جێبەجێ بێت، ئەو دادگایە دیاری دەکات کە تایبەتمەندە بە یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکان، کە ڕەگەزە بێگانەکەی تێدا دێتە ناوەوە. کەواتە یاسای نێودەوڵەتیی تایبەت، حوکمی پەیوەندیەکانی نێوان تاکەکان بە دەوڵەتانی بێگانەوە دەکات. بۆ نموونە ئەگەر هاولاّتیەکی کوردستان بۆ بازرگانی بچێتە دوبەی و لەوێ گرێبەستێك لەگەڵ کەسێکی کۆریای باشوور بکات و کێشەیەکی بۆ دروست ببێت، ئایا چ دادگایەك ئەم کێشەیە یەکلادەکاتەوە: دادگای کوردستان، یان دادگای ئیمارات یان دادگای کۆریای باشوور، لەم حاڵەتەدا یاسای نێودەوڵەتیی تایبەت ئەم کێشەیە چارەسەر دەکات.

### ١-٨: پەیوەندیی نێوان یاسای نێودەوڵەتی و یاسای ناوخۆ

یاسای نێودەوڵەتی و یاسای ناوخۆ یەك سروشتی فەلسەفییان هەیە، ڕێسای نێودەوڵەتی لەگەڵ ڕێسای ناوخۆ لە بنەماکاندا هاوبەشن. بۆ دیاریکردنی پەیوەندیی نێوان ئەم دوو یاسایە، دوو تیۆریی سەرەکی هەن، کە ئەم بارە دیاریدەکەن، ئەمانیش بریتین لە تیۆریی دوانە یاساو تیۆریی یەکە (تاقە) یاسا.

### ١-٨-١: تیۆریی دوانەیی یاسا

لایەنگرانی ئەم تیۆرییە، وەك تریبل Triepe [٢٧] و ئەنزیلۆتی و Anzilotti، دەڵێن هەردوو یاسای نێودەوڵەتی و یاسای ناوخۆ، دوو سیستەمی یاسایی سەربەخۆو یەکسان و لێکجیاوازن و هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نییە، بۆ ئەمەش چەندین پاساو دێننەوە. هەردوو یاسا لە ڕووی سەرچاوە، بابەت، کەسە یاساییەکان، سزاو نیزام وچوارچێوەی جێبەجێکردن ولایەنی هەیکەلییەوە جیاوازن، ناکرێ لەناو ولاّتدا، ڕێسای یاسای نێودەوڵەتی جێبەجێ بکرێت تەنیا بە (پێشوازیکردن — استقبال و- ڕەوانەکردن — احالة) نەبێت بۆ یاسای ناوخۆ.[٢٨]

---

٢٧. Trieple تریبل ١٨٦٨ — ٨٩٤٦: زانایەکی ئەڵمانییە ، تیۆری خواستی هاوبەشی دانا و شیکردنەوە لە کتێبێکیدا لەساڵی ١٨٩٩ دواتر لە وانەیەکدا لە ساڵی ١٩٢٣ پێشکەشی کرد لە کۆمەڵەی لاهای سەبارەت بە پەیوەندی نێوان یاسای ناوخۆو یاسای نێودەوڵەتی .

٢٨. جیرهارد فان غلان، القانون بین الأمم (١)، دار الآفاق الجدیدة، ترجمة عباس العمر، ص ص٩-١٠.

### ١-٨-٢: تیۆری تاك یاسایی

پێچەوانەی تیۆریی یەکەم، لایەنگرانی ئەم تیۆرییە دەڵێن: یەکگرتوویییەکی لۆژیکی یان سروشتی لەنێوان هەردوو یاسادا هەیە و رێساکانی هەریەکەیان لە یەك نیزامی یاسایی سەرچاوە دەگرن، بەڵام لایەنگرانی ئەم تیۆرە لەسەر ئەوەی کامە تیۆریان سەرەکیترە بوونەتە دوو رێڕەو.[٢٩]

#### ١- تیۆریی باڵادەستی بۆ یاسای ناوخۆیە

لایەنگرانی ئەم بۆچوونە دەڵێن: ڕێسای یاسای ناوخۆ لە سەرووی ڕێسای نێودەوڵەتیەوەیە. بەڵگەشیان ئەوەیە کە دەستووری دەوڵەت، دەسەڵات و وەدەستدانەکان (السلطات والاختصاصات) لە هەردوو ئاستی ناوخۆو نێودەوڵەتی دیاریدەکات و پەیوەندییە نێودەوڵەتی و پەیماننامەکان بە خواستی تاکلایەنەی دەوڵەت دەبن، بۆیە یاسای نێودەوڵەتی لە یاسای ناوخۆ دەکەوێتەوەو، لقیش شوێنکەوتووی ئەسڵ دەبێت.

#### ٢- تیۆریی باڵادەستی بۆ یاسای نێودەوڵەتییە

پاساو بۆ ئەم بۆچوونە پلە پلەیی یاسایە، وەك چۆن دەبێ خێزان ملکەچی سیستەمی گوند بێت، گوندیش ملکەچی سیستەمی شارو پارێزگا بێت، تا دەگاتە دەوڵەت کە بەرژەوەندیی هەموویان دەپارێزێ، ئا ئەوهاش یاسای نێودەوڵەتی، ڕێکخەری کۆمەڵی نێودەوڵەتییە، بۆیە دەبێ ئەم یاسایە لە ڕووی پلەو دەسەڵاتەوە لە یاسای ناوخۆی وڵاتان باڵاتر بێت.

ئێمە لایەنگری ئەو بۆچوونە دەکەین کە یاسای نێودەوڵەتی بەسەر یاسای ناوخۆدا باڵادەست دەکا، چونکە لە ئاستی نێودەوڵەتی، مامەڵەکردنی دیپلۆماسی و لەڕووی دادگای نێودەوڵەتی و چۆنیەتی مامەڵەکردنی لایەنە نێودەوڵەتییەکان وەك دادگای دادی نێودەوڵەتیی هەمیشەیی لە ڕووی پێشینەوە کە باڵادەستیی یاسای نێودەوڵەتی دووپات دەکەنەوە، هەروەها لەسەر ئاستی نیشتیمانی، کە سەیری دەستووری زۆربەی وڵاتانی جیهان بکەین، دووپاتی پابەندبوون بەم یاسایە دەکەنەوەو ڕێز بۆ گرنگی و باڵادەستیی ئەم یاسایە دادەنێن، ئەمەش بەو مانایەیە کە کۆمەڵی نێودەوڵەتی و دەوڵەتان، یاسای نێودەوڵەتی لەسەرووی یاسای خۆیانەوە دەبینن.

---

٢٩. جيرهارد فان غلان، القانون بين الأمم (١)، المصدر السابق، ص ص١٠-١١. و د. غازي حسن صباريني، المصدر السابق، ص ص ٤٠-٤١.

### ١-٩: بنەماكانی پابەندبوون بە یاسای نێودەوڵەتی

پێشكەوتن و پێداویستییەكانی كۆمەڵگای نێودەوڵەتی، سەرنجی یاساناس و بیریارانیان بەو ئاراستەیەدا بردووە كە پێویستە ڕێسای گشتی بۆ بەڕێوەبردنی پەیوەندییەكانی نێوان دەوڵەتان هەبێت. لەم بۆچوونەدا ئەو باسە دێتەپێش كە ئایا دەكرێ وەسفی یاسای نێودەوڵەتی بكەین كە ڕێساكانی بەركارن — دانراو - (الوضعیة)، یاسای بەركاریش بریتییە لە كۆمەڵە ڕێسایەكی ڕێرەوشتی گشتیی بێ لایەن كە پەیوەندیی كەسە یاساییەكان ڕێكدەخەن و پەیڕەوكردنیان ئەركە لەسەر شانی هەموو كەسێك و سەرپێچی لێكردنیان دەبێتە هۆی چەسپاندنی سزا كە لەلایەن دەسەلاتداریتیی گشتییەوە دەسەپێنرێت.[٣٠]

فەلسەفەی بەركاری —دانراو- وەزعی- تەنیا دان بەو یاسایەدا دەنێ كە لەناو دەوڵەتێك لەكاتێكی دیاریكراودا هەیە، یاساو دەوڵەت بەیەكەوە دەبەستێتەوە و پابەند دەكات، كە یاسای دانراو ئەو یاسایەیە كە لە ئیرادەی دەوڵەت بەشێوەی یاسا، عورف، دادگا، دەردەچێت، ستاتۆی یاسایی جەخت لەسەر دوو بیر دەكاتەوە، ئەوانیش: داننان بەو یاسایە دانراوەی لە دەوڵەتێكی دیاریكراودا جێبەجێ دەبێت لەلایەك و، نكۆڵیكردن لە فیكرەی یاسای سروشتی لەلایەكی ترەوە.[٣١] بۆ ئەوەی یاسا بسەپێت و جێبەجێ ببێت، دەبێ خواستی ئەوە هەبێ فەرمانپێكراوان ناچاربن پێی پابەندبن، سزا لەسەر لادەران دابنێت، لە كاتێكدا خواستی دروستكەرو بڕیاردەرانی یاسا وا پێویست دەكات بەرزترو بەهێزتربێ لە خواستی ئەوانەی ڕوویان تێ دەكات، دیارە مەرج نییە كە یاسا هەر دەبێ لە دەزگایەكی تایبەت بە یاسادانان دەربچێت لە دەوڵەتێكی دیاریكراودا، بەڵكو بەشێوەیەكی نادیارو ناڕاستەوخۆ دەكرێ لە كۆمەڵە خەڵكێكەوە بێت لەناو دەوڵەت (عورفی نیشتمانی) یان كۆمەڵە كەسێكی كۆمەڵی نێودەوڵەتی (عورفی نێودەوڵەتی)یەوە بێت، یان بەئاشكراو بەنادیاری دەكرێ لە هەندێ كۆمەڵی ناوخۆ لەناو دەوڵەت دەربچێ وەك كۆمەڵەو سەندیكاو...هتد، یان لە هەندێ كۆمەڵە ڕێكخراوی نێودەوڵەتی وەك ڕێكخراوە نێودەوڵەتییەكان، لەمەوە پێویستە بگوترێ جیاوازیی

---

٣٠. بۆ زیاتر بڕوانە: د. جعفر الفضلي و د. عبد الحسین الفضل، المدخل للعلوم القانونیة، وزارة التعلیم العالي والبحث العلمي، ط١، ١٩٨٧، ص١٤ وما بعدها، ود. عبد الباقي البكري وزهیر البشیر، المدخل لدراسة القانون، وزاراة التعلیم العالي والبحث العلمي، ص٢٥ وما بعدها.

٣١. بڕوانە: د. سمیر عبدالسید تناغو، المرجع السابق، ص١٠٩ ومابعدها.

نێوان لایەنگرانی بەرکاری کۆمەلاّیەتی و بەرکاری دەولّەت لەسەر ئەو خواستەیە کـە دەکـاریّ یاسای بەرکار دروست بکات، کە لایەنگرانی بەرکارانی دەولّەت جگە لـە دەولّـەت دان بـەهیچ شتێکی تر نانێن کە یاسا دروست بکات، بەلاّم لایەنگرانی بەرکارانی کۆمەلاّیـەتی بەگشـتیی دان بەهــەموو کۆمــەلّێکی ڕێکخــراو دادەنــێن بەمــەرجێك کــە بەرامبــەر ئــەو کەســانەی پێکیدەهێنن، پیادەی بکەن. سەبارەت بە جیاوازیی بۆچوون کە بەرکاری یاسـای نێودەولّـەتیی گشتیش دەرئەنجامی جیاوازیی بۆچوونە لەسەر خواستی دروستکەری یاسای بەرکار.[٣٢]

ئەگەر بە پێوەر یان پێناسەی لایەنگرانی بەرکاری دەولّەت ئـەم خواسـتە وەربگـرین، ئـەوا دەبیّ بلّێین کە یاسا نییە، بەلاّم ئەو ڕەخنانەی لەم تیۆرییە گیراون، یاساناسانی هاوچەرخی بەوە گەیاندووە کە دان بە یاساییبوونی بنـێن و بـەرکاری کۆمەلاّیـەتی پەسـەند بکـەن، لەوەشـەوە یاساناسانی ڕۆژئاوا کۆدەنگن لەسەر بەرکاری یاسای نێودەولّـەتیی گشـتی، بـەلاّم بەسـەر دوو قوتابخانەدا دابەش بوون ئەمانیش بـریتین لـە: قوتابخانــەی دانـراو-بـەرکاری- خواسـتگەرایی (الارادة –الوضعیة) و قوتابخانەی سروشتی- بابەتی (الطبیعة- الموضوعیة).[٣٣]

### ١- ڕێبازی خواستگەرایی (دانراو)

ئەم ڕێبازە لەلای یاساناسانی ئەلّمانەوە سەری هەلّداوە. بنەمای ئەم ڕێبازە لـە بـیری جان جاك رۆسۆوە سەرچاوە دەگرێت کە دەلّـیّ: یاسـا گوزارشـتە لـە ئـارەزوو و خواسـتی گشتیی کۆمەلّ، ئەم بیرە چۆن بۆ ئەو ڕێسـایانە دروسـتە کـە حـوکمی پەیوەنـدیی نێـوان تاکەکانی یەك کۆمەلّگا (دەولّەت) دەکەن، ئاواش بۆ ڕێسای ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەلّگا جیاوازەکان ڕاستە و سەبارەت بـە یاسـای نێودەولّـەتی، یاساناسـان لـەم تیۆرییەدا دوو ڕێڕەویان دیاری کردووە:

---

٣٢. بۆ زیاتر بڕوانە: عثمان علي حسن، الوضعیة القانونیة (دراسة تحلیلیـة) بحث منشـور بأشـراف د. شـیرزاد أحمد النجار، في مجلة پارێزەر، العدد ٩، اربیل، ٢٠٠٥، ص٢١٤، وما بعدها.

٣٣. د. محمد سامي عبدالحمید، أصول القانون الدولي العام، ص٢٢ وما بعدها، و د. منـذر الشـاوي، المدخل لدراسة القانون الوضعي، دار الشؤون الثقافیة العامة، بغداد، ط١، ١٩٩٨، ص١٩٨ وما بعدها.

### أ- تیۆریی خواستی تاکلایەنە

یاساناسی ناسراوی ئەڵمانی یلینك [٣٤] کە پێی دەگوت کۆتی خودی، ئەم تیۆرییەی دانـاوەو دەڵێ یاسای نێودەوڵەتی خاسیەتی ئیلزامیەتی لە خواستی هەر دەوڵەتە بەتـەنیا وەردەگـرێ و خۆی، خۆی کۆت و بەند دەکات، چونکە دەسەلاتێکی بالاتر لەسەرووی خۆیەوە نابینێ، دیـارە ئەمەش لەگەڵ لۆژیکی یاسایی ناکۆکە کـە یاسـا، خواسـتەکان کـۆت دەکـات، چـۆن دەکـرێ سیفەتی ئیلزامی لە خواستی کەسەکانی یاسا وەربگرێ، ئـەی چ لـە خواسـتی دەوڵـەت خـۆی دەکرێ هەرکاتێ بیەوێ، بتوانێ ئەوە ڕابگەیێنێ کە پابەند نییەو خۆی ئازاد بکات.

### ب- تیۆریی هاوخواستی دەوڵەتان

زانای ئەڵمانی (تریبل) دەڵێ، لە بەرئەوەی دەسەلاتێکی بالا نییە کە خاسیەتی ئیلزامیەتی یاسای نێودەوڵەتی لێ وەربگیرێ، هەربۆیە پەنا دەباتە بەر خواستی دەوڵەتان، بـەلام خواسـتی تایبەتی هەر دەوڵەتە ناتوانێ سەرچاوەی ئیلزامی یاسا بێت، بەڵکو لە کۆی خواستی تایبـەتی هەموو دەوڵەتان یان ژمارەیەك خواستی بەکۆمەڵی گشتیی دەوڵەتان سەرچاوە دەگرێ.

ئەو ڕەخنەیەی لەم تیۆرییـە دەگـیرێ ئەوەیـە کـە هـەوڵ دەدات بیسـەلمێنێت دەوڵـەتان بەشداری لە پێکهێنانی خواستی بەکۆمەڵدا دەکەن، بۆ ئەوەی ڕێز لەم خواستانە بگـیرێ، چ شتێك ڕێگرە هەرکاتێ ویستیان پابەند نەبن، (تریبل) دەڵێ: هەستی (شعور)ی دەوڵەتان بـە پابەندبوون، ئەو خواستە بەکۆمەڵەیە کە ڕێگە لە دەرچوون لێی دەگرێ، بـەلام ئـەم هەسـتە چییە؟ بۆ دەوڵەتانی تازە دروستبوو کە بە خواستی خۆیان بەشداری ئەو خواستە هاوبەشەیان نەکردووە چۆن پابەند دەبن؟

### ج- تیۆریی هەرەمی ڕێسای یاسایی (نظرية تدرج القواعد القانونية)

ئەم تیۆرییە کە بە قوتابخانەی نەمسایی، یان تیۆریی یاسـا پاقـژ- پوخـت – بێگـەرد- ی (- النظرية المحضة في القـانون – مدرسـة القـانون البحـث- النظريـة المجردة للقـانون) ناسـراوە، تیۆریی یاسایی دانراوە، بۆ هەموو یاسایەکی دانراو نەك بۆ یاسایەکی دیاریکراو، کە تیۆرێکی گشتیی یاسایە، نەك بۆ شیکردنەوەی نیزامێکی یاسایی دیاریکراو، جا نیشـتمانی بێـت، یـان

---

٣٤. جورج یلینك ( G.Jellinek (1851 – 1911): تیۆری خواسـتی تـاك لایەنـە یـا کـۆتی خودخواسـتی لەکتێبکێدا لـە سـاڵی ١٨٨٠ داشـی کـردەوە، کتێبێکـی تـری لـە دووبەرگـدا بەناونیشـانی دەوڵـەتی نـوێ ویاسایەکانی دانا ساڵی ١٩٠٠ .

نێودەوڵەتی و دەیەوێ ماهییەتی یاساو چۆنیەتی پێکهاتنی دیاری بکات، بەبێ ئەوەی پرسیار بکات کە ئایا دەبێ چۆن بێت و پێویستە چۆن پێکبێت.[٣٥] ئەم تیۆرییە کە بەناوی هەردوو زانای نەمسایی کلسن[٣٦] و فردوس ناوزەدکراوە، لەسەر فیکرەی پلەپلەیی ڕێسای یاسایی وەستاوە کە دەڵێ نیزامی یاسایی بەشێوەیەکی گشتیی هەرەمێکە لە ڕێسا، ئەو هەرەمە ڕێسایەکی بنەڕەتیی هەیە کە ئەحکامەکانی ڕێکدەخات و هێزی پاپەندبوون دەبەخشێتە ئەو ئەحکامانە، ئەو ڕێسایەی کە پلەی لە خوارەوەیە ملکەچ دەبێت بۆ ڕێسای سەرووتر لە خۆی، تا بەڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دەگەنە ڕێسا بنەڕەتییەکە. بۆ نموونە حکوومەت بۆ دەرکرنی ڕێنماییەکانی پشت بەو یاسایانە دەبەستێت کە لە پەرلەمان دەردەچن، یاساکانیش پشت بە

---

٣٥. هانس كلسن، النظرية المحضة في القانون، ترجمة الدكتور أكرم الوتري، منشورات مركز البحوث القانونية (١١)، بغداد، ١٩٨٦، ص.٥٢

٣٦. Hanz Kelson: لە ١١ی تشرینی یەکەمی ١٨٨١ لە شاری براگ کە ئەو کات بەێك بوو لە ئیمبراتوریەتی نەمساوی لە دایك بووە، خوێندنی لە فیەننا تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٠٦ دکتۆرای لە یاسا وەرگرتووە، ساڵێك پێشتر یەکەم کتێبی زانستی سەبارەت بە چەمکی دەوڵەت لە هزری (دانتی) بە چاپ گەیاندووە، یەکەم کەس بوو کە رووی زانستی دایە تیۆری یەکە یاسایی، یەکەم بناغەی تیۆری یاسا پاقژی لە ساڵی ١٩١١ داناو بوو بە بنەمایەك بۆ ئەم تیۆرە  کە دواتر بە شێوەیەکی مەنهەجی بایەخی پێدا، دواتر بوو بە مامۆستای یاسای گشتی و فەلسەفەی یاسا لە زانکۆی ڤیەننا، لە ساڵی ١٩١٣ گۆڤاری یاسای گشتی دەرکرد و لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا وەتاو دواتر دەرچۆوە، لە کاتی جەنگدا ئەفسەری یەدەگ بوو لە سوپای نەمساوی- هەنگاری، ساڵی ١٩١٧ بوو بە راوێژکاری یاسایی لە وەزارەتی بەرگری بۆ کاری بەدواداچوونی دەستوور لە بواری رێکخستنی سەربازی پاشایەتی، لە گەڵ دامەزراندنی یەکەم کۆماری  نەمسا حکومەت داوای لێکرد پڕۆژەی دەستووری یەکێتی نەمسای نوێ ئامادەبکات کە لە ١٩٢٠ لە برلمان قبوڵ کرا.لە ١٩١٧ بوو بە مامۆستای باڵا لە یاسای گشتی و فەلسەفەی یاسا لە زانکۆی ڤیەننا، لە ساڵی ١٩٢١ بوو بە دادوەر لە دادگای دەستووری، لە چەندین وو{تی جیهان وانەی گووتۆتەوە تا لە ساڵی ١٩٥١ لە کالیفۆرنیا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خانەنشین کراوە، بە شێوەی کاتی لە پەیمانگەی زانکۆیی توێژینەوەی نێودەوڵەتی باڵا لە ژنێف کاری کردووەو، چەندین دکتۆرای لە زانکۆکانی هارڤەرد، اوترخت، شیکاغۆ، کالیفۆرنیاو مەکسیك پێدراوە، ئەندامی شانازی زانکۆی ئەمریکی یاسای نێودەوڵەتی و لیژنەی نووسینی گۆڤاری ئەمریکی یاسای نێودەوڵەتی بووە، لە ١٩٧٣ کۆچی دوایی کردووە.

دەستوور دەبەستن، ئەویش پشت بە یاسای نێودەوڵەتی دەبەستێت، بەم شێوەیە پلەبەپلە ڕێساکانی یاسا هەڕەمی دەبن تا دەگەینە ڕێسایەکی گریمانەیی بنەڕەتی (قاعدة أساسية أفتراضية) کە هێزی یاسایی ئیلزامی بە هەموو یاساکان دا، ئەو ڕێسایەش پیرۆزی ڕێککەوتن و وەفادارییە بە پەیماننامە.[37]

ئەم تیۆرییە، لۆژیکی شکڵییەکەی بە هێزو جێی سەرسوڕمانە، بەڵام زۆربەی یاساناسانی هاوچەرخ دووپاتی ناکەنەوە، چونکە لە لایەك لەسەر گریمانەیەك دانراوە، کە لە خانەی پرینسیپە چەسپاوەکانی یاسادا نییە و ئەو بنەمایەش روون نەکراوەتەوە کە ڕێسا بنەڕەتییەکە بوون و هێزی خۆی لێ وەردەگرێ.[38]

## ٢- تیۆری یاسای سروشتی

بیرۆکەی یاسای سروشتی لەگەڵ لەدایکبوونی فەلسەفەدا بیرۆکەیەکی هەرە بەربلاوە، کۆنترین بیرە کە سیمایەکی فەلسەفی هەبێ و لە هەموو شارستانێتییە کەوناراکانی فیرعەونی و بابلی و یۆنانی و رۆمانی و هاوچەرخدا هەبوویێت، گوتەی (یاسا بەبێ یاسای سروشتی بوونی نییە) چەسپاوەو جێگیر بووە. پوختەی بۆچوونی ئەم قوتابخانەیە ئەوەیە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەلایەتییەو بۆ کەماڵ هەوڵ دەدات و دەبێ یاسایەکی بەرزو بالاتر لە یاسای دانراو (لە خواستی مرۆڤ) هەبێ کە پەیوەندییەکان ڕێکبخات، کە لە سروشتی شتەکان یان لە کەرەمی خوداییەوە دەربچێت و عەقڵی پاراو درکی پێ بکات، کە یاسایەکی جێگیرو ئەزەلییە و بەگۆڕینی شوێن ناگۆڕێ و بۆ هەموو کات و شوێنێك دەست دەدا.[39] کەواتە بیرۆکەی یاسای سروشتی، بوونی ڕێسایەکە پێش یاسای دانراو دەکەوێ و لەو بەرزترە، نەمر و جێگیرە، بۆ هەمووکات و شوێنێك و بۆ هەموو گەلێك، دادوەری بالایەو بەسەر هەموو دامەزراوەکانی مرۆڤایەتیەوەی هەیە و ناکرێ وەلابنرێ و سەرپێچی لێ بکرێت، بابەتێتی تێدایە چونکە گوزارشت لە خواستی یاسادانەر ناکات و دووانەیی تێدایە کە سەربەخۆیە لە یاسای دانراو.[40]

---

٣٧. بۆ زیاتر بڕوانە: هانس كلسن، ص١٠٧ وما بعدها، د.شيرزاد أحمد النجار، محاضرات (الدستور كقاعدة أساسية للنظام في الدولة) ألقيت على طلبة الدراسات العيا –ماجستر– في كلية القانون، جامعة صلاح الدين (٢٠٠٣-٢٠٠٤).

٣٨. بڕوانە: د. عبدالحمن رحيم عبدالله، محاضرات في فلسفة القانون، ط١، اربيل، ٢٠٠٠، ص١١٠، وما بعدها.

٣٩. د. أحمد أبراهيم حسن، مفهوم القانون الطبيعي عند فقهاء الرومان، الدار الجامعة، ص ٥-١١.

٤٠. د. منذر الشاوي، مذاهب القانون، دار الحكمة للطباعة والنشر، بغداد، ط ٣، ١٩٩١، ص ٢٥- ٢٦.

لایەنگرانی ئەم تیۆرییە دوو بەشن، باوەڕدارانی ئەم یاسایە بەخواستی خودای دەبەستنەوە و دەستەیەکی تر بە عەقڵی مرۆڤ و بە سروشتی دەبەستنەوە. یاساناسانی ڕۆمان ناوی یاسای گەلان (قانون الشعوب)یان لێ ناوە، کە کۆمەڵە پرینسیپێکە دەکرێ بەشێوەیەکی گشتیی بەسەر هەموو گەلانی ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمادا جێبەجێ ببێت، یاسایەکی گشتییە و دەرئەنجامی سروشتیی کۆمەلایەتی و لۆژیکیی مرۆڤە، ئا وەسا فەیلەسوفانی سەدەکانی ناوەڕاست و پیاوانی کلێسەی مەسیحی ئەو یاسایەیان وەرگرت و گوتیان ئەو یاسایە، سروشتی مرۆڤ دەیسەپێنێ و بەشێکە لە یاسای خودایی و مرۆڤەکان لە ڕێگەی هۆشیانەوە هیدایەت دەدات. دەوڵەتانی ئەوروپی کە لە سەدەکانی شازدەو حەڤدەدا لە دەسەلاتی پاپا رزگاریان بوو، سەروەرێتیان وەرگرت، یاساناسان گوتیان کە دەوڵەتان لە پەیوەندییەکانیاندا بەو ڕێسایانە پابەند دەبن کە دەرئەنجامی سروشتیی کۆمەلایەتی و هۆشی مرۆڤە، داڕێژەرانی بناغەی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی وەك گروسیوس و ڤاتیل، دەستیان بەم تیۆرییەوە گرت و، لەو باوەڕەدابوون کە یاسای سروشتی دەکرێ بە ڕێسای ڕێکەوتن (قواعد اتفاقية) تەواو بکرێت.[41]

هەر بۆیە دەوڵەت هەر چەندە سەروەرێتی هەیە، دەبێت یاساکانی لەگەڵ ئەو یاسایەدا کۆك بن کە لە بنەڕەتدا لەو دەوڵەتەدا هەیە، واتە پاشکۆیی و وابەستەیی دەوڵەت و یاسا دانراوەکان بۆ یاسای سروشتی، کە سەرئەنجام گروسیوس و لایەنگرانی دانیان ناوە بەوەی کە سەروەرێتی دەوڵەت ڕەها نییەو دەبێ بەو یاسایە پابەند بێت کە لە عەقڵەوە وەردەگیرێ.[42]

ئەو ڕەخنەیەی لەم تیۆرییە دەگیرێ، ئەوەیە کە بناغەی یاسا، تەنیا نموونەی باڵاو دادوەری و یەکسانی و ویژدان، تاکە ڕەگەزی کرۆك وکاکڵەی یاسا بێت، ئەوا تەنیا ڕوویەکی ڕاستییەکەیە، ڕەگەزەکەی تر، ڕەگەزی واقیعیی ژیانی کۆمەلایەتییە.[43] ئەمەش وادەکات کە نەتوانین بە ڕوویەکی هونەری ورد و بەهای پراکتیکی دیاریکراو وێنەی بکەین کە لەگەڵ ماهییەت و سروشتی ڕێسای یاسایی ناکۆکە، کە سازو ئامادەیە بۆ ئەوەی لە واقیعی ژیاندا جێبەجێ بکرێت، چونکە جارێك ڕێساکانی بۆ عەقڵی مرۆڤ بەجێ دێنێت.[44] بەلام سەرەڕای ئەم ڕەخنانە، بیری یاسای سروشتی کە خۆی لە پرینسیپەکانی دادوەری و ویژداندا

---

٤١. د. محمد حافظ غانم، الأصول الجديدة للقانون الدولي العام، المصدر السابق، ص.٥١

٤٢. د. مأمون مصطفى، المصدر السابق، ص.٢٩

٤٣. د.حسن كيرة، المدخل الى القانون، نشاة المعارف بالأسكندرية، ١٩٧٤، ص.١٢١

٤٤. د. محمد حافظ غانم، الأصول الجديدة، ص٥٢، ود. حسن الجليبي، ص.٤٠

دەبینێتەوە، لە چەندین پەیماننامەی نێودەوڵـەتیی سـەدەکانی حەڤـدەو نـۆزدەو بیسـتەمدا هاتووە، لەوانە ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٠٧ لاهای و ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٢٨ژنـێڤ و ماددەی ٣٨ی نیزامی دادگای دادی نێودەوڵەتی و ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ ژنیڤ و پرۆتۆکۆڵەکانی ساڵی ١٩٧٧.

لەلایەکی تر پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژیا لە سەدەکانی نۆزدەو بیستدا ڕۆڵی گرنگیـان بینیوە لە سەرهەڵدان و دەرکەوتنی ڕێبازی دانراو (وەزعی) و ڕەتکردنـەوەی فیکـرەی یاسـای سروشتی، بەڵام بە هۆی ئەو نائارامی و شۆرش و جەنگ و کارە دڕندانانـەی کـە لـە مێـژوودا ڕوویان داوە، لە بیری زۆرکەسدا بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا و بەکارهێنان و خزمـەتکردنی ئامانجەکانی ملهوڕان بەکارهاتووە، نەك بۆ خزمەتی مرۆڤ و پێشکەوتن و بەختـەوەریی، بۆیـە فیکرەی یاسای سروشتی ژیایەوە.[45]

لەلایەکی تر ئەم فیکرە ڕۆڵی لە بەرپابوونی شۆڕش و بەرخۆدان دژ بەستەمکاران و چاندنی تۆوی دیموکراسـی و چەسـپاندنی بـەهای مرۆڤایـەتی و نموونـەی بـالاّ لـەناو یاسـا و حـوکمی دادگاکاندا بینیوە.[46]

هـەروەها جـاڕدانی مافـەکانی مـرۆڤ و هێنانـەئارای پرینسـیپ و یاسـای نـوێی یاسـای نێودەوڵەتی لێکەوتەوە، ڕۆڵی هەبووە بۆ بەرجەستەکردنی یاسایەکی نێودەوڵەتی کە مرۆڤانـەتر بێت لەوەی پێش خۆی، وەك مافی دەستوەردان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵـەتان، کـاتێ گـەلێك ڕووبەڕووی لەناوبردنی بەکۆمەڵ و پێشێلکردنی مافەکانی دەبێتەوە.[47]

### ٣- تیۆریی هێز

ئەم تیۆرییە دەیەوێ بنەمای ئەحکامەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی لەسەر هێـز بنیـات بنێت. ئەم بـیرەش لـە یۆنـان و ڕۆمـان سـەری هەڵـداو لـە سـەدەی حەڤدەشـدا فەیلەسـوفی ناسراو(سبینۆزا (هێنایەئاراوە کە دەڵێ: دەوڵەت مافی ئەوەی هەیـە کـە چ بتـوانێ ئـەنجامی بدات، هەروەها ئەو ڕێککەوتننامانەی کە دەیانبەستێت هیچ بەهایەکیان نییـە ئەگـەر لەگـەڵ

٤٥. د. أحمد أبراهيم حسن، المصدر السابق، ص.١٠

٤٦. د. حسن كيرة، ص١٢٠، و د. محمد شريف أحمد، فكرة القانون الطبيعي عنـد المسـلمين، منشـورات وزارة الثقافة والأعلام، ١٩٨٠، ص.٦

٤٧. د. عبدالرحمن رحيم عبدالله، المصدر السابق، ص.١٨

بەرژەوەندیی ناکۆك بن، (لاسون) دەڵێ: دەوڵەت دەسەڵاتی ڕەهای هەیە و مل بۆ فەرمانی هیچ دەسەڵاتێکی باڵاتر لە خۆی کەچ ناکات و بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی کار دەکات، ئەگەر دوو دەوڵەت بەرژەوەندییان پێکناکۆك بوو، ئەوا هیچ ڕێگەیەك جگە لە جەنگ بۆ چارەسەری ئەو ناکۆکییە نییە، ئەم تیۆرییە کە بە خۆپەرستی و بەرژەوەندیی زاتی ناسراوە لە گەڵ ڕۆحی سەردەم ناکۆکە کە ماف و هێز بەیەك شت نازانێ و ئەو پەیوەندییەش ڕەت دەکاتەوە کە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەسەر بنەمای ڕووخێنەر بنیات بنێت و ڕێزی پەیمان نەگرێ. بەڵکو پرینسیپەکانی مرۆڤدۆستی و ڕای گشتیی جیهانی ڕۆڵ دەبینن لەوەی کە ڕێگە لە دەوڵەتێك بگرن ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی بخاتە مەترسیەوە.[48]

## ٤- تیۆریی بیرۆکەی بەرژەوەندی

فەیلەسووفانی وەك (هیگڵ[49] و بەندەر) دەڵێن: بەرژەوەندی، بنەمای یەکەمی دامەزراندنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانە، سەرچاوەی پابەندبوونی دەوڵەتانە بەو ڕێسایانەی ئەم پەیوەندییانە ڕێکدەخەن. بێگومان ڕەخنە لەم تیۆرییەش دەگیرێ، چونکە ئەوەی سیاسەت لەژێر کاریگەریی بەرژەوەندی قبوڵی دەکات، لەوانەیە لەگەڵ پرینسیپەکانی یاسادا ناکۆك بێت، بەرژەوەندی بەگوێرەی بارودۆخ و ئارەزوو و ئامانجەکان دەگۆڕێ و جیاواز دەبێت، هیچ پێوەرێکی جێگیر نییە تا بزانین کەی ئەو بەرژەوەندییە ڕەوایە و کەی نا ڕەوا، بۆیە هەڵەیە

---

٤٨. د. محمد المجذوب، المصدر السابق، ص ص٨٢-٨٣.

٤٩. هیجل(١٧٧٠-١٨٣١) لە شاری شتوتکارتی ئەڵمانی لە دایك بووە، بە ساکاری و ڕەوشت بەرزی ناسراوە، لاهوتی خوێندووەو دواتر زانستێکی بە بڕشتی لە بوارەکانی فەلسەفەو زانستە سروشتی و ماتماتیك و مێژوو بە تایبەتی بیری یۆنانی تەواو کردووە. ساڵی ١٨٠٥ بووەتەمامۆستا لە زانکۆی یینا، بەڵام زۆری نەخایاند کە بەهۆی ئەو بارە سیاسیە نالەبارەی ئەڵمانیای گرتەوە وەلانرا، لە ساڵی ١٨١٦ بوو بە مامۆستا لە زانکۆی هیدلبرج، دزاتر داواکرا بۆ برلین و ناووناوبانگ و شکۆمەندی بڵاوبۆوە، گرنگترین بڵاوکراوەکانی رواڵەتەکانی گیان ١٨٠٧، لۆژیك(١٨١٢ - ١٨١٦)، لە ساڵی ١٨١٧ ئینسکلۆپیدیای زانستە فەلسەفیەکانی بڵاوکردەوە، کە بە شێوەیەکی گشتی فەلسەفەی خۆییشی تێدا بڵاوکردەوە کە بە فراوانترین هەوڵی بیری مرۆڤە بۆ شیکردنەوەی گەردوون لە ڕووی تیۆریەوە، فەلسەفەی هیگڵ شیکردنەوەی مەعریفە، خواست، زانستی سروشتی، لۆژیك و مێژوو، یاسا، ڕەوشت، ئایین و سەرجەم لقەکانی مەعریفەی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، لە ناکاو دوای تێپەڕکردنی شەستەکان ساڵی بە نەخۆشی کۆلێرا ١٨٣١کۆچی دوایی کرد کە لە ترۆپکی ناوبانگی دابوو.

یاسای نێودەوڵەتی بە فیکرەیەك وەربگرین کە خـۆی لـە خۆیـدا بنەمایـەکی جـێگیرو ڕوون و دیاریکراوی نییە.[50]

## ٥- تیۆریی بیرۆکەی هاوسەنگیی سیاسی

هاوسەنگیی سیاسی زادەی بیری ئەوروپییەکانە کە لە دەقەکانی پەیماننامـەی ویسـتڤاڵیادا هاتووە، لەسەر ئەو بنەمایەی کە هاوسەنگیی هێز لەنێوان دەوڵەتە زلهێزەکاندا گەرەنتییەکە بۆ ئاشتی گشتی، بێگومان ئەم فیکرەیەش ناکرێ ببێتە بنەمایەك بۆ یاسای نێودەوڵەتی، چـونکە لەلایەك هاوسەنگیی نێودەوڵەتی، فیکرەیەکی سیاسییە نـاکرێ ببێتـە بنەمایـەك بـۆ ڕێسـای یاسایی، لەلایەکی تریشەوە هاوسەنگیی نێوان زلهێزان تەنیا ئامرازێکی یاریدەدەرە بۆ ڕێزگرتن لە ڕێساکانی یاسای نێودەوڵەتی، چونکە ڕێسایەکە دەیەوەێ دەوڵەتانی گەورەو بـەهێز لەسـەر حیسابی دەوڵەتانی بچووك و لاواز فراوانتر نەبن. لۆژیك قبـوڵی ناکـات ببێتـە بنەمایـەك بـۆ هەموو ڕێسایەکی یاسای نێودەوڵەتی.[51]

## ٦- تیۆریی هاریکاریی کۆمەڵایەتی (نظرية التضامن الاجتماعي)

بنەماکانی ئەم تیۆرییەو جێبەجێکردنیان لە بواری یاسای ناوخۆدا بۆ یاساناسـی ناسـراوی فەرەنسی (لیون دیگی) دەگەڕێنەوە. هەریەك لـە جـورج سـێلی فەرەنسـی و بـولیتی یونـانی بۆچوونەکانی دیگییان گواستەوە بۆ ناو بواری دیراساتی یاسای نێودەوڵەتی. دیگی نکوڵی لەوە دەکات کە دەوڵەت سـەروەرێتی هـەبێت و دان بـە خواسـتی دروسـتکەری ڕێسـای یاسـایی و فیکرەی کەسایەتیی مەعنەوی نانێت.

دامەزرێنەرانی ئـەم تیۆرییـە دەڵـێن، یاسـا بەشـێوەیەکی گشـتی و یاسـای نێودەوڵـەتی بەتایبەتی تەنیا ڕووداوێکی کۆمەڵایەتییە، ژیان لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە دەستیان دێنێ کە لەسەر پێداویستی (زەرورەی) ژیان وەستاوەو دەرئـەنجامێکی هاریکـاری نێـوان تاکـەکان و گەلانە بۆ ئەوەی پێداویستییە زەرورییە جۆر بـە جۆرەکانیـان تێـر بکـەن، کـە لەگـەڵ ژیـانی مرۆڤایەتی پەیدا دەبن، پرینسیپ و ڕێسای یاسایی بۆ دەسەڵات دادەنێن و ئەویش هەڵدەسـتێ بە دانانیـان، بـۆ ئـەوەی هاریکـاری و تـەبایی نێـوان تاکـەکان بپـارێزێ و پەیوەندییـەکانیان

٥٠. د. محمد المجذوب، الوسيط في القانون الدولي العام، المصدر السايق، ص.٨٣

٥١. د.علي صادق أبو صيف، القانون الدولي العام، المصدر السابق، ص.٨٨

بەهێزبکات و کۆمەڵ پارچە پارچە نەبێت و بە ڕێگەی پێشکەوتن وگەشانەوەدا بڕوات.[٥٢] جورج سیل ڕۆڵی گەورەی هەبووە لە گواستنەوەی ئەم تیۆرییە بۆ بواری یاسای نێودەوڵەتی، لەو بڕوایەدا بوو ئەم کۆمەڵەیەش پێویستە یاسای هەبێت، ئەمەش دەرئەنجامێکی سەرەکی و ئامادەی واقیعی کۆمەڵی نێودەوڵەتییە.

(جورج سیل) ئەم پەیوەندییەی لەنێوان یاساو واقیعی کۆمەڵ ڕوونکردەوە و بنەمای پابەندێتی یاسایی بە یەك وشە کە ئەویش پێویستییە دەرخست، بە مانایەکی تر، یاسا لای ئەو ناوەڕۆك و خاسیەت و پابەندێتی لە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان وەردەگرێت، ئەم تیۆرییە لە ئەمڕۆی کۆمەڵی نێودەوڵەتی و پەیوەندیی نێوان گەلان و دەوڵەتاندا، چاخی مامەڵەی بەرامبەرو ئاڵوگۆڕیی لە نێوانیاندا، هەروەها بۆلیتس بە هەمان شێوە دەڵێ یاسا لەسەر هاریکاری و هۆشی یاسایی وەستاوە.[٥٣]

ڕەخنە لەم تیۆرییەش دەگیرێ کە فیکرەیەکی ناڕۆشن و نادیارو ناتەواوەو بنەمای یاسا دەبێ ڕۆشن وردو دیاریکراو بێت، یاسا مەرج نییە تەنیا گوزارشت بێت لە هاریکاریی کۆمەڵگا، بەڵکو زۆرانبازی و ململانێی تاك و دەستەکانیشە، جگە لەوەی کە پێویستییەکان تەنیا ماددی نیین، بەڵکو مەعنەویشن، بۆیە ئەم تیۆرییە بنەمای پابەندێتیی یاسامان بۆ دەستەبەر ناکات.

## ٧- تیۆریی پرینسیپی ڕەگەزنامەیی (مبدأ الجنسيات)

ئەم پرینسیپە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا یەکێتی ئەڵمانیاو ئیتالیای لەسەر بنیاتنرا، بنەماکەی دەگەڕێتەوە بۆ یاساناسی ناسراوی ئیتاڵی مانشینی کە پێیوایە، مافی ئازادیی گەلان، ماف دەداتە هەموو کۆمەڵێکی هاوڕەگەز کە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان پێکبێنن. ڕەخنەش لەم تیۆرییە دەگیرێ کە لە ڕووی واقیعی و پراکتیکییەوە بۆ هەموو ڕەگەزێك لە جیهاندا دەوڵەت پێکنایەت و، لەگەڵ ئاشتی و تەنایی زۆرێك لە دەوڵەتانی گەورەو ئارامی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان ناگونجێ.[٥٤]

---

٥٢. د. على صادق أبو هيف، دراسة متعمقة فى القانون الدولى العام، ص.٧٤

٥٣. عبدالفتاح عبدالرزاق، المصدر السابق، ص.١١١

٥٤. بۆ زیاتر بڕوانە: د. على صادق أبو هيف، دراسة متعمقة فى القانون الدولى العام، المصدر السابق، ص٧٤.

لە کۆتایی تاوتوێکردنی سەرجەم ئەو تیۆرییانەی کە بۆ سەلماندنی بنەمای یاسایی یاسای نێودەوڵەتی و پابەندێتی خستمانەڕوو (جگە لە قوتابخانەی سۆڤیەتی کە لەسەر بنەمای زۆرانبازی و ململانێی چینایەتیی دامەزراوە و پێیوایە یاسا گوزارشتە لە خواستی چینی باڵادەست لە هەر کۆمەڵگایەکدا و ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندییە مادییەکانیەتی)، تیۆرییەکانی هێز، بەرژەوەندی و ڕەگەزی و هاوسەنگیی نێودەوڵەتی لەگەڵ پێشڤەچوونی یاسای نێودەوڵەتیی هاوچەرخ لە کاتی ئێستادا ناگونجێن.

تیۆرییەکانی تر، وەك تیۆریی خواستگەرایی و بابەتی، کە پێشتر ڕەخنەیان لێگرا، خاوەنەکانیان لەهەر بارێکدا جۆرێك لە زیادەڕەوییان تێدایە، بۆیە یاسای نێودەوڵەتی دێتەئاراوە و سیفەتی ئیلزامی لە بنەماکانی هاریکاری و کۆدەنگی هەردوو هۆکاری بابەتی و خواستی مرۆڤایەتی پێکدێنێت.

ئەگەر خواستگەرایی ڕۆڵی هەبێت لە داڕشتنی فیکرو پرینسیپەکان و لە قالبدانی لە شێوەی ڕێسای یاسایی بۆ ئەوەی بە باشی جێبەجێ بکرێت، بەڵام ئەم خواستە سەرچاوەکەی لە پێویستی و لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی وەك پرینسیپەکانی دادوەری و هاریکاری و بەیەکەوەژیان و یەکسانیی گەلان و بەرژەوەندیی مرۆڤایەتی و بەهەندوەرگرتنی لایەنەکانی ماددی و مەعنەویی مرۆڤ وکولتووری هاوبەشی مرۆڤایەتی و ویژدان و پرەنسیپەکانی ڕەوشت و ڕای گشتیی جیهانی و شارستانیەت و باڵایی و گەشەکردن و پێگەیشتنی هۆشیاریی نێودەوڵەتی سەرجەم گەلانی جیهان سەرچاوە دەگرێ کە مانەوەو پێشکەوتنیان بەستراوەتەوە بەوەی کە تا چەند دەوڵەتان پابەند دەبن بە ڕێزگرتنی ڕێساکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی. بەتایبەت لە ئەمڕۆی جیهاندا کە جیهان وەك گوندێکی بچوکی لێهاتووە و جیهانگیری و پەیوەندییەکان و شۆڕشی تەکنۆلۆژیا ئەو هەستەیان دروستکردووە کە گەلان و دەوڵەتان دەبێ هاریکاری یەکتر بن بۆ ئەوەی ئاشتی و تەنایی بەرجەستە بن و ڕێز لە پێویستییەکانی مرۆڤ وەك بەرزترین سەرمایە بگیرێ.[٥٥]

---

٥٥. د.محمد حافظ غانم، الأصول الجديدة لقانون الدولى العام، المدر السابق، ص٥٥، د. محمد السعيد الدقاق، حول مبدأ التراث المشترك للأنسانية، المكتنب العربي الحديث، ١٩٨٢، و د. حسن الجليي، المصدر السابق، ص ص ٤٩-٥٠.

## ٢

## هەندێ پێشهاتی نوێی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

لە رەوتی پەرەسەندنی ئەم یاسایەدا چەندین بوارو خەسڵەت بۆ ئەم یاسایە هاتوونەتەپێش کە گرنگترینیان لەم چەند خاڵانەدا دەخەینە روو:

### ٢-١: هۆکارەکانی بەرەوپێشچوونی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

کۆمەڵێ هۆکار هەبوون کە کاریگەرییان لەسەر خێرا بەرەوپێشچوونی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی هەبووەو بە سیماکانی بەرەوپێشچوونی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی لەقەڵەم دەدرێن[٥٦]:

١. هاتنەئارای رێسای یاسای نێودەوڵەتیی کلاسیکی لە سەدەکانی ١٦ و ١٧ و ١٨ دا بەسترابۆوە بە دەوڵەتە ئەوروپییەکان،گەلانی تر بەشدارییان تێدا نەکردووە، چونکە بەشێکیان لەژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزمدا بوون، دوای ئازادبوون و بەشداربوونیان لە کاروباری نێودەوڵەتی، لە سەردەمی نەتەوە یەکگرتووەکاندا و لە ئەمڕۆدا ژمارەیان گەیشتە ١٩٣دەوڵەت، لەکاتێکدا ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی کە بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانیان واژۆ کرد (٥١) دەوڵەت بوون، ئەم دەوڵەتانەش بەشدارییان لە دانانی رێساو هەمووارکردن و گۆڕاندا کرد، جگە لە زۆربوونی کەسایەتییەکانی تری یاسای گشتیی نێودەوڵەتی.

٢. لە جەنگی دووەمی جیهانیدا و دوای وەستانی شەڕ هەوڵدرا ئاشتی بۆ جیهان بگەڕێتەوە، بەلاّم دابەشبوونی جیهان بۆ دوو جەمسەری رۆژهەلاّت و رۆژئاوا، وایکرد پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان پشێوییان تێبکەوێ و زۆرانبازی نێوان دەوڵەتان توند بێت، لەبری

٥٦. د. رشاد السيد، القانون الدولي العام في ثوبه الجديد، ٢٠٠١، عمان- الأردن، ص٢٤، و د. عصام العطية، المصدر السابق، ص٢٨٥.

ئاشتی، جەنگی سارد بێتەئاراوە، ئەمەش وای لە هەندێ دەوڵەت کرد هاوپەیمانی و ڕێکخراوی سەربازی و سیاسی دروست بکەن، وەك پەیمانی ئەتڵەسی سەر بە یلۆکی ڕۆژئاوای سەرمایەداری و پەیمانی وارشۆی سەر بە بلۆکی ڕۆژهەلاتی سۆسیالیستی، دەوڵەتانی تازە گەشەسەندوو، بزووتنەوەی بێ لایەنی دروست بکەن، کە لە کۆنگرەی باندۆنگ ریشەی داکوتا.

٣. کۆمەڵگای نێودەوڵەتی چەندین ڕێکخراوی جۆربەجۆری نێودەوڵەتی و هەرێمی دروستکرد، کە ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ پێویستی ڕێکخستنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان. بۆ هاوکاریکردن لە سەرجەم بوارەکانی سەربازی و سیاسی و ڕۆشنبیری و ئابووری و دارایی و بازرگانی و...هتد، و چەندین ڕێکخراوی جیهانی و ئاژانسگەلی تایبەتی سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان دروست بوون، وەك ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی و تەندروستی جیهانی و یونسکۆو ئۆپێك و بازرگانیی نێودەوڵەتی و....هتد، ئەمەش کاریگەریی بەرچاوی هەبووە لە هاتنەئارای ڕێسای نوێ.

٤. کۆمەڵی نێودەوڵەتیی هاوچەرخ سیمایەکی دیاری بزووتنەوەی رزگاریخوازیی گەلانی بەخۆوە گرت لە ئاسیا و ئەفریقیا و ئەمەریکای لاتینی و دروستبوونی دەوڵەتی نوێ و، ئەمانەش کاریگەرییان لەسەر هاتنەئارای پرینسیپی نوێ هەبووە لە یاسای گشتیی نێودەوڵەتیدا، لە کاتێکدا لە پاڵ چەمکی مافی چارەنووس لە ساڵی ١٩٦١ دا، خەباتی رزگاریخوازی رەوایی پێدراو ماف و ئەرکی یاسایی کەوتە ئەستۆ.

٥. پێشکەوتنی بەرچاوی زانست و تەکنۆلۆژیاو دۆزینەوە نوێیەکان لەسەر ئاستی ناوخۆی وڵات و بۆشایی ئاسمانی و دۆزینەوەی ئەتۆم و گەیشتن بەقوڵایی دەریاکان و پێشکەوتنە پیشەسازییەکان، وایانکرد لقی نوێی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی و ڕێسای نوێ بێنەئاراوە کە تا ئێستاش بەردەوامە.

٦. هاتنە ئارای سیستەمی نوێی جیهانی کە بە ڕووخانی یەکێتیی سۆفیەت لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا دەستی پێکرد و لەگەل خۆیدا سیماکانی جیهانگیری و باهۆزی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و شۆڕشی تەکنۆلۆژیاو زانیارییەکان و شەڕی دژە تیرۆری هێنایەئاراوە، بوارێکی نوێی بۆ یاسای نێودەوڵەتی هێنایە پێش کە خۆی لە چەندین لق و ڕێککەوتننامەدا دەبینێتەوە کە گۆڕانی بنەڕەتییان بەسەر ئەم یاسایەو لقەکانیدا هێناوە.

## ٢-٢ : هەندێ گۆڕانکاری کە بەسەر یاسای نێودەوڵەتیدا هاتوون

ئەم یاسایە بەردەوام لە باری پێشکەوتن و نوێکردنەوەو گۆڕاندایە، کە بەردەوامیی ژیانی مرۆڤایەتی و پێداویستییەکان دەیهێننە ئاراوە. ئەمانەی خوارەوە چەند لایەنێکی ئەم بوارەن:

١. زۆربوونی ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی بەشێوەیەکی بەرچاو. فراوانبوونی پێگەو بواری کارکردن و زیادبوونی کاریگەرییان لە سەر رەوتی رووداوو پێشهاتە نێودەولّتیەکان.

٢. فراوانبوونی ئەو بابەتانەی کە یاسای گشتیی نێودەوڵەتی چارەسەریان دەکات، کە تەنیا جەنگ و ئاشتی نین، بەڵکو هاوکاریی نێوان دەوڵەتانیشە لە بوارەکانی ئابووری و تەکنۆلۆژیا و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و...هتد.

٣. بایەخی دەوڵەتان بە مەسەلەکانی وەك گەشەپێدانی ئابووری، بازرگانیی نێودەوڵەتی، رێوشوێنی دابینکردنی کالاّی سەرەتایی، یارمەتیدانی دەوڵەتانی تازە گەشەسەندوو کەمکردنەوەی کەلێنەکانی نێوان دەوڵەتانی دەوڵەمەند و دەوڵەتانی هەژار و.... زۆر بابەتی تری چارەنوسساز زیادیان کردووە.

٤. ملکەچبوونی بابەتی خۆپڕچەککردن بۆ یاسا لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانییەوە پێشکەوتنی گەورەی بەخۆوە دیتووە.

٥. ئەو مەترسییانەی کە لە ژینگە و سامانە سروشتییەکان بەهۆی زیادبوونی پاشماوەو دوانە ئۆکسیدی کاربۆن و ماددەی کیمیایی کارخانە و سووتان و بڕینەوەی دارستانەکان و تەقاندنەوەو....هتد، دێنە ئاراوە رێساو لقی نوێیان هێناوەتە ئاراوە.

٦. پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژی و کاریگەرییان لەسەر هەندێ رێسا و یاسای نێودەوڵەتی هەیە، لەوانە سەروەریّتی، ئازادیی دەریاوانی، ئازادیی دەستکەوتنی بەرهەمی سروشتی، ئازادیی بازرگانیی دوەلی، ئازادیی بەکارهێنانی هێز و...هتد.

٧. باهۆزبوونی مافەکانی مرۆڤ و بە جیهانیبوونی بەهاکانی مرۆڤایەتی و چەسپاندنیان لەناو بەڵێننامەو پەیماننامەکان کە خاسیەتی ئیلزامییان وەرگرتووە و تاك بووە بە سەنتەرێکی بە هێزو کارای یاسای گشتیی نێودەوڵەتی.

## ٢-٣ : لقەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتیی

بەشێوەکی گشتیی دەگوترێ لە هەر کوێ کۆمەڵ هەبێت، لەوێش یاسا هەیە. ئەم گوتەیە بۆ کومەڵگای نێودەوڵەتیش راستە. دیارە یاسای نێودەوڵەتیی گشتیی وەکو چوارچێوەیەکی

یاسایی، حوکمی کۆمەڵی نێودەوڵەتی دەکات، بە شێوەیەك کە بەرژەوەندیی گشتیی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەرجەستە بکات، ئەمەش وا دەخوازێ کە گونجان و هاوڕێکی هەبێت لەنێوان یاسا وەك چوارچێوەیەکی بنکەیی ڕێسایی و لەنێوان واقیعی ژیانی ڕۆژانەی نێودەوڵەتی. هەربۆیە یاسای نێودەوڵەتی کە پێشان بابەتی کلاسیکی تێدابوو، ئێستاش گرنگی خۆیان هەیە، وەك فیکرەی سەرروەریێتی، پێویستی و زەرورەتی وەفاداری بە پەیماننامە، نیازپاکی لە ئەنجامدانی ئیلتیزامە نێودەوڵەتییەکاندا. ئێستا ئەو یاسایە چەندین لقی لێ بۆتەوە کە پوختەیەکیان لەدەخەینە روو، لقە سەرەکییەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی بریتین لە:

١. یاسای نێودەوڵەتیی مافەکانی مرۆڤ (قانون حقوق الانسان الدولي).
٢. یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی (القانون الأنساني الدولي).
٣. یاسای تاوانکاریی نێودەوڵەتی (القانون الدولي الجنائي).
٤. یاسای پەنابەران (قانون اللاجئين).
٥. یاسای بەڕێوەبردنی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکان (قوانين تحكم العلاقات الدبلوماسية).
٦. یاسای بەڕێوەبردنی پەیوەندییە ئابوورییەکان (قوانين تحكم العلاقات الأقتصادية).
٧. یاسای ژینگە (قانون البيئة).
٨. یاسای نێودەوڵەتی دەریایی (القانون البحري الدولي).
٩. یاساکانی ڕێکخستنی بۆشایی ئاسمانی (قوانين تحكم المجال الجوي).
١٠. یاسای پەنابردن بۆ هێز (قانون اللجوء الى القوة).
١١. یاسای ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان (قانون المنظمات الدولية).
١٢. یاسای بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی (قوانين تحكم مسؤولية الدولة).
١٣. یاسای چارەسەرکردنی ئاشتییانەی ناکۆکییەکان (قوانين تحكم التسوية السليمة للنزاعات).
١٤. یاسای پەیماننامەکان (قانون المعاهدات).
١٥. یاسای گەیاندن -بێتەل و بە سیم-ە نێودەوڵەتییەکان (قانون الاتصالات الدولية).
١٦. یاسای نێودەوڵەتیی تیرۆر (قانون الارهاب الدولي).

دیارە یاسای نێودەوڵەتی لەسەر فیکرەی پەیوەندیی و بەیەکەوەژیان و هەماهەنگی دەوەستێ نەك هەر لەسەر تاکگەرایی و خودپەسندی کە زێتر لەژێر باری یاسای نێودەوڵەتیی کلاسیکیدا وا بووە. ئەمەش کاریگەریی دەبێ لەسەر مەبەستەکانی ئەم یاسایە کە ئێستا بە ئامانجی گشتی نەك تاکە ئامانجێك دەناسرێتەوە، هەروەها

ڕێکخستنی مافەکانی دەوڵەتان، هاندانی هاریکاری ڕۆشنبیری و کۆمەلآیەتی و ئابووری، بایەخدان بە بەرژەوەندیی گشتیی نێودەوڵەتی.

هەموو ئەمانە نابێ ئەو ڕاستییەمان لە لا لێڵ بکەن کە دەوڵـەتان لـە پەیوەندییەکانیانـدا بەشێوەیەکی تایبەتی بەگوێرەی بەرژەوەندی و سۆز و قازانجی خۆیان مامەڵە دەکەن، هـەروەها دەوڵەتان بەرژەوەندیی تایبەتیان لەوەدایە زۆرترین شـتیان بەرامبـەر پێـدانی کـەمترین شـت، دەست بکەوێت. کارەکان بە دەنگێکی بـەرزتر لـە وشـەکان قسـە دەکـەن. Actions speak launder than words.

لەگەڵ ئەوەشدا یاسای نێودەوڵەتیی ئێسـتا لـەڕووی نـاوەڕۆك، کەسـەکانی، سروشـتی، یـان ڕێگەی ئامادەکردن و بەرەوپێشچوونەوە جیـاوازە لـەو یاسـایەی کـە لـە سـەدەکانی پێشـتر لـە ئارادابوو،، گرنگترین ئەو فاکتەرانەی بەشدارییان لەم گۆڕانەدا کردووە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو گۆڕانـە جەوهەرییەی کە لە پێشکەوتنی یاسای پەیوەندییەکاندا هاتۆتـەدی بـەرەو دیموکراتیـەت چـوونی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە دەرکەوتنی کەس و لایەنی تری یاسایی جگە لە دەوڵەت.

**٢-٤: کەموکوڕییەکانی ئەم یاسایە**

یاسای نێودەوڵەتیی گشتی چەند لایەنێکی لاوازو کەموکوڕیی تێدایە، گرنگترین ئەو خاڵـە لاوازانە ئەمانەن:

١. یاسای نێودەوڵەتی وا جێگەی گرتووە کە دەوڵەت لە ئاستی نێودەوڵەتی، ئیلتیزام بە هیچ ڕێسایەك لە ڕێساکانی ناکات کە بە ڕەزامەندی و خواستی دەوڵەت خۆی نەبێت، مەگـەر چەند ریزپەڕییەك -استثناء- هەبێت[٥٧].

٢. یاسای نێودەوڵەتی لە زۆرباردا نەیتوانیوە وەك پێویست بەرەنگاری، یـان ڕووبـەڕووی شەڕ، یان پێشێلکاری ڕێساکانی ببێتەوە. لـە توێژینەوەیەکـدا کـە گۆڤـاری تـایمی ئـەمریکی سەبارەت بە جەنگ وەك بارێکی هەمیشەیی واقیعی ژیانی مرۆڤایەتی بـلاّوی کردبـۆوە، روون بۆتەوە کە لە ١٨٥ نەوە، تەنیا دە نەوە بە ئاشتی و تەنایی ژیاون، لە ٣٣٥٧ ساڵ، مرۆڤایەتی تەنیا ٢٢٧ ساڵ بە ئاشتی ژیاوە.

٣. یاسای نێودەوڵەتی بە پراکتیك و واقیع دان بە نایەکسانی لـەنێوان دەوڵـەتان (لـە هەموو ڕووەکانی سیاسی و ئابووری وسەربازی و ڕۆشنبیری)یەوە دەنێ و، نەیتوانیوە چـارەی

---

٥٧. سەیری پاشکۆکانی ٢و٣و٤بکە.

ئەم گرفتە بکات و جۆرێك لێکنزیکی پلەبەپلە لەناو ئەنـدامانی کۆمـەڵگای نێودەوڵەتیـدا دروست بکات.

٤. یاسای نێودەوڵەتی هەتا ئێستاش ماف بە دەوڵەت دەدات کە لە یەك کاتدا حـەریف — نەیار- و ناوبژیوان بێت (واتە دادوەر بێت لە کێسی تایبـەت بـە خـۆی)، کـە ئەمـەش لـە مەسەلەکانی تایبەت بە مامەڵەی وەکیەك (المعاملة بالمثل)، و دژە ڕێوشوێن (التدابيرالمضادة)، و پچڕانی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکان...هتد دەردەکەون و بـۆ یەکلاکردنـەوەی کێشـەیەك لـە لایەن دادگای نێودەوڵەتی دەبێ لایەنەکان ڕەزامەندی دەربڕن.

٥. لە ڕووی واقیعییەوە، یاسای نێودەوڵەتی لەوە پشتڕاستە کـە لـە هەنـدێ ئیشـوکاری نێودەوڵەتیدا باڵادەستیی هەندێ لە دەوڵەتانی (بەتایبەت زلهێزەکانی) بەسەرەوەیە.

ئەم بۆچوونانەو زیاتریش کە وەك چاودێر و لـە هـەمان کاتـدا وەك هاوڵاتییـەکی ئاسـایی گوێبیستی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و خستنەرووی واقیعی سیاسەتی نێودەوڵەتی دەبین، لەوانەیـە تا ڕاددەیەك ئاسایی بێت کە دڕدۆنگییەك بەرامبەر ئەم یاسایە دروست ببێت. دەستدرێژیکردن بـۆ سـەر دەوڵـەتانی بێهێـز، پێشـێلکردنی مەرجـەکانی پەیماننامـە و ڕێککەوتننامـەکان و پشتگوێخستنی مافی چارەنووسی گەلان و قـۆرخکردنی سەرچـاوەکانی وزەو سـامانی گـەلان، تۆمەتی ئەوەی کە یاسا لایەنگری دەوڵەتی بەهێز دەکات لەسەر حیسابی لاواز و، دەستوەردانی ناڕەوا لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتاندا، ئەمانەو هی تـریش کاریگـەریی ڕاسـتەوخۆیان لەسـەر هۆش و هەستی خەڵك بەگشتی هەیە، ئەمەش وا دەکات نائومێدی بەرامبـەر ئەحکامـەکانی ئەم یاسایە دروست ببێت.

بەڵام وێنەی ڕاستەقینەی قبوڵکراوو بە بەهای یاسای نێودەوڵەتی، ئەم لایەنە نا ئومێدییـە ناگەیێنێ، دەوڵەتانی جیهان بەم یاسایە پابەندبوون و سەرپێچیکردن لە پرینسـیپ و ڕێسـاکانی حاڵەتی ریزپەڕو بەدەرن، سەدەها پەیماننامەو ڕێککەوتننامە کە زۆر لە بابەت و مەسـەلەکانی جێی بایەخ و خەیاڵی مرۆڤیان تێدایە، ئەو دەوڵەتانەی کـە واژۆیـان کـردووە پێیانـەوە پابەنـد دەبن، هەر لـە چەسـپاندنی ڕێسـاکانی دیپلۆماسـی و داواکـاری و دادگایـەکانی تایبـەت بـە قەرەبووکردنەوەی ئەوانەی زیانیان پێکەوتووەو لەسەر دەوڵەتی سەرپێچیکاریان سەپاندووە کـە قەرەبووی لایەنی زیانلێکەوتوو بکاتەوە. زۆر لە ڕێساکانی یاسای نێودەوڵـەتی هاتوونەتـە نـاو یاساکانی ناوخۆو بە پێچەوانەشـەوە، دادگاکـانی ئـەو وڵاتانـە جیبـەجێیان کـردوون، یاسـای نێودەوڵەتی کۆمەڵێ ڕێوشوێن و ڕێکاری پێشکەشکردووە بـۆ یەکلاکردنـەوەی ناکۆکییـەکانی

نێوان دەوڵەتان کە جێگەی خۆیان گرتووە. لە بــواری دادگــای نێودەوڵەتیــدا ئــەم یاســایە زۆر چۆتەپێش، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەم یاسایە لە رەوتی پەرەسەندن و پێشکەوتنی خۆیدایە[٥٨] .

### ٢-٥: گرفتی جێبەجێکردنی یاسای نێودەوڵەتی

لە میانەی باسکردن لە سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتی، دەبێ بپرسین کە کێ ئەم یاســایە جێبەجێ دەکات، ئەم ریزپەڕانە چین کە کار دەکەنە سەر جێبەجێکردنی ئەم یاسایە [٥٩].

**یەکەم:** کێ یاسای نێودەوڵەتی جێبەجێ دەکات:

١. پێش هەر کەسێکی تری یاسای نێودەوڵەتی، دەوڵەت لە رێگەی دەزگاکانیەوە بەرپرسە لە جێبەجێکردنی ئــەم یاســایەو کەمتەرخــەمی دەزگایــەکانی یــان چــاودێریکردن بــۆ جێبــەجێکردنی رێساکانی یاسای نێودەوڵەتی، رووبەڕووی دەوڵەت دەبێتەوەو بەرپرسیارێتی بەرامبەر کەسەکانی تری یاسای نێودەوڵەتی هەڵدەگرێ، ئەگەر بە پێچــەوانەی ئــەو رێســایانە رەفتــاری کــرد. لێــرەدا رۆڵــی یاسازانان دەردەکەوێ کە دەبێ دەزگاکان بۆ حوکمەکانی ئەم یاسایە رێنوێنی بکەن.

٢. کۆمەڵە سیاسییەکان کە بە مانای یاســایی دەوڵــەت نــین، بــەڵکو لــە بــارودۆخێکی تایبەتدا دەسەلاٌتی راستەوخۆیان بەسەر گەلێك لە چوارچێوەی هــەرێمێکی دیــاریکراودا دەڕوا، دەبنە هۆیەك بــۆ جێبــەجێکردنی یاســای نێودەوڵــەتی، وەك لایەنــەکان لــە حاڵــەتی نــاکۆکی چەکداری ناوخۆ ئەگەر هەندێ دەوڵەت دانیان نا بە لایەنەکاندا، دەبێ پابەنــدبن بــە رێزگرتنــی رێساکانی یاسای نێودەوڵەتی بە تایبەت ئەوانەی کە پەیوەنــدییان بــە بــواری چــەکداری و بــێ لایەنی هەیــە. هــەروەها بزووتنــەوەی ئــازادیخوازیی گــەلان کــە لەلایــەن کەســەکانی یاســای نێودەوڵەتی دانیان پێدا دەنرێ بۆ دەستەبەرکردنی مافی چارەنووس.

٣. جێبەجێکردنی یاسای نێودەوڵەتی بە هۆی رێکخراوو دەزگا نێودەوڵەتییەکانەوە.

**دووەم:** ئــەو حاڵەتانــەی کــە بــەدەرن (استــثنــاء) لــە جێبــەجێکردنی رێســای یاســای نێودەوڵەتی حاڵەتە بەدەرەکانی جێبەجێکردنی رێسای نێودەوڵەتی، کە دەوڵــەت کــار بــە پێچەوانەی یاسای نێودەوڵەتی لە بــارێکی تایبەتــدا دەکــات، پاســاوی بــۆ دەهێنێتــەوە، گرنگترینی ئەو حاڵەتانە ئەمانەن:

---

٥٨. بۆ زیاتر بڕوانە: جیرهارد فـان غـلان، القـانون بـين الأمـم (٣)، تعريـب ايلـي وريـل، دار الأفـاق الجديـدة، ص٢٣٣ وما بعدها. و د. رجب عبـدالمنعم متـولي، الأمـم المتحـدة بـين البقـاء والألغـاء في ضـوء التطـورات الراهنة، ٢٠٠٥، ص١٣٥ وما بعدها.

٥٩. د. ابراهيم محمد العناني، ص٢٠٢.

١. سەروەرێتی: زۆر جار دەوڵەت بە پاساوی ناکۆکبوونی ڕێسایەك لە گەڵ سەروەرێتیی دەوڵەتدا، ڕێسایەکە جێبەجێ ناکات، بەڵام یاسای نێودەوڵەتی بە هۆی نابابەتی و مەترسی ئەم حاڵەتە، گوێ بەم پاساوە نادات، چونکە دەرگا بۆ خۆدزینەوە لە جێبەجێکردنی ڕێساکانی ئەم یاسایە دەکاتەوە.

٢. بارودۆخی چاوەڕواننەکراو: سیستەمە یاساییەکانی ناوخۆ ئەم بارەیان بەهەند وەرگرتووەو دادگای نێودەوڵەتی وەك پرینسیپێکی یاسایی گشتی دانی پێدا ناوە. کە خۆی لە ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراودا دەبینێتەوە کە لە دەرەوەی خواستی لایەنەکان، جێبەجێکردنی ڕێسایەکە دەکاتە کارێکی کەس نەکردە.

٣. حاڵەتی پێداویستی: لە حاڵەتێکدا کە جێبەجێکردنی ڕێسایەك باری دەوڵەت گران دەکات و توشی مەترسی و زیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بکات، ئەم پرینسیپە ئەگەرچی لە پرینسیپە گشتییەکانی سیستەمی ناوخۆ جێی خۆی کردۆتەوە. بەڵام لە ئاستی نێودەوڵەتی قبوڵ نییە، بۆیە دەبێ لەمبارەدا دەقێکی تایبەت و راشکاوانە هەبێت کە لایەنەکان لەسەری ڕێککەوتبن.

٤. حاڵەتی بەرگریی رەوا: ئەم پرینسیپە لە ماددەی ٥١ی بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە هاتووە، کە دەوڵەتانی ئەندام چ بە تاك و چ بە کۆ مافی بەرگری لە خۆکردنیان هەیە. ئەگەر بە هێزی سەربازیی دەستدرێژییان کرایە سەر.

## ٢-٦: کارایی ڕێسای یاسای نێودەوڵەتی

کارایی ڕێسای یاسای نێودەوڵەتی لەسەر سێ هۆکاری سەرەکی وەستاوە [٦٠]:

١. سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتی، کە چوارچێوەی ڕەفتاری مامەڵەو هەڵسوکەوتی نێودەوڵەتی دیاری دەکەن.

٢. بەرەوپێشچوونی بنەچەی ئیلزامیەتی یاسای نێودەوڵەتی، کە ئەمەش بۆ دان پێدانان و هەستی فەرمانڕەوایی دەوڵەتان دەگەڕێتەوە کە دەبێ ڕێز لە حوکمەکانی یاسای نێودەوڵەتی بگرن.

٣. بوونی سیستەمێکی سزا بۆ ئەو کارە ناڕەوایانەی دەرهەق بە یاسای نێودەوڵەتی دەکرێن، چونکە سزا وا دەکات ڕێسای یاسایی ببێتە ڕاستییەکی واقیعی و هەر ئەمەش ئامرازی جێبەجێکردنی یاسایە.

---

٦٠. د.غازي حسن صباريني، الوجيز في مباديء القانون الدولي العام، دار الثقافة للنشر والتوزيع، ط١، ٢٠٠٥، ص ص ١٥- ١٦.

## ٣

## سروشتی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

باسکردنی سروشتی یاسایی هەر سیستەمێکی یاسایی بە کارێکی ئەستەم و نادیار لە قەڵەم دەدرێت. یاسای گشتیی نێودەوڵەتی گشتیی وەك ماهییەت و سروشت، یاسایەکە پەیوەندییەکانی نێوان کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی بەرێوەدەبات (بەتایبەت دەوڵەت و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان) و یەکەکانی تری ئەم یاسایە (وەك بزوتنەوەی رزگاریخوازیی نیشتیمانی و ئەو هەرێمانەی خودموختارییان وەرنەگرتووە، کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان یا فرەنەتەوەکان و.. هتد). ئەم یاسایە کە حوکم بەسەر ڕەفتار و پرۆگرامی کەسەکان و یەکە سەربەخۆیەکاندا دەکات، لە ڕووی پرسینەوە هیچ یەکێکیان دەسەڵاتی بەسەر ئەویتردا ناشکێ، هەموویان ملکەچی یاسای گشتیی نێودەوڵەتین.

لەژێر ڕۆشنایی ئەمەدا دەگوترێ زۆربەی ڕێساکانی یاسای نێودەوڵەتی (ڕێسای هەماهەنگی و بەیەکەوە ژیان و میانگیرین) بۆ ڕەفتاری کەسەکان و ئەو یەکە یاساییانەی دەکەونە ئەم چوارچێوەیەوە، نەك (یاسای ئیلزامی مادی و ملکەچکردن)ی ئەوکەس و یەکانە، تەنیا لە چەند بارێکی کەمدا نەبێت[٦١].

لێرەدا پرسیار دەکرێ، ئایا ڕێساکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی ڕێسای یاسایی دروستن. یاساناسان لەم ڕووەوە بۆچوونیان جیاوازە، هەندێکیان دەڵێن ڕێسای یاسایی دروستن، دەبێ دەوڵەتان پێیانەوە پابەند دەبن هەروەك چۆن تاك بە یاسای ناوخۆوە پابەند دەبێت، هەشیانە

---

٦١. د. أحمد أبو الوفا، الوسيط في القانون الدولي العام، دار النهضة العربية، ط٤، ٢٠٠٤، ل٢٥.

نکوڵی لەوە دەکەن کە ئەم یاسایە، خاوەن ڕێسای یاسایی ئیلزامـی خـۆی بێـت و بەڵگەشـیان ئەوەیە هەر ڕێسایەك بۆ ئەوەی ببێتە ڕێسای یاسایی ئیلزامی، دەبێ ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١. لە دەسەڵاتێکی یاسادانانەوە دەرچووبێ.
٢. دەسەڵاتی دادوەری جێبەجێی بکات.
٣. سزای بۆ هەر کەسێ هەبێت کە سەرپێچی و پێشێلکاری ئەم یاسایە بکات.

ئەوانەی نکوڵی لە نەبوونی ڕێسای ئیلزامی لە یاسـای نێودەوڵەتیـدا دەکـەن، دەڵـێن ئـەم مەرجانە لەم یاسایایەدا نیین، بەڵکو ڕێساکانی ئەم یاسـایە، کۆمەڵـە ڕێسـایەکی ڕەوشـتیین و سەرپێچیکردن لەو یاسایە بەرپرسیارێتی یاسایی لەسەر نییە.

هەر بۆیە پێویسـتە ئـەوە بخەینەڕووکـە یاسـای نێودەوڵـەتی کۆمـەڵێ خاسـیەتی هەیـە، گرنگترینیان ئەوانەن کە پەیوەندییان بەلایەنی هەیکەلی و بابەتی و کەسییەوە هەیە، کـە بـەم شێوەیە دەیانخەینە ڕوو[٦٢]:

**٣-١: لە ڕووی هەیکەلییەوە:**

ئەوە ڕووندەکەینەوە کە ئایا ئەم یاسایە مەرجـەکانی یاسـادانان و دادوەری تێدایـە، ئایـا سزایەکی ڕێکوپێکی بۆ پێشێلکەران هەیە، بۆ ئەوەی یاساییبوونی بسەلمێنرێت؟ لە خوارەوە بە کورتی شرۆڤەی ئەم پرسانە دەکەین:

١- دەسەلاتی یاسادانان

لـەو ڕووەی کـە یاسـای گشـتیی نێودەوڵـەتی، ئەگەرچـی لـە دەسـەلاتی یاسـادانانەوە دەرنەچووە، ناتوانین بڵێین ئەم یاسایە خاسیەتی ڕێسـای یاسـایی نییـە، چـونکە (تەشـریع-یاسای دانـراو)، تاکـە سەرچـاوەی یاسـادانان نییـە، بـەڵکو عـورف، دادگـاو گرێبەسـت و پرینسیپەکانی یەکسانی و ویژدانی و.. هتـد، بـە سەرچـاوەی یاسـا دادەنـرێن و خاسـیەتی ئیلزامییان هەیە. هەربۆیە کە یاسای گشتیی نێودەوڵەتی لە دەسەلاتی بـالای یاسـادانانەوە دەرنەچووە، ناتوانین بڵێین یاسا نییە[٦٣].

---

٦٢. د. عبدالحسين القطيفي، القانون الدولي العام (الجزء الأول)، مطبعة العـاني، بغـداد، ١٩٧٠، ص٣٢ ومـا بعدها، ود.أحمد أبو الوفا، الوسيط في القانون الدولي العام، المصدر السابق، ص ص ٢٥-٢٦.

٦٣. بۆ زیاتر بڕوانە: د. السيد محمد السيد العمران، د. نبيل ابراهيم سـعد، محمـد يحـي مطـر، الأصـول العامـة للقانون، الدار الجامعية، ١٩٩١، ص٥٩.

له لایەکی تر ئەگەر نکوڵی لە لایەنی پۆزەتیڤی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی بکەین، ئاژاوەی نێودەوڵەتی دێتە ئاراوە، هەربۆیە ئەو پابەندبوونەی کە بە ڕێسای یاسایی پەیوەستە، بەگوێرەی بۆچوونی یاسایی ئێستا، مانایەکی قووڵی مەعنەوی و کۆمەلایەتی هەیە، وێڕای مانا شکڵی و یاساییەکەی، واتە ئەوانەی کە مل بۆ ڕێسای یاسایی بەگشتی دەکەن لە ناخی خۆیاندا هەستدەکەن پێش هەموو شتێك پابەندن بە ڕێزگرتن و جێبەجێکردنی ئەم یاسایە چونکە پێویستیان پێیەتی، کەواتە پابەندبوونێکی کۆمەلایەتی هەیە، کە بەرژەوەندیی هەمووانی تێدایە، ئینجا پابەندبوونی یاسایی دێت.

له لایەکی ترەوە تێبینی دەکەین کە پێشکەوتنی سیستەمی ڕێکخستنی نێودەوڵەتی و کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان وەك ئەوە وایە کە دەسەلاتی یاسادانانی بۆ سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتی هێنابێتە ئاراوە، چ لە شێوەی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بێت یان ڕێکخراوە نێودەوڵەتی و کۆنگرەکان کە لە ژێر چاودێری یان لە چوارچێوەی ئەم ڕێکخراوە دەبەسترێن.

**٢- دەسەلاتی دادوەری**

نەبوونی دەسەلاتێکی دادوەری کاریگەریی نابێت لەسەر بوونی یاسا، چونکە گرنگی دادوەر تەنیا بۆ جێبەجێکردنی یاسایە، نەك دروستکردنی، لەڕاستیدا یاسا پێش بوونی دادوەر هەیە. لەلایەکی تر یاسای نێودەوڵەتیی دادوەری هەیە وەك ئامرازێك بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکان، لەگەڵ بەرەوپێشچوونی ئەم یاسایەدا بواری دادوەریی نێودەوڵەتیش پێشکەوتووە، کە لە ئەمڕۆدا وردەکاری و ڕێکخستنی زۆری تێدایە، دەوڵەتان ناوبژیوانی (تەحکیم)یان زانیوە، دواتر دادگای دادی هەمیشەیی لە لاهای ساڵی ١٨٩٩ دامەزراوە و دادگای دادی نێودەوڵەتی هەمیشەیی ساڵی ١٩٢٠ و دادگای دادی نێودەوڵەتی لەژێر سێبەری نەتەوە یەکگرتووەکان ساڵی ١٩٤٥ و لە کۆنگرەی ڕۆمای ساڵی ١٩٩٨ یشدا دادگای تاوانەکانی نێودەوڵەتی- المحكمة الجنائية الدولية International Criminal Court دامەزراوە[٦٤].

---

٦٤. بۆ زیاتر بڕوانە : د. حميد السعدي، مقدمة في دراسة القانون الدولي الجنائي، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٧١، ص٤٢ وما بعدها، و د. ضاري خليل محمود و باسيل يوسف، المحكمة الجنائية الدولية، بيت الحكمة، بغداد، ص٢٩ وما بعدها.

### ٣- سزادان له یاسای نێودەوڵەتیدا

وەك زانراوە ئەركی سزا گەرەنتیدانە بۆ باش جێبەجێكردنی ئەوەی كە لە ڕێسا یاساییەكاندا هەیە، واتە سزا ئەوكاتە دەست بەوەزیفەكانی دەكات كە یاسا پێشێل كرا. بۆیە نەبوونی سزا یان تەواونەبوونی یان لاوازبوونی كار ناكاتە سەر بوونی یاسا، بەڵكو كار لە ڕێكخستنی سیستەمی كۆمەڵایەتی دەكات و هیچ كاریگەرییەكی لەسەر سیفەتی یاسایی یاساكە نییە.[٦٥] لەگەڵ ئەوەشدا لە یاسای نێودەوڵەتیدا سزا هەیە، كە بە شێوەیەكی گشتیی دووجۆر سزا هەیە[٦٦]:

**یەكەم:** ئەو سزایانەی كە توندو تیژی (بەزۆر سەپاندنیان) لەگەڵدا نییە كە چەند شێوەیەكیان هەیە:

١. سزا مەعنەوییەكان:

ئەم شێوە سزایە زۆر جار شێوازەكانی وەك لۆمەكردن، نارەزایی دەربڕینی دیپلۆماسی، پرۆتستۆكردنی ڕای گشتی، سەرزەنشتكردنی...هتد لەگەڵدایە، كە كۆنگرەكان و ڕێكخراوە نێودەوڵەتییەكان ئاڕاستەی دەوڵەتە سەرپێچیكارەكەی دەكەن. نموونە: كاتێ سەرۆكی هەرێمی كوردستان — سەرۆك بارزانی — لەلایەن جۆرج بۆشەوە پێشوازی لێكرا، توركیا نارەزایی دایە باڵیۆزی ئەمریكا لە ئەنقەرەو داوای شرۆڤەی لێكرا كە بۆچی بە سیفەتی سەرۆك پێشوازی لە بارزانی كرد ؟ بۆش گوتی بەڵی سەرۆك بارزانی، سەرۆكی كوردستانە.

٢. پچڕاندنی پەیوەندیی دیپلۆماسی:

واتە بڕینی پەیوەندیی دیپلۆماسی Diplomacy نێوان دوو دەوڵەت، جۆرێكە لە گلەیی وگازندە كە دەوڵەتێكیان لەوی دیكەی دەكات. وەك بڕینی پەیوەندیی نێوان ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاو ئێران لە دوای شۆڕشی ١٩٧٩ی ئێران.

٣. سزادانی دارایی:

ئەمەش لە ئەنجامی دانانان بە بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی لەلایەن دەوڵەتێكەوە دێت كە سەرپێچییەكی كردبێت، دەبێ قەرەبووی ئەو سەرپێچییەی خۆی بكاتەوە. ئەم سزایانە بە ڕێگەی دیپلۆماسی یان لە ڕێگەی دادوەری یان لە لایەن دادگای دادی نێودەوڵەتییەوە بڕیاریان لێ

---

٦٥. د. السيد محمد السيد عمران واصحابه، المصدر السابق، ص ص ٥٨- ٦٠.

٦٦. د. عبدالحسين القطيفي، المصدر السابق، ص٣٨ وما بعدها، و د. عصام العطية، ص٢٩ وما بعدها.

دەدرێت، نموونە، کێشەی لۆکەربی لەنێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو لیبیا، لەسەر کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەی پان ئەمریکان.

٤. سزادانی یاسایی:

کە دەبێتە هەڵوەشاندنەوە یان وەستانی ئەو هەڵسوکەوتە قانونییانەی کە سروشتێکی نێودەوڵەتیان هەیە، وەك هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەیەك لەبەر نەبوونی مەرجەکانی.

٥. تەمبێکردن

ئەم سزایانە لەلایەن ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە بڕیاریان لەسەر دەدرێ بەپشتبەستن بە بەڵگەنامەی ڕێکخراوەکە، وەکو دەرکردن و دوورخستنەوەی ئەو دەوڵەتەی کە ئەرکەکانی جێبەجێ نەکردووە. نموونە، ستاندنەوەی مافی دەنگدان لە دەوڵەتێکی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە دەرئەنجامی ڕێزنەگرتن لە پرینسیپەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان.

**دووەم:** ئەو سزایانەی کە بەزۆر سەپاندن (هێز)یان تێدایە

١. کارە پۆلیسییەکان: ئەم جۆرە سزایە پێش دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتووەکان لە یاسای عورفی نێودەوڵەتیدا هەبوو.

٢. تۆڵەسەندنەوە: بریتیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو وڵاتەی کە سەرپێچی ڕێسایەکی یاسایی نێودەوڵەتی کردووە بەهەمان شێوە بە مەبەستی وەستاندنی یان بەمەبەستی قەرەبووکردنەوە، ئەمەش چەند شێوەیەکی هەیە، لەوانە:

أ- داگیرکردنی سەربازی: داگیرکردن لەکاتی ئاشتی بۆ بەشێکی ئەو وڵاتەی کە سەرپێچی ئیلتزامێکی نێودەوڵەتی کردووە.

ب- گەمارۆی ئاشتیانە: گەمارۆیەکە کە چەند دەوڵەتێك دەیخەنە سەر ئەو وڵاتەی کە دەستدرێژی کردووە، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە لە دەوڵەتەکانی تر دووری بخەنەوە و قەدەغەی بکەن.

پێویستە بزانرێ ئەو تۆڵەسەندنەوەیەی کە هێزی تێدا بەکاردێت جگە لەو حاڵەتانەی کە لە بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بە ناڕەوا لە قەڵەم دەدرێن و دروستەکەی ئەوەیە کە دەوڵەتان کێشەکانیان بە ئامرازو شێوازی ئاشتیانە چارەسەربکەن بۆ ئەوەی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی نەکەوێتە مەترسییەوە[٦٧].

---

٦٧. لە ماددەی ٢ لە بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە:

٣. سزادانی سەربازی

بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بەکارهێنانی هێزو هەڕەشە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە قەدەغە دەکات، کە دژی سەروەری و سەلامەتی خاکی دەوڵەتێکی تر بەکاربهێنرێت تەنیا لەسێ حاڵەتدا نەبێت، یەکەمیان باری بەرگریی ڕەوا (م ٥١)، دووەمیان حاڵەتی جێبەجێکردنی ڕێوشوێنی سەرکوتکردن لەلایەن ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەگوێرەی بەشی حەوتەم لە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، سێیەمیشیان بەکارهێنانی هێز لەلایەن بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکانەوە.

٤. سزا ئابوورییەکان:

واتە بەکارهێنانی فشاری ئابووری و دارایی بۆ ناچارکردنی ولاّتان کە ڕێز لە یاسای نێودەوڵەتی بگرن، کاریگەرترین جۆریش بریتیە لە گەمارۆی ئابووری کە دەکرێ لەکاتی شەڕو ئاشتیشدا بەکاربهێنرێت. ئەمەش دەوڵەتێك لەگەڵ دەوڵەتێکی تر بەکاری دەهێنێت، یان لە چوارچێوەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەکاردێت، یان لە لایەن ڕێکخراوە هەرێمیەکانەوە. وەك ئەو سزایانەی خرانە سەر عێراق لە دوای داگیرکردنی کوێت ساڵی ١٩٩٠.

٥. سزا تاوانکارییەکان:

ئەم سزایانە لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە دەرکەوتن، کاتێ دادگا، دادگای نۆرنبرگ ١٩٤٥ و تۆکیۆ ١٩٤٦ بۆ گەورە لێپرسراوانی هەڵگیرسێنەرانی جەنگی دووەمی جیهان، بۆ سەرانی ئاڵمان و یابان، دانرا. کۆششی نێودەوڵەتی لەگەڵ دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتووەکان بەردەوام بوو بۆ ئەوەی بنەمایەکی باش بۆ سیستەمی نێودەوڵەتی تاوانکاری هەمیشەیی دابنێ و ئەم دوو دادگایە بوونە بنەمای سەرەکی ئەم مەبەستە. نموونەی چەند دادگایەك:

---

- بڕگەی ٣/ هەموو ئەندامان دەبێ بە ئامرازی ئاشتیانە ناکۆکیە نێودەوڵەتیەکانیان یەکلایی بکەنەوە بەشێوەیەك کە ئاشتی و تەنایی و دادی نێودەوڵەتی ڕووبەڕوی مەترسی نەکاتەوە.

- بڕگەی ٤/ ئەندامان لە پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکانیاندا نابێ هەڕەشەی بە کارهێنانی هێز بکەن یان دژ بە سەلامەتی خاك و سەربەخۆیی سیاسی هەر دەوڵەتێك یان بە هەرشێوەیەکی تر بەکاری بێنن کە لە گەڵ ئامانجی نەتەوە یەکگرتووەکاندا ناکۆك بێت.

١. دادگای تاوانکارییە نێودەوڵەتییەکان:

دوای هەوڵێکی زۆرو بێوچانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی کە زیاتر لە پەنجا ساڵی خایاند، لیژنەی یاسای نێودەوڵـەتی پـڕۆژەی پڕۆگرامـی بنـەڕەتی بـۆ دادگـای تاوانکارییـە نێودەوڵەتییـەکان تەواوکردو پێشکەشی خولی چل و نۆیەمی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانی کـرد. لـە ١٧ تموزی ١٩٩٨ لە کۆنگرەی رۆما پڕۆگرامی بنەڕەتی ئەم دادگایە متمانـەی وەرگـرت و لـە ساڵی ٢٠٠٢ەوە کەوتۆتە واری جێبەجێکردنەوە. ئەم دادگایە لە چەند تاوانێك دەڕوانێت:

- تاوانی لەناوبردنی بەکۆمەڵ (جینۆساید).
- تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی.
- تاوانەکانی جەنگ.
- تاوانی دوژمنکاری.
- هەروەها کۆنگرە رایسپارد کە تـاوانی تـیرۆرو مـاددە سـڕکەرەکانیش لـە ئاینـدەدا پێناسە بکرێن.[٦٨]

٢. دادگای تاوانکارییە تایبەتییەکان:

لە دوای رووخانی یەکێتی سۆڤیەت و لەگەڵ دەستپێکی سیستەمی نوێی جیهانی و، لەگەڵ باشناخبوونی بـاهۆزی دیموکراتیـەت و مـافی مـرۆڤ، دوو دادگـای تایبـەت بـۆ لێپرسـینەوەو دادگاییکردنی تۆمەتباران بە ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی هاتنە ئـاراوە. تایبەتمەنـدیی ئـەم دوو دادگایە سنووردارە، لە رووی شوێن و رووداني تاوانەکەو کاتی تاوانەکـە. لەوانـە دادگـای تاوانکاریی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگسلاڤیا لە ساڵی ١٩٩٣، کە تایبەتە بە لێپرسرینەوە لە ئەنجامدەرانی تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی، لەسـەر بنـەمای کوشـتن و لـەناوبردن و کۆیلـەکردن و راگواستن و بەندکردن و ئەشکەنجەدان و دەستدرێژی سێکسی و چەوساندنەوە لەبـەر هۆیـەکانی سیاسی و نەژادی و ئایینی و کارە نامرۆڤایەتییەکانی تر.

هەروەها دادگای نێودەوڵەتیی رواندا لە ساڵی ١٩٩٤، بۆ دادگاییکردنی ئەو کەسانەی کـە بەرپرسیاربوون لە کردەوەکانی لەناوبردنی بەکۆمەڵی نەژادی و پێشێلکارییەکانی تر.[٦٩]

---

٦٨. بۆ زیاتر بڕوانە: د. محمود شريف بسيوني، المحكمة الجنائية الدولية، دار الشروق، ط١، ٢٠٠٤، ص٦ وما بعدها.

٦٩. د. حسين الشيخ طه الباليساني، القضاء الدولي الجنائي، مطبعة الثقافة، اربيل، ٢٠٠٥.

٦.   گەرەنتی — الضمان:

بریتییە لەو بەڵێنەی دەوڵەتێك لە پەیماننامەیەك دەیدا سەبارەت بە گەرەنتی جێبەجێکردنی ئیلتیزامێکی نێودەوڵەتی، یان گەرەنتی زاڵ بوون بەسەر پێشێلکردنی ئەو ئیلتیزامەدا.

لەمەشدا دەردەکەوێت کە رێساکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتیی، رێسای یاسایین و هەموو مەرجەکانی یاساییبوونیان تێدایە. هەروەها دەسەلاتێکی نێودەوڵەتیی گشتیی هەیە کە ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی دەپارێزێ و رێزگرتن لە رێساکانی مسۆگەر دەکا لەسەر ئاستی جیهان ئەویش نەتەوە یەکگرتووەکانە.[70] دەوڵەتان لە دەستوورەکانیاندا دانیان بە رێساکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتیدا ناوە سەرەڕای بڕوانامە فەرمییە دوو قۆڵی و چەند قۆڵیەکان و لەرێگەی دادگای نێودەوڵەتییشەوە.

**٣-٢: لە رووی بابەتییەوە:**

ئەو یاسایە بەوە جیادەکرێتەوە کە یاسایەکی پێشکەوتووەو کاردەکات بۆ ئەوەی لەگەڵ گۆڕانەکاندا بڕوات و پەیوەندییەکانیش تەنیا سیاسی نین بەڵکو ئابووری و رۆشنبیری و...هتد، هەروەها چوارچێوەی یاساکە چەندین بوار دەگرێتەوە وەك پێشتر باسمان کرد.

**٣-٣: لە رووی لایەنی کەسییەوە:**

تەنیا پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان رێکناخات بەڵکو کەسی تری یاسایی هەیە کە بە شێوەیەکی بەردەوام لە سەر شانۆی نێودەوڵەتیدا خۆیان نمایش دەکەن و کار لە سەر لایەنێك یان زیاتری کارە نێودەوڵەتیەکان دەکەن.

٧٠. د. علي صادق أبو هيف، القانون الدولي العام، المصدرالسابق، ص٧٧.

## ٤
## لقەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

بەگوێرەی چەند پێوەرێکی سەرەکی، دەکرێ ڕێساکانی یاسای نێودەوڵەتی گشتیی بۆ چەند لقێك دابەش بکرێن، چەند ڕێوشوێنێك بۆ ئەم دابەشکردنە هەیە، ئێمە دوو شێواز هەڵدەبژێرین، یەکەمیان دابەشکردنی یاسای نێودەوڵەتی بەگوێرەی بابەتەکانی، دووەمیان بەگوێرەی چوارچێوەی جوگرافی:

**یەکەم: دابەشکردن بەگوێرەی بابەتەکان**

بە گوێرەی بابەت، ئەم یاسایە چەند لقێکی هەمەجۆری هەیە، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

**١- یاسای نێودەوڵەتی بۆ مافەکانی مرۆڤ**

تێگەیشتنی جیهان لە پێش سەدەی بیستەم وابوو کە مامەڵەکردن لە چوارچێوەی دەوڵەتدا لەگەڵ هاوڵاتیان لە دەرەوەی چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتییە. بەڵام کۆمەڵی نێونەتەوەیی هەر لە جەنگی یەکەمی جیهانەوە زیاتر دەرکی بەوەکردووە کە دەبێ لانی کەمی گەرەنتی بۆ پاراستنی مافەکانی تاك هەبێت، لەمەوە مافەکانی مرۆڤ بوون بە جێی بایەخی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی، بەو پێیەی کە ئەم مافانە سروشتی و بنەڕەتین بە زاتی کەسایەتیی مرۆڤ و بۆ هەمووان وەك یەکن و پابەندبوون بە ڕێساکانی مافەکانی مرۆڤ ئەرکە.[٧١]

لە ڕاستیدا ئەم تێگەیشتنە بۆ مافەکانی مرۆڤ لە مێژووی هاوچەرخدا بەدیدەکرێ، چونکە چەندین یاسا لە دەوڵەتانی پێشکەوتوو بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ (بۆ هاوڵاتی خۆیان)

---

٧١. بۆ زانیاری سسەبارەت بە مێژووی مافەکانی مرۆڤ، بڕوانە: مافەکانی مرۆڤ، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی دیراسات و توێژینەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان، چاپی یەکەم، دیراسەی ژمارە ٢٣، ١٩٩٦، و د. ابراهيم احمد خليفة، الألتزام الدولي باحترام حقوق الأنسان وحرياته الأساسية، دار الجامعة الجديدة، ٢٠٠٧، ص٢١ وما بعدها

هاتنەئاراوە. دیارترینی ئـەو ڕاگەیاندنانـە کـە کاریگـەرییان لەسـەر ڕەوتـی بەیاسـاییکردنی مافەکانی مرۆڤ هەبووە، ئەمانەن.[٧٢]

**أ- ڕاگەیاندنەکانی ئینگلترا:** کە لە دەستپێکدا بەشێوەی بڕوانامە دەرچوون.

١. بڕوانامەی ماگنا کارتە

**ئەم بڕوانامە** مەزنە لە ساڵی ١٢١٥ جاری بۆ درا، کاریگەریی زۆری لەسـەر سـەربەخۆیی گەلان داناوە، کۆکراوەو تەواوکەری ڕاگەیاندنەکانی تری پێش خۆی بـوو و پرینسـیپێکی زۆری مرۆڤدۆستانەی تێدابوو.

٢. گەلاڵەنامەی مافەکان:

ئەم ڕاگەیاندنە لە ساڵی ١٦٢٨ز هاتەئاراوە، بۆ بەرجەستەکردنی مافی بەشداریی پەرلەمان و ئەنجوومـەنی (بازرگـان و زەویـدارەکان) لەسـەر ڕەزامەنـدی بڕیـاردان لەسـەر دانـانی بـاج شانبەشانی پادشا.

٣. ڕاگەیاندنی مافەکان:

یەکێکە لە گرنگترین ڕاگەیاندنەکان، بەپێی ئەم ڕاگەیاندنە مـەلیك نـاتوانێ بـەبێ پرسـی هاوڵاتیان قانون دەربکات و جێبەجێی بکات یان هەمواری بکات. واتـە سـەروەریی تەشـریعی دەستووریی ئینگلترا گەیشتە ئەو باوەڕەی کە پاشا لە هەموو بارەکاندا دەبێت پرسی هاوڵاتیان بکات و ڕایان وەربگرێت، بەپێی ئەم ڕاگەیاندنە دەسەڵاتێکی فراوان و ڕێزێکی شایستەتری بـە تاکەکەس درا.

**٤. ڕاگەیاندنی خەلافەت ١٦٤٨:**

ناوەڕۆکەکەی بریتی بـوو لـە سـنووردارکردنی دەسـەڵاتی پاشـا، سـەروەرێتیی قـانوون و حاکمییەت، گەرەنتی بۆ مافەکانی مرۆڤ، دیاریکردنی ماف و ئەرکەکان، داواکردنی ئازادی بۆ تاکەکان و جێگیرکردنی پەرلەمان لە مەبەستە سەرەکییەکانی ئەو ڕاگەیاندنە بوون.

**أ- ڕاگەیاندنەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:**

لە ١٤ی تەموزی ١٧٧٦ ویلایەتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـە بـەریتانیا ڕزگـاری بـوو سەربەخۆیی خۆی وەرگرت.گرنگترین ڕاگەیاندنەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ ئەمانەن:

---

٧٢. د. جبار صابر طه، النظرية العامة لحقوق الأنسان، منظمة نشـر الثقافـة القانونيـة، ط١، اربيـل، ٢٠٠٤، ود. محمد يوسف علوان و د. محمد خليل المرسي، القانون الدولي لحقوق الأنسان، دار الثقافة، ط١، ٢٠٠٥.

١.    راگەیاندنی سەربەخۆیی

یەکێکە لە گرنگترین ئەو راگەیەنراوانەی کە لەگەڵ سەربەخۆیی ئەمریکا جاڕیان بۆ درا، کە باس لە سەروەریی گەل و ئازادییە گشتییەکانی تاك دەکات. گرنگترینیان ئەگەر مافەکانی گەل پێشێلکران، گەل مافی یاخیبوونی هەیە.

٢.    راگەیاندنی یاسای مافەکان (شريعة الحقوق) ١٧٧٦ – ١٧٩١:

دوای ئەوەی دەستووری ئەمریکا دانراو چەند جارێ هەموار کرا، ناوەڕوکی ئەم راگەیاندنە باس لە ئازادیی تاك و ئازادیی بیروباوەڕو نەهێشتن و قەدەغەکردنی کۆیلایەتی و دیاریکردنی شێوازی رێکخستنی هێزی سەربازی و مەرجەکانی هەلگرتنی چەك و جۆرەکانی دەکات. ئەمانە گرنگترین ئەو راگەیاندنانەن کە لە دەستووری ئەمەریکادا باس لە ئازادی و ماف و ئەرکەکانی مرۆڤ دەکەن.

**ب-    جاڕنامەی فەرەنسا**

لە ٢٦ی ئابی ١٧٨٩ دا جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاولاتی فەرەنسی راگەیەنرا، ئەو جاڕنامەیەی پێشوو بە پێشکەوتووتر دادەنرێت و کاریگەریی زۆری هەبووە لەسەر مرۆڤایەتی و لەسەر هەست و سۆزی گەلان. لەژێر کاریگەریی دوو هۆکاردا ئەم جاڕنامەیە راگەیەنرا:

١.    کاریگەریی ڕۆشنفیکرەکان: فەیلەسووف و هزرمەندانی ئەورووپی و فەڕەنسی کە لە سەدەی ١٧و ١٨ هاتبوونە مەیدان وەکو لۆك و ڕۆسۆ و مۆنتسکیۆو ڤولتێر و..هتد هەوێنی هەلگیرسانی شۆڕەشی فەڕەنسی بوون.

٢.    گەشەسەندنی چینی ناوەراست لە ڕووی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابوورییەوە کە ئەمانەش بوونە هۆی هەلگیرسانی شۆڕەش و راگەیاندنی ئەم جاڕنامە مێژووییە.[٧٣]

لە کۆنگرەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە ١٩٤٢/١٢/١ دا جەخت لەسەر بابەتی مافەکانی مرۆڤ کرایەوەو لە ساڵی ١٩٤١دا سەرۆکی ئەمریکا روزفلت لە نامەیەکیدا بۆ کۆنگرێس باسی ئەوە دەکات کە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا مەسەلەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ، جێی بایەخی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبن.

لە ساڵی ١٩٤٥ەوە، مەسەلەکانی مافی مرۆڤ لە چوارچێوەی دەسەلاتەکانی ناوخۆی دەوڵەتاندا قەتیس نەماون، بەڵکو بوونەتە جێی بایەخی کۆمەڵی نێودەوڵەتی و دامەزراوە

٧٣. بڕوانە: د. حسان محمد شفيق العاني، نظرية الحريات العامة تحليل ووثائق، جامعة بغداد، ٢٠٠٤، ص ١٦

یاساییەکان. بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاشتی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەناوخۆی هەر دەوڵەتێك و لە ئاستی جیهانیشدا بە بیرۆکەی ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و مافی گەلان بە ستۆتەوە. ئەم کۆنسێپتە لەم بڕوانامانەدا هاتووەو بەئیلتیزامێکی نێودەوڵەتی داناوە لەسەر شانی دەوڵەتانو لە کاتی پێشێلکردنیان بە ماف و ئەرك و بەرپرسیارییێتی کۆمەڵی نێودەوڵەتی دادەنیٚ کە دەستێوەردان بکات بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ.[٧٤]

هەروەکو لە ماددەی (١)ی بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە: پێویستە نەتەوە یەکگرتووەکان کار بۆ ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنچینەییەکانی سەرجەم خەڵك بەبیٚ جیاوازی ڕەگەزو زمان و ئایین و بەبیٚ جیاوازیکردن لەنێوان پیاوو ئافرەتدا بکات، لەم پێناوەشدا بۆ بەرجەستەکردنی ڕێزگرتنێکی ئیجابی لە مافەکانی مرۆڤ، ئەنجوومەنی ئابووریی و کۆمەڵایەتی لە ساڵی١٩٤٦ەوە لە ڕێگەی لیژنەی مافەکانی مرۆڤەوە، کۆششی کردووە بۆ ئەوەی بگاتە ڕێکەوتننامەی جۆراوجۆر کە لایەنەکانی مافەکانی مرۆڤ بگرنەوە. کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٠ی کانونی یەکەمی١٩٤٨ دا جاڕی جیهانیی مافەکانی مرۆڤی ڕاگەیاند بەبیٚ دژوەستانی ئەندامان و بەبیٚ دەنگدانی هەشت دەوڵەتی (کامپی سۆڤیەت و یۆگسلافیاو عەرەبستانی سعودی و خوارووی ئەفریقیا)، هەنگاوی دووەم داڕشتنی پەیماننامەکانی ساڵی ١٩٦٦ بوو بە ناوی هەردوو پەیمانی نێودەوڵەتی بۆ مافە مەدەنی و سیاسییەکان، مافە ڕۆشنبیری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان و پروتۆکۆڵی ئارەزوومەندانەی مافە مەدەنی و سیاسییەکان، کە ئەمانە بەسەریەکەوە یاسای نێودەوڵەتیی مافەکانی مرۆڤ پێکدێنن.[٧٥]

ئەمڕۆ سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتیی مافەکانی مرۆڤ بە شێوەیەك فراوان بوون و ڕێکخراون، کە ئەم یاسایە، ڕێسا ئیلزامییەکانی خۆی لیٚ وەردەگرێت و دابەش دەبن بۆ سەرچاوەی ڕەسمی (سەرەکی)و ناڕەسمی. سەرچاوە ڕەسمییەکان بریتین لە سەرچاوەی نێودەوڵەتی، سەرچاوەی هەرێمی و سەرچاوەی ئایینی. سەرچاوەی نێودەوڵەتی، پێکدێت لە سەرچاوەی

---

٧٤. بڕوانە: بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ماددەکانی:

(١، ٤، ٦، ١٠، ١١، ١٣، ١٤، ٢٤، ٢٥، ٣٤، ٣٩، ٥٥، ٥٦، ٦٠، ٦٢، ٦٨، ٧٢، ٧٦).

٧٥. د. عبدالكريم علوان خضير، الوسيط في القانون الدولي العام، الكتاب الثالث، حقوق الانسان، مكتبة الثقافة والنشر والتوزيع، ط١، ١٩٩٧.

جیهانی کە پێکدێت لە بڕوانامەی گشتیی (کە هەموو یان زۆربەی مافەکانی مرۆڤ دەگرێتەوەو لەجیاتی شەریعەی گشتیی مافەکانی مرۆڤە International Bill of Human Rights) کە بریتییە لە بڕوانامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و هەردوو پەیمانی نێودەوڵەتیی ساڵی ١٩٦٦ کە لەمەو پێش ئاماژەیان بۆ کرا)، بڕوانامەی تایبەت (کە تایبەتە بە مرۆگەلێکی دیاریکراو وەك ژن، منداڵ، بەساڵاچوو، کەمئەندام، پەنابەر،...هتد، یان تایبەتە بە مافێکی دیاریکراو وەك ڕێککەوتننامەکانی نەهێشتنی کۆیلە و ئەشکەنجەدان و...هتد، یان ئەو مافانەی کە لە حاڵەتێکی دیاریکراودا هەن وەك ڕێککەوتننەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ لە کاتی ناکۆکی و ململانێ چەکدارییەکاندا، چ نێودەوڵەتی بن یان ناوخۆیی). سەرچاوەی هەرێمی وەك ڕێککەوتننامەی مافەکانی مرۆڤ لە ڕێکخراوە هەرێمییەکان وەك بڕوانامەی دەوڵەتانی ئەنجوومەنی ئەورووپا.

سەرچاوەی ڕەسمیی دووەم، سەرچاوە نیشتمانییەکانن کە بریتین لە دەستوور و ئەو یاسا دانراوە نیشتمانییانەی کە دەقی جۆراوجۆری تایبەت بە پاراستنی مافەکانی مرۆڤیان تێدایە.

سەرچاوەی سێیەم، سەرچاوەی ئایینییە. هەر ئایینێك بەپێی خۆی ڕۆڵی هەبووە لە بەرەوپێشبردنی ڕەوتی مافەکانی مرۆڤ. هەر سێ سەرچاوەی سەرەوە تەواوکەری یەکترن.[٧٦]

لەژێر ڕۆشنایی ئەم شیکردنەوەیەدا، دەڵێین مافەکانی مرۆڤ هاوبەشییەکە لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتی و هەرێمییەکان و تاکەکاندا و پێشێلکردنیان ڕەوایی دەداتە دەستتێوەردانی مرۆیی،[٧٧] هەروەك یەکێکە لە ئامانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان. مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ مەرجە بۆ وەرگرتنی دەوڵەت و بەردەوامی ئەندامێتی دەوڵەت لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕێساکانی مافەکانی مرۆڤ لە مێژووی شارستانێتی مرۆڤایەتی بەهای یاسایی و فەلسەفییان هەیە، لە مێژووی هاوچەرخیشدا ئەم بایەخە تۆکمەتر بووە.[٧٨]

---

٧٦. د. الشافعي محمد بشیر، قانون حقوق الأنسان، منشأة العارف بالأسكندرية، ٢٠٠٤، ط٣، ص٤٣ وما بعدها.

٧٧. بڕوانە د. مهدي جابر مهدي، السيادة والتدخل الأنساني، منظمة نشر الثقافة القانونية، سلسلة (١٣)، ط١، هەولێر، ٢٠٠٤، ص١٥.

٧٨. بۆ زیاتر لە رووی فەلسەفی و سیاسی و بە های یاساییەوە، بڕوانە: د. كمال سعدي، حقوق الأنسان في المذاهب الفكرية، مجلة تەرازوو، مجلة اكاديمية، تصدرها نقابة حقوقي كوردستان، العدد ٢٥، عثمان علی حسن

### ٢- یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی – القانون الأنساني الدولي.

شەڕ پانتاییەکی فراوانی لە ژیانی مرۆڤایـەتی داگیرکـردووە، لـەم ناوەشـدا لـە هـەموو شارستانێتییەکاندا بەشێوەیەك لە شێوەکان ڕێسای عورفی و نووسراو هـەبووە کـە سـنوور بـۆ ڕەفتاری جەنگاوەران دادەنێن سەبارەت بە زیـان گەیانـدن بـە دوژمـن و نـەیاران. لـە نیـوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا هەندێ ڕێسای عـورفی هاتنـە ئـاراوەو جێیـانگرت و لـەناو کتێبـی یاساناسان و ڕاگەیاندنی سـەرکردە سـەربازییەکان باسـیانکراوە. لـە نیـوەی دووەمـی هـەمان سەدەدا، بۆ ئەوەی ڕێککەوتنی نێودەوڵەتی لەم بارەیەوە بکرێت و یاسایەك بۆ جەنگ دابنرێت، **هنری دوونان،** مرۆڤدۆستی ناسراوی سویسری بە هۆی ئەو دیمەنە تراژیدیانەی کـە لـە جـەنگی سۆلڤرینۆ بینیبوی، لە ساڵی ١٨٦٣ دا کتێبێکی بە ناوی یادەوەری سولڤرینۆ دانا، دواتـر لـە ساڵی ١٨٦٤ دا شازدە دەوڵەتی ئەوروپی لە ژنیڤ کۆبوونەوە، یەکـەم ڕێککەوتننامـەیان لـەم بوارەدا بۆ چارەسەری بریندارو نەخۆش لە جەنگدا هێنایەئارا کە بـە ڕێککەوتننامـەی ژنـێڤ ناسراوە، لەم ڕێککەوتننامەیە تا سـەرجەم ڕێککەوتننامـەکانی ژنیڤـی ١٩٤٩و تـا هـەردوو پڕوتۆکـۆلی ١٩٧٧، ئـەم یاسـایە سـەرەتا بـە یاسـای جـەنگ، دواتـر بـە یاسـای ناکۆکییـە چەکدارییەکان و ئێستاش بە ناوی یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی یان یاسای مرۆڤایـەتی ناسـراوە، کە یاسایەکی سەربەخۆیەو لە لایەن خاچی سووری نێودەوڵەتی و مـانگی سـووری نێودەوڵـەتی لەژێر چەتری لیژنەی نێودەوڵەتی بۆ چاودێری یاسای مرۆڤایەتی بەرێوە دەچێ.[٧٩]

کەواتە ئەم یاسایە کە لە کاتی جەنگدا پیادەدەکرێ، دوو بابەتی سەرەکی لە خـۆدەگرێ، یەکەمیان بۆ ڕێکخستنی شێوازو ئامرازەکانی جەنگە، دووەمیان بۆ پاراستنی قوربانییەکانی ململانێ سەربازییەکان، مرۆڤ و ئەو شوێنانەیە کە ئەم یاسایە دەیانگرێتەوە. ئەم یاسـایە وا پێناسە دەکرێت: کۆمەڵە ڕێسایەکی یاساییە بـەگوێرەی پەیماننامـە و عـورفی تایبـەت بـە چارەسەری ئەو گرفتانەی کە لە میانەی جەنگی نێودەوڵـەتی یـان نـا نێودەوڵـەتی هاتۆتـە

---

وەیسی، البعد القانونی لحقوق الأنسان، بحث منشور في مجلة تەرازوو، مجلـة قانونيـة وسياسـية أكاديميـة فصـلية، يصدرها اتحاد حقوقی کوردستان باللغتين الكوردية والعربية، العدد ٢٩ - ٣٠، ٢٠٠٦، ص٢٩١.

٧٩. د. عمر محمود المخزومي، القانون الدولی الانسانی فـی ضـوء المحكمـة الجنائيـة الدوليـة، الثقافـة للنشـر و لتوزيع، عمان ط، ٢٠٠٨، ص٣٦ ومابعدها، و د. احمد ابو الوفا، النظرية العامـة للقـانون الـدولي الأنسـاني، دار النهضة العربية، ط١، القاهرة، ٢٠٠٦.

ئاراوه، كه لەبەر مەبەستی مرۆڤایەتی سنوور بۆ بەكارهێنانی شێوازو ئامرازی جەنگ دادەنێ، پارێزگاری لەو كەس وكەل پەل و سامان و شوێنانە دەكات كە بەهۆی ئەم ناكۆكییەوه تووش دەبن.[٨٠]

### ٣- یاسای سزاكاریی نێودەوڵەتی

مرۆڤایەتی كۆششی كردووه بۆ ئەوەی پێشێلكارانی مافەكانی مرۆڤ، ئەوانەی كە تاوانی نێودەوڵەتی دەكەن، كۆمەڵی نێودەوڵەتی لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بكات و لە رێگەی رێسای نێودەوڵەتیی دادوەرانەوه بەسزای دادپەروەرانەیان بگەینێت. كۆمەڵێ هۆكاری مێژوویی و بابەتی هەبوون كە كۆمەڵی نێودەوڵەتییان هاندا بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتیی سزایی لە ئاستی نێودەوڵەتی بەیاسایی بكات بۆ ئەو كردەوه تاوانكارییانەی كە لە دەرەوەی سنووری دەوڵەت ئەنجام دەدرێن، وەك جەردەی دەریایی دژ بە كەشتی و ماڵ وكەسەكان، بڵاوبوونەوەی بازرگانی كۆیلەی نێودەوڵەتی و ئەو شوێنەواره فراوانە نا مرۆڤانەی كە لە جەنگەكاندا دێنە ئاراوه، وەك تاوانی دژ بە ئاشتی و تاوانی جەنگ و تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی و تاوانی جینۆساید و تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی و... هتد.[٨١]

پرسی بەنێودەوڵەتیكردنی بەرپرسیارێتیی سزایی تاكەكەس Individual Criminal Responsibility لە ئاستی یاساناسیی نێودەوڵەتی بەگشتی و لە ئاستی یاسای سزایی بەتایبەتی، پرسێكی نوێیە. چوار بۆچوونی سەرەكی سەبارەت بەناونانی ئەم یاسایە لەگۆڕێدان[٨٢]:

١. یاسای سزایی نێودەوڵەتی، جەخت لەسەر سیفەتی سزایی یاسا دەكاتەوەو سیفەتی نێودەوڵەتی بۆ زیاددەكات.

٢. یاسای نێودەوڵەتیی سزایی بایەخی زیاتر بە سیفەتی نێودەوڵەتی دەدات تا سیفەتی سزایی.

---

٨٠. عوسمان عەلی حەسەن، جیاوازیەكانی نێوان یاسای مرۆڤایەتی نێودەوڵەتی و یاسای نێودەوڵەتی بۆ مافەكانی مرۆڤ، گۆڤاری تەرازوو، گۆڤارێكی ئەكادیمی وەرزییە، بە هەردوو زمانی كوردی و عەرەبی، سەندیكای مافناسانی كوردستان، ٢٠٠٨، ژمارە -٣٣- ٣٢، ل٧ و دواتر.

٨١. بڕوانە: د. حميد السعدي، المصدر السابق، ص١٢، وما بعدها.

٨٢. د. ضاری خلیل محمود وباسیل یوسف، المحكمة الجنائیة الدولیة، بیت الحكمة، بغداد، ط ١، ٢٠٠٣، ص٧.

٣. یاسای سزایی سەرو نیشتمانی سیفەتێکی بان- نیشتمانی بە سزا دەبەخشێ و لە یاساکانی نیشتمانی بالاّترە.

٤. یاسای سزایی نێودەوڵەتیی گشتی، ئاماژە بۆ جیاوازی نێوان یاسای گشتیی نێودەوڵەتی و تایبەتی دەکات و لەسەر یاسای سزایی سیمای یاسای گشتیی نێودەوڵەتی دادەنێ.

دەتوانین بڵێین سەرجەم رێسا یاساییەکانی سزای نێودەوڵەتی پێگەیەکی ناوەندیان هەیە لەنێوان یاسای گشتیی نێودەوڵەتی کە پەیوەندیی نێوان کەسەکانی ئەم یاسایە رێکدەخات و یاسای سزایی نیشتمانی، کە یاسای سزایی نێودەوڵەتی بۆ پاراستنی سیستەمی گشتیی نێودەوڵەتی کۆششی بۆ دەکات کە سزادان شکلێکی دوەلی هەبێت، یاسای سزایی نیشتمانی کە دەیەوێ پارێزگاری لە سیستەمی گشتیی نیشتمانی بکات کە سزادان شکلێکی ناوخۆیی هەبێت.[٨٣] بۆ سزادانی تاوانبارانی تاوانە نێودەوڵەتییەکان چەندین دادگا دامەزراون:

١. دادگای هەمیشەیی ناوبژیوانی (محكمة التحكيم الدائمة) لە کۆنگرەی لاهای لە ساڵی ١٨٩٩دامەزراوە، لە کۆنگرەی لاهای دووەم گۆڕانی بە سەردا هات.

٢. دادگای هەمیشەیی دادی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٢٠دا دامەزراوە.

٣. دادگای هەمیشەیی داد لە ساڵی ١٩٤٦دا لە لاهای دامەزراوەو یەکێکە لە دەزگا سەرەکییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان.

٤. دادگای تاوانکاریی نێودەوڵەتی: لە میانەی کۆنگرەی رۆما لە ١٧ی تموزی ١٩٩٨ دامەزراوە، کە ١٢٠ دەوڵەت دەنگیان بۆ داو لە ٢٠٠٢ەوە کەوتۆتە بواری جێبەجێکردن و لە تاوانەکانی وەك: جینوساید، تاوانی دژبە مرۆڤایەتی، تاوانی جەنگ، تاوانی دوژمنکاری دەروانێ، کۆنگرەی ناوبراو راسپاردووە کە پێناسەی تاوانەکانی تیرۆرو مادده هۆشبەرەکانیش بکرێ هەروەك لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردوون.

### ٤- یاسای نێودەوڵەتیی پەنابەران

ماددەی (١) لە رێکەوتنی تایبەت بە پەنابەرانی ساڵی١٩٥١، پێناسەی پەنابەران بەم شێوەیە دەکات: ئەو کەسە دەگرێتەوە کە لەسەر بنچینەیەکی بەهێزی چەوساندنەوە، لە بەر هۆی رەگەزی، ئایینی، نەتەوەیی، ئەندامێتی لە گروپێکی کۆمەلاّیەتیی تایبەت، یان لەبەر بۆچوونی سیاسی، لە دەرەوەی ئەو ولاّتە بێت کە پێشتر هاولاّتی ئەو بووە و بە هۆی ئەو

---

٨٣. د. عبدالوهاب حومد، الأجرام الدولي، جامعة الكويت، ١٩٨٧، ص١٠.

ترسەشەوە ناتوانێ یان حەزناکات بگەڕێتەوە ئەو وڵاتەو لەژێر پارێزگاری ئـەودا بمێنێتــەوە. یان ئەوکەسەیە کە ڕەگەزنامەی نییەو لە دەرەوەی ئەو وڵاتەیە کە پێشتر تیایـدا نیشــتەجێ بووە لە دەرئەنجامی ئەو ڕووداوانەوە نایەوێت یان ناتوانێت بە هۆی ئەو ترسەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەو وڵاتە.

ڕێککەوتننامەی ڕێکخراوی یەکێتیی ئەفریقی و بانگـەوازی قرتاجینـە سـاڵی ١٩٨٤ئــەم پێناسەیان فراوانکردووە تا هەموو ئەوکەسانە بگرێتەوە کە لە دەرئەنجامی ئەو ڕووداوانــەی بــە شێوەیەکی ترسناك ئاسایشی گشتیی تێکدەدەن وەك ناکۆکی چەکداری و ئـاڵۆزی و پەشـێوی، وڵاتەکانیان بەجێ دەهێڵن.[٨٤]

یاسای نێونەتەوەیی پەنابەران لەسەر ئەم دەقانەی خوارەوە بنیاتنراوە:

١. ڕێککەتننامەی ساڵی ١٩٥١ نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی باری پەنابەری.

٢. پرۆتۆکۆڵی ١٩٦٧ی پەیوەندیدار بە پەنابەری.

٣. ڕێککەوتننامەی ڕێکخراوی یەکێتیی ئەفریقی بۆ ڕێکخستنی لایەنەکانی پەیوەندیدار بە گرفتی پەنابەران لە ئەفریقادا.

٤. بانگەوازی١٩٨٤ قرتاجینەی سەبارەت بە پەنابەران.

٥. چەند بڕیارێکی پەسەندکراوی ئەنجوومەنی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان.

پەنابــەران مــافی پاراســتنیان بــەپێی یاســای پەنابــەران بــۆ دابینکــراوە، هــەروەها خزمەتگوزارییەکانی ئۆفیســی کۆمســیۆنی بــاڵای پەنابــەرانی ســەربە نەتــەوە یــەکگرتووکان UNHCRدەیانگرێتەوە.

## ٥- یاسای پەیوەندییە دیپلۆماسییەکان

دیپلۆماسی Diploma tie زاراوەیەکی یۆنانییەو بۆ ناو زمــانی لاتینــی گواســتراوەتەوە، ئینجا زمانە ئەوروپییەکان. لە زمانی عەرەبیدا بە ناوی نێردراو یان پەیامنێر هاتووە. ئەگەرچی مێژووی پەیوەندییەکان کۆنە، بەڵام یاساناسـانی یاسـای گشـتیی نێودەوڵـەتی پێیانوایــە کــە زاراوەی دیپلۆماسی و ماناکانی ئەم چەمکە بەرئەنجامی پەیوەندییــەکانی ئــەوروپان. ئەمــەش لەمیانەی ئەو جەنگە خوێناوییانەی کە لەنێوان دەوڵەتە ئەوروپییەکان هاتنە ئـاراوە بـۆ ئـەوەی

---

٨٤. بڕوانە: د. فيصل شطناوي، حقوق الأنسان والقانون الدولي الأنساني، دار ومكتبة الحامد للنشر والتوزيـع، ط٢، ٢٠٠١، ص٢٣٥ وما بعدها.

کۆتاییان پێ بهێنن و لەسەر پەیوەندیی دیپلۆماسی ڕێکبکەون و کێشەکان بە ئامرازەکانی دیپلۆماسی چارەسەر بکەن. لەمیانەی ئەم پەیوەندیانەدا ڕێسای یاسایی عورفی لەنێوان دەوڵەتاندا هاتەئاراوە، کە نەتەوە یەکگرتووەکانیش هاتەئاراوە، مەسەلەی نووسینەوەی عورفی نێودەوڵەتی لە ڕێککەوتننامەیەکدا بە لیژنەی شەشەم سپێردرا، ئەم لیژنەیەش کۆششێکی زۆری کرد کە ڕێسا عورفییە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە دیپلۆماسی لە سێ ڕێککەوتننامەی گرنگدا جێبەجێ بکات کە ئەوانیش:

١. ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٦١ی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە دیپلۆماسیەکان.
٢. ڕێککەوتننامەی ساڵی١٩٦٣ی ڤیەننا بۆ پەیوەندییە قونسوڵییەکان.
٣. ڕێککەوتننامەی ساڵی١٩٦٩ی تایبەت بە نێرراوە تایبەتییەکان.[٨٥]

لەگەڵ ئەوەی کە زانایان بۆچوونی جیاجیایان سەبارەت بە پێناسەی دیپلۆماسی هەیە، دەکرێ پێناسەی دیپلۆماسی وا بکرێ: زانست و هونەری نوێنەرایەتیکردنی هەڵوێستی کەسە یاساییە نێودەوڵەتییەکانە لە پەیوەندییەکانی دەرەوەیاندا لە ڕێگەی دەزگایەکەوە کە پێی دەگوترێ نوێنەرایەتیی بەردەوام، چ هەمیشەیی بێت یان کاتی.[٨٦] دیپلۆماسی، ئامرازی سەرەکیی دەوڵەتانە بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەوە، بۆیە نابێ چەمکی دیپلۆماسی و چەمکی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەت تێکەڵ بەیەك بکەین. وەزیفەی سەرەکیی دیپلۆماسی بەڕێوەبردنی دیالۆگ و دانوستانی دیپلۆماتییە لەنێوان دەوڵەتاندا بە ئامانجی دەستەبەرکردنی ئامانجە هاوبەشەکان. بەم شێوەیە دیپلۆماسی دوو ئامانجی سەرەکی هەیە، یەکەمیان: نوێنەرایەتیی بەرژیوەندییەکانی دەوڵەتان و پاراستنیان، دووەمیان: بەڕێوەبردنی پەیوەندییە ئاساییەکانی نێوان کەسەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی.[٨٧]

### ٦- یاساکانی بەڕێوەبردنی پەیوەندییە ئابوورییەکان

یەکێك لە دەستە گرنگەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتییە کە بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان هاتۆتەئاراوە کە لە

---

٨٥. د. سهيل حسين الفتلاوى، الدبلوماسية بين النظرية والتطبيق، دار الثقافة عمان، ط ١، ٢٠٠٥، ص٧٧ وما بعدها.

٨٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

٨٧. د. ابراهيم احمد خليفة، القانون الدولي الدبلوماسي والقنصلي، دار الجامعة الجديدة، ٢٠٠٧، ص ص ٦-٧.

مــاده (١ برگــەی ٣ دا) ئامــاژەی پێکــراوه و لــه مــاددەی ٥٥دا درێــژەی پێــداوه، مەبەستەکانیشی لەم خاڵانەدا چڕدەبنەوە[٨٨]:

١. فەراهەمکردنی ئاستێکی ژیان و دەستەبەرکردنی هۆیەکانی بەکارهێنان بـۆ هــەموو تاکێك و بەرەوپێشبردنی هۆیەکانی پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

٢. دۆزینەوەی ڕێگەچارە بـۆ هــەموو کێشــە نێودەوڵەتییــە ئــابووری و کۆمەڵایــەتی و تەندروستییەکان و ئەوانەی کە پەیوەنــدییان پێیانــەوە هەیــە، لەگــەڵ پەرەپێــدانی هاوکــاریی نێودەوڵەتی لە کاروباری ڕۆشنبیری و زانستی.

٣. کارکردن لەپێناو ڕێزدانان بۆ مافی مرۆڤ و ئازادییــەکان لــە تــەواوی جیهانــدا بــەبێ جیاوازیــدانان بــەهۆی ڕەگــەزو زمــان و ئــایین ونــەژاد و پیــاوو ئــافرەت و ...هتــد، لــەپێناو چاودێریکردنی ئەو ماف و ئازادییانە.

ئەوەی لەم نــاوەدا گــرنگ بێــت، بایەخپێــدانی نەتــەوە یەکگرتووەکانــە بــە مەســەلەکانی ئابووری. کە چەندین وەزیفەی جۆربــەجۆریان هەیــە. لەلایــەکی تــرەوە دوای بەرەوپێشچــوونی ڕێساکانی یاسای گشــتیی نێودەوڵــەتی هاتۆتــەئاراوە، گرنگترینیــان ئەوەیــە کــە لــە ئاســتی پەیوەندییە ئابوورییەکاندا هاتۆتەدی. ئەمەش لەوەدا بەرجەستە بووە کە پەیوەنــدیی هاوکــاری ئابووری و ئاڵوگۆڕی بازرگانی تەنیا لە ئاستی دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا نەماوەتــەوە، بــەڵکو پەیوەندیی ئابووری نێوان دەوڵەتانی پێشکەوتوو دەوڵەتانی تازەگەشەسەندووش هاتۆتەئاراوە.

هەربۆیــە یاســای ئــابووریی نێودەوڵــەتی لقێکــی گرنگــی یاســای نێودەوڵــەتیی گشــتیی هاوچەرخە، بەتایبەت دوای ئەوەی کە مەسەلەکانی (بازرگــانی و دراوی و دارایــی) بــەرگێکی نێودەوڵەتییان بەخۆوەگرتووە. دەوڵەت دەتوانێ دەســت بخاتــە نــاو کاروبــاری ژیــانی ئــابووریی نێودەوڵەتی، جا چ بە هاندان و ئاڕاستەکردن بێت یان بە ســنووردانان بــێ، لــە ڕێگــەی کــاری یاسایی یان کاروباری تری تاکلایەن یان دوولایەن یان چەند لایەنەوە بێت. یاسای نێودەوڵــەتیی ئابووری چەند کاروبارێك دەگرێتەوە لەوانە[٨٩]:

---

٨٨. بڕوانە بڕگەی ١و ٥٥ی بڕوانامەی نەتەوە یەکگرتووەکان.

٨٩. بۆ زیــاتر تێگەیشــتن و ڕوونکردنــەوی ووردی ڕێســاو پرنســیپە نێودەوڵەتیــەکان ســەبارەت بــە خولــەکانی گفتووگۆو ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتی و هەرێمیەکانی تایبەت بە بازرگانی نێودەوڵەتی بڕوانــە: د. حسـین توفیـق فیض الله، اتفاقيات ال (WTO/GATT) وعولمة الملكية الفكرية، مطبعة جامعة صلاح الدين/ اربيل ١٩٩٩،

- بەرهەمەکانی کەرەستەو خزمەتگوزاری ڕێکدەخات لەوانە هەناردن و هاوردن، لەمیانەی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان، ڕێکخستنی کاروباری بەرهەمهێنانی بێگانە.
- گرنگیدان بە ئالوگۆڕە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکان، بەلایەنە جۆراوجۆرەکانی (بازرگانی، دارایی، دراوی).
- لەچوارچێوەی ئەم یاسایەدا کار بۆ سیستەمێکی ئابووریی نێودەوڵەتی نوێ دەکرێت، کە عەدالەتی زیاتری تێدا بێت لە دابەشکردنی کەرەستەو خزمەتگوزاری و پارەو لایەنە باشەکانی ئابووری.
- گرنگیدان بە لایەنی ڕێکخستنی پەیوەندییە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکان کە لە بنەڕەتدا بایەخ بە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە ئابوورییەکان لەسەر ئاستی جیهانی و هەرێمی دەدەن، گرنگترین سیماکانی پەیوەندییە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکان بریتین لە ((بازرگانیی نێودەوڵەتی، سەرچاوەکانی وزە، گواستنەوەی تەکنەلۆجیا، پەرەپێدانی ئابووریی نێودەوڵەتی، هاوکاری دەرەکی، هاریکاری ئابووریی نێوان دەوڵەتانی خواروو، گفتوگۆ لەنێوان سەرووی (دەوڵەمەند) و خوارووی (هەژار)، گرفتی قەرزە دەرەکییەکان، بنیاتنانی سیستەمێکی ئابووریی جیهانیی نوێ...هتد)).

لە پەراوێزی ئەمەدا بۆ پێناسەی یاسای نێودەوڵەتیی ئابووری دەڵێین: کۆمەڵە ڕێسایەکی یاساییە کە لەسەر پەیوەندییە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکانی نێوان کەسانی یاسای نێودەوڵەتی جێبەجێ دەبێت. کە لەسەر سێ پرینسیپی سەرەکی وەستاوە، ئەوانیش کە ئازادیی بازرگانیی نێودەوڵەتی، یەکسانی لە سەروەریتی، هاریکاری نێودەوڵەتیی-ن.[٩٠]

### ٧- یاسای ژینگە

لە سەدەی رابردوودا مەسەلەکانی تایبەت بە ژینگە لە سەرجەم بوارەکانی چالاکی مرۆڤدا، لە ئاستەکانی نێودەوڵەتی و هەرێمی و نیشتمانیدا هاتنەئاراوە، بەتایبەت دوای ئەوەی کە مەسەلەکانی تایبەت بە ژینگە – تێکچوون و مەترسییان بۆسەر ژیانی نەوەکانی ئێستا و

---

ولنفس المؤلف: قانون التجارة الدولية، محاضرات القيت على طلبة الدراسات العليا/ ماجستير، في كلية القانون – امعة صلاح الدين للسنة الدراسية ٢٠٠٤- ٢٠٠٥.

٩٠. بۆ زیاتر بڕوانە: د. عبدالواحد محمد الفار، طبيعة القاعدة الدولية الأقتصادية، في ظل النظام الدولي القائم، دار النهضة العربية، ١٩٨٥، ص٥ وما بعدها.

ئاینــده هەیــە، لەوانــە ســامانی سروشــتی، جـۆری زینــدەوەرەکان، دیــاردەی بەوشــکانیبوون (بەبیابانبوون)، لافاو و ئەو گۆڕانانەی بەسەر کەشوهەوادا هاتوون، ئەمەش بـەهۆی مامەڵـەی خراپی مرۆڤ لەگەڵ دارستان و فراوانبوونی بەبیابانیبوون و زیادبوونی دووەم ئوکسیدی کاربۆن و داخورانی چینی ئۆزۆن و سەرجەم بوارەکانی تری تێکچوونی ژینگە، مەترسییان دروستکردووە.

لەلایەکی ترەوە، مافێکی ئاسایی مرۆڤە کە لە ژینگەیەکی پـاك و بێگـەردا بـژی، مـافی دەوڵەت، کۆمپانیا، گروپ و تاکەکان نییە کاریگەرییەکی خراپ بکەنە سەر ژینگەو بە دوکەڵ و هەڵم و تەپ و تۆزو پاشەڕۆك و پاشماوەکانی تر ژینگە پیس بکـەن و زیـان بـە تەندروسـتیی مرۆڤ بگەیەنن. هەر زیانێکی لەم چەشنە دەبێتە دەستێوەردان لە هاوسەنگیی سروشت و زیـان بە هاوسەنگیی بارودۆخێکی ئاسایی ژیان دەگەیەنێ کە مافی خۆشگوزەرانی مرۆڤ دەیخوازێ.

لە ڕوانگەی هەستکردن بەم مەترسـییانەو وەك ئـەوەی کـە مافـەکانی مـرۆڤ دەیخوازێـت، نەتــەوە یــەکگرتووەکان لــە ١٦ی حــوزەیرانی ١٩٧٢دا داوای بەســتنی کۆنگرەیــەکی کــردو، سەرەنجام چاڕنامەی کۆنگرەی تایبەت بە ژینگەی مرۆڤایەتی ڕاگەیەنـدرا[٩١]، بـەو مەبەسـتەی ڕێنمایی و ڕاسـپاردە بـدات و بـۆ پاراسـتنی سروشـتی ژینگـەی مرۆڤایـەتی و گەشـەپێدانی ئاموژگاری پێشکەشی گەلانی جیهان بکات و داوادەکات بۆ ئەوەی مافی ژیانی ئاسایی مـرۆڤ بەرجەستە بێت و خۆشگوزەرانی بۆ بێتــەدی، پێویسـتە پارێزگـاری لـە ژینگـە بکرێـت. لـەم پێناوەشدا چەندین ڕێککەوتننامە هاتوونەتەدی لەوانە:

- ڕێککەوتننامەی بەرنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بـۆ پاراسـتنی ژینگـەUNEP، لـە بەرنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان (FAO)، کە ڕێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی خۆراك و کشتوکاڵە.
- ڕێککەوتننامەی ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی (ILO).
- ڕێککەوتننامەی ڕێکخراوی دەریاوانیی نێودەوڵەتی (IMO).
- ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتیی بەرنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان (UN).
- ڕێککەوتننامە هەرێمایەتییەکان.
- لیژنەی نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ کاروباری ئابووری لە ئەورووپا (لیژنەی UNECE).
- لیژنەی OSPAR. بۆ پارێزگاری ژینگەی سەرووی دەریای ئەتڵەنتی.

---

٩١. سنگر داود محمد، التنظيم القانوني الدولي لحماية البيئة من التلوث، رسـالة ماجسـتير، مقدمـة الى كليـة القانون، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٣.

- لیژنەی هلسنکی.
- رێککەوتننامەی ڕێکخراوی قەدەغەکردنی چەکی کیمیاوی (OPCW).
- ڕێککەوتننامەی کاری نەتەوە یەکگرتووەکان تایبەت بە گۆڕانی کەشوهەواو پرۆتۆکۆڵی ۹/۷/۱۹۹۲ی کیوتو.[۹۲]

لە لایەکی تر، ئەوە ئەرکی دەوڵەتانە، لە بوارەکانی یاسایی و پراکتیکدا کاربکەن بۆ نەهێشتن و ڕێ لە زیان گەیاندن بە تەندروستیی مرۆڤ و گیاندارو ڕووەك بگرن و، ئاوی پاك و خاوێن دابین بکەن، ڕێگە لە پیسبوونی ژینگە بگرن، پاشەڕۆك فڕێ نەدەنە ناو دەریاو ڕووبارەکان و، ناوچەکانی ئابووری و ڕووبارو دەریاچە و ئاوەڕۆکان بپارێزن، بە تایبەت کە پێشکەوتنە زانستییەکان و خراپ بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیا کاریگەریی خراپیان کردۆتە سەر ژینگە و سامانەکانی ڕووەکی و ئاژەڵی و دەریایی و...هتد، چونکە ڕووبەڕووی گرفت و کێشە بوونەتەوە.

لەم ڕووەشەوە لەناوخۆی دەوڵەتاندا، گروپ و پارتی جۆراوجۆر دروست بوون کە بۆ پاکوخاوێنی ژینگەو ڕووبەڕووبونەوەی ژینگەی پیس کاردەکەن. هەروەها سەنتەری یاسای نێودەوڵەتیی ژینگەیی کە دامەزراوەیەکی یاسایی ژینگەییە و مەبەستی سوود و قازانج نییە، لە ساڵی ۱۹۸۹دا دامەزراوە، بۆ ئەوەی یاسای نێودەوڵەتیی ژینگە کاراو بەهێز بکات و سیاسەتی ژینگەیی لەسەر ئاستی جیهان پەرەپێبدات، لەسەر ئاستی هەرێمی و دووقۆڵیش چەندین ڕێککەوتننامە هاتوونەتەئاراوە، سەرەڕای ئاژانسەکانی ژینگەی سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان.

### ٨- یاسای نێودەوڵەتیی دەریایی

پرینسیپی ئازادیی دەریاوانی وەك ڕێسایەکی یاسای نێودەوڵەتی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا جێی خۆی گرتووە. پێش ئەوە، هەر دەوڵەتە خۆی بەخاوەن سەرداریێتی لەسەر کەناری دەریایی خۆی دەزانی، هەندێ جار لەسەر هەندێ ناوچەی دوورتریش: بۆ نموونە، ڕۆما داوای سەروەریێتی لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست دەکرد، بوندوقیە (ڤینیسیا) داوای سەروەریێتی لەسەر دەریای ئەدریاتیك دەکرد، پورتوگال لەسەر دەریای ڕۆژئاوای ئەفریقاو مۆڵەتی بە کەشتیوانیی بێگانە نەدەداو ڕێگەی نەدەدا کەس بگاتە هیندستان، ئیسپانیا داوای سەروەریێتی لەسەر بەشی خوارووی دەریای ئەتڵەسی دەکرد، بەریتانیا لەسەر بەشی سەرووی خۆی و دەریای

---

۹۲. بۆ زیاتر بڕوانە:

topics.asp?tid = 1098cr = http://www.assr.org/general

مانشن، دانیمارك و سوید لەسەر دەریای بەلْتیك. دۆزینەوەی ئەمریكاو ئەو بازرگانی و كەشتیوانییەی هاتەئاراوە هانی دەوڵەتانیان دا داواكاریی زێتریان هەبێ وەك سلاْوی دەریایی و هەروەها چاودێریی پۆلیس تا گەیشتە ئەوەی كە دەبێ  هەر كەشتیەك بەر لەوەی تێپەڕ ببێت مۆڵەتی هەبێ. ئەم حاڵەتە وایكرد ئەوانەی بایەخ بەیاسای نێودەوڵەتی دەدەن گرنگی بەم كێشەیە بدەن، هەندێكیان فیكرەی دەریاوانیی ئازادیان هێنایە بەرباس، هەر بۆیە **گروسیوس** لە كتێبە بە ناوبانگەكەی (دەریای ئازاد)دا هێرشیكردە سەر ئەو دەوڵەتانەی كە داوای سەروەرێتی لەم چەشنەیان دەكرد، داواشیكرد كە پێویستە دەریاوانی بۆ هەموو دەوڵەتان ئازاد بێت. بەلاْم بەریتانیا وەك زلهێزێك بە توندی وەلاْمی ئەم بۆچوونەی دایەوە، یاساناسی ئینگلیزی جون سلدن بە پێچەوانەی بۆچوونەكانی گرۆسیۆس، كتێبێكی بە ناوی (دەریای داخراو) دانا، سەرئەنجام چەمكی ئازادیی دەریاوانی سەركەوت.[٩٣]

یاسای نێودەوڵەتیی دەریایی، هەموو ئەو بابەتانە دەگرێتەوە كە پەیوەندییان بە دەریاو سروشتی دەریا و ئەو سەرچاوە یاساییانەوە هەیە كە بەڕێوەیان دەبەن، هەروەها هەموو ئەو هۆكارە گرنگانەی كە كار لە یاسا دەكەن، لەگەڵ پێناسەی كەشتی و سروشتی كەشتی و دیاریكردنی جۆرەكانی.

كۆمەڵی نێودەوڵەتی لە نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدەدا دەستیكرد بە تۆماركردنی بەشێكی كەم لە ڕێساكانی ئەم بوارەو سەرەتا بەو ڕێسایانە دەستی پێكرد كە تایبەتبوون بە جەنگی دەریایی. ڕاگەیاندنی ساڵی ١٨٥٦ پاریسی تایبەت بە جەنگی دەریایی دەستپێكی ئەو تۆماركردنە بوو، دوای ئەوە ڕێككەوتنی ساڵی١٩٠٧ی لاهای تایبەت بە جەنگی دەریایی و ڕاگەیاندنی ساڵی ١٩٠٩ی لەندەن هاتنەئاراوە، دوای دامەزراندنی كۆمەڵەی گەلانیش چەند ڕێككەوتننامەیەكی نێودەوڵەتیی تایبەت بەڕێكخستنی پەیوەندییە دەریاییە نێودەوڵەتییەكان لەكاتی ئاشتیدا هاتنەدی، بۆ نموونە، ڕێككەوتننامەی ساڵی ١٩٢١ی برشلۆنە كە تایبەت بوو بە ئازادیی ترانزێت و سیستەمی ڕێگاكانی دەریاوانی، كە گرنگییەكی زۆری نێودەوڵەتی هەبوو و ڕێككەوتننامەی ساڵی ١٩٢٣ی ژنێفی تایبەت بە سیستەمی نێودەوڵەتی بۆ شوێنی مانەوەو لەنگەرگرتنی كەشتییەكان و پڕۆژەی ڕێككەوتنی تایبەت بە (یاسای دەریایی هەرێمی)كە دواتر كۆنگرەی ساڵی ١٩٣٠ی لاهای لێكەوتەوە.[٩٤]

---

٩٣. د. علی صادق أبو هیف، القانون الدولي العام، ص٣٧٨ وما بعدها.

٩٤. د. محمد سامی عبدالحمید و د. محمد سعید الدقاق، القانون الدولي العام، منشأة المعارف بالأسكندرية، ٢٠٠٤، ص٣٧٦.

کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانیش لە ساڵی ١٩٤٧ەوە لیژنەی یاسای نێودەوڵەتی تایبەت بە ئامادەکردنی تۆێژینەوە و پڕۆژەی داڕشتنی ڕێسای یاسایی نێودەوڵەتی لەم بارەیەوە دانا. ئەو پڕۆژە یاسایە پێشکەش کۆنگرەی ساڵی ١٩٥٨ی ژنێف کرا و چوار ڕێککەوتننامە هاتنەدی کە تایبەت بوون بە: **یەکەمیان** دەریای هەرێمی و هەرێمی دراوسێی، **دووەمیان** دەریا ئازادەکان، **سێیەمیان** بە راوکردن و پارێزگاری لە سامانە بایۆلۆجییەکانی دەریا ئازادەکان، **چوارەمیان** تایبەت بوو بە پانتایی وشکایی. هەروەها کۆنگرەکە نۆ بڕیاری دا کە لە بنەڕەتدا پەیوەندییان بە تاقیکردنەوەی چەکی ئەتۆمی لە دەریای ئازاد و گرفتی پیسبوونی ئاو بە ماددەی تیشکهاوێژو پاراستنی ڕاوکردن و سیستەمی ئاوە مێژوویەکانەوە هەبوو، هەروەها کۆنگرە رەزامەندی لەسەر پڕۆتۆکۆڵێکی ئارەزوومەندانەش دا کە تایبەت بوو بەیەکلاکردنەوەی ئەو ناکۆکیبانەی کە بە هۆی جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتننامەوە دێنەدی.[٩٥]

**٩- یاساکانی بەڕێوەبردنی بواری هەوایی (بۆشایی) – قوانين تحكم المجال الجوي.**

بۆ تێگەیشتن لەم لقە گرنگەی یاسا، پێویستە ئەوە روون بکەینەوە کە جیاوازی نێوان هەرێمی هەوایی (الأقليم الجوي) و بۆشایی ئاسمانی (الفضاء الكوني) چییە، کە بەم شێوەیە دەیخەینە روو[٩٦]:

**أ- بەرگە هەرێمی هەوایی:** توخمی سێیەمی دەوڵەتە لەگەڵ توخمەکانی وشکانی و ئاوی. ئەو بەشەیە لە بۆشایی ئاسمان کە راستەوخۆ لە سەرووی زەویەوە هەوادارە. ئەو بەشەیە لە دەوڵەت کە دەکەوێتە ژێر ڕکێفی سەروەرێتی، یان ئەو بەشەیە کە دەوڵەت بەگوێرەی ڕێککەوتنێك یان پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی دەسەلاتەکانی خۆی لەسەر پراکتیزە دەکات.

ئەو ڕێسایەی کە ئەم هەرێمە هەواییە ڕێکدەخات، پێی دەگوترێ یاسای نێودەوڵەتیی هەوایی، گرنگی ئەم هەرێمە هەواییە کە بەچینە هەواییەکان دیاری دەکرێت، لەگەڵ یەکەم هەوڵی فڕۆکەوانیی دەستی پێکرد، کاتێ لە ٢١ی تشرینی دووەمی١٧٨٣ز دا باڵۆنێك هەڵدرایە هەوا کە کەسێکی هەڵگرتبوو، ئەمەش سەردەمێکی نوێی لێ کەوتەوە لە مێژووی کۆمەڵی نێودەوڵەتی و کاریگەریی لەسەر زۆر لە بیرو بۆچوونە سیاسی و سەربازیەکان دانا.

---

٩٥. بۆ زیاتر بروانە سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٧ ودواتر.

٩٦. د. عبدالكريم علوان، الوسيط في القانون الدولي العام، (الكتاب الثاني)، مكتب دار الثقافة للنشر والتوزيع، ط١، ١٩٩٧، ص١٣٠ وما بعدها.

بەبەکارهێنانی فڕۆکە لە جەنگی یەکەمی جیهاندا، چەکی ئاسمانی بایەخی زۆرتری پەیداکرد. دواتر پیشەسازیی فڕۆکەوانی بەرەو گواستنەوەی بازرگانیی دوەلی چوو، ئەمەش وایکرد کە فڕۆکە زۆر بەفراوانی بەکاربێت، بەهۆی ئەم پێشکەوتنەش چەندین توێژینەوەی یاسایی لە ساڵی١٩٠١ەوە تا ئێستا کراون و کۆمەڵی نێودەوڵەتی چەندین رێککەوتننامەی بۆ رێکخستنی ئەم بارانە رێکخستووە، کە بە ناوبانگترینیان رێکەوتننامەی شیکاگۆی ساڵی ١٩٤٤-ە.[٩٧]

لێرەوە دەکرێ پێناسەی ئەم یاسایە بەم شێوەیە بخەینەڕوو: کۆمەڵە رێسایەکە، کاروباری بواری ئاسمانیی نێوان دەوڵەتان و ئەحکامەکانی و رەگەزنامەی فڕۆکەوانی لە ئاسماندا رێکدەخەن. سەروەرێتیی دەوڵەت لەسەر هەرێمی هەوایی بە شێوەیەکی شاقوولی تا ئەو ئاستە درێژ دەبێتەوە کە فڕۆکە دەتوانێ هاتوچۆی هەوایی پێدا بکات و ئەم ڕووبەرە بە ٣٠-٤٠کم دەخەملێنرێت.[٩٨]

لە رێککەوتننامەی شیکاگۆ، مادده (١) دا هاتووە کە دەوڵەتان دان بەوەدا دەنێن هەر دەوڵەتێك سەروەرێتی تەواوی بەسەر بۆشایی ئاسمانی خۆیدا هەیە و پێنج چالاکی ئازادی فڕۆکەوانی هەیە کە ئەمانەن[٩٩]:

- فڕین بەسەر هەرێمی دەوڵەتێکی بێگانەدا بەبێ نیشتنەوە.
- نیشتنەوە بۆ مەبەستی نابازرگانی بەڵکو بۆکاری تەکنیکی و سوتەمەنی و چاککردنەوە.
- مافی فڕۆکەکانی بازرگانییە کە لە هەرێمی دەوڵەتێکی ئەندام لە رێککەوتننامەکەدا بنیشنەوە، سەرنشین و کەلوپەل و پۆستەی ئەو دەوڵەتە دابەزێنێ کە لێیانەوە هاتوون.
- مافی فڕۆکەی بازرگانییە سەرنشین هەڵبگرێ و کەلوپەل باربکات لە هەرێمی دەوڵەتێکی بێگانەوە بۆ دەوڵەتی خۆی.
- هەڵگرتنی نەفەرو بارکردن لە دەوڵەتێکی ئەندام بۆ یەکێکی تر.

---

٩٧. د. حامد سلطان، القانون الدولی العام، المصدر السایق، ص٥٥٠ وما بعدها، ود. محمد سامی عبدالحمید ود. مصطفی سلامة حسین، القانون الدولی العام، مرکز مکتب الثقافیة، الدار الجامعیة، ١٩٨٨، ص٢٠٥، وما بعدها.

٩٨. د. سهیل حسین الفتلاوی ود. غالب عواد حوامدة، موسوعة القانون الدولی العام، الجزء الثانی، دارالثقافة للنشر والتوزیع، ط١، ٢٠٠٧، ص١٤٦.

٩٩. د. محمد سامي عبدالحميد وصاحبه، القانون الدولي العام، المصدر السابق، ص٢٠٦.

هەروەها ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە ئەنجامدانی تاوان لەسەر فڕۆکەو.... هتد هەیە لە چوارچێوەی ئەم ڕێککەوتنە جۆربەجۆرانەدا چارەسەرکراون.

هەرچی بۆشایی ئاسمانیشە ئەو بەشەیە لە ئاسمان کە بەهۆی نەبوونی ئۆکسجین و نەمانی کێشی زەوی لە باری ئاساییدا بۆ ژیان و نیشتەجێ بوون دەست نادات. هەربۆیە هەندێ لە یاساناسان چەمکی ئەم یاسایە بۆ دوو لقی سەرەکی دابەش دەکەن، یەکەمیان: پەیوەستە بەو دەقە یاساییانەی کە چالاکی مرۆڤ ڕێکدەخەن لە بەرگە هەوادا، کە ئامرازە سەرەکییەکەی فڕۆکەیە، پێیان دەگوترێت یاسای فڕۆکەوانیی بازرگانی، دووەمیان: تایبەتە بە چالاکی مرۆڤ لە دەرەوەی بەرگە هەوا، واتە لەو شوێنەی هەوا نامێنێ، سەروەرێتیی دەوڵەتیش نامێنێ، لێرە دا پێی دەگوترێت یاسای ئاسمانیی هەوایی، کە ئامرازەکانی کەشتییە ئاسمانییەکانن.[١٠٠]

**ب- بۆشایی ئاسمانی لە سەرووی هەرێمی هەوایی.** لەگەڵ بەرەوپێشچوونی زانست و تەکنۆلۆژیادا، یاسای ئاسمانی دەرەوە پێشکەوتووە و لەگەڵ بوونی گرفت و هەڵوێست و دەرهاوێشتەی نوێ، بێگومان پێویستی بە ڕێسای یاسای دیاریکراو هەیە. لەگەڵ ناردنی یەکەم کەشتی ئاسمانیی رووسی، سەلونتیك، لە ساڵی ١٩٥٧دا پێشکەوتن و پتربوونی چالاکییەکانی مرۆڤ لە بۆشایی ئاسماندا، دواتر ناردنی یەکەم کەشتیوانی روسی ئاسمانی گاگارین لە ساڵی ١٩٦١و دابەزینی یەکەم کەشتی لەسەر ڕووی مانگ، (ئەپولو)ی ئەمریکی، لە ساڵی ١٩٦٩ بە کەشتیەوانەوە. پێویستی دانانی ڕێسا بۆ ئەم لقە گرنگەی یاسای نێودەوڵەتیش هاتەئاراوە. بەتایبەت کە کێبڕکێیەکی توند لەنێوان رووسیاو ئەمریکا هەبوو، هەربۆیە کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگلاتووەکان لە ساڵی ١٩٥٨ بە بڕیاری ١٣٤٨ دەزگایەکی دانا بۆ دانانی ڕێسای یاسایی بە مەبەستی ڕێکخستنی بواری بۆشایی ئاسمانی (بەناوی لیژنەی بەکارهێنانی ئاشتییانەی بۆشایی دەرەکی). ئیدی (٥) ڕێککەوتننامەی سەرەکیی تایبەت بە دۆزینەوەو کۆنترۆڵی بۆشایی ئاسمان هاتنەئاراوە کە ئەمانەن.[١٠١]

- پەیماننامەی تایبەت بەو پرینسیپانەی کە چالاکی دەوڵەتان بەڕێوەدەبەن لە دۆزینەوەو بەکارهێنانی بۆشایی ئاسمانیی دەرەکی بە مانگ و تەنە ئاسمانیەکانیشەوە لە ٢٧ی کانوونی

---

١٠٠. د. أبو زيد رضوان، القانون الدولي الجوى وقانون الطيران التجارى، دارالفكر العربي، القاهرة، ص٨.

١٠١. د. محمد المجذوب، الوسيط في القانون الدولي العام، المصدر السابق، ص٤٣٥، ود. أحمد أبو الوفا، الوسيط في القانون الدولي العام، ص ص٢٧٦ -٢٧٧.

١٩٦٧، که باس له ئازادیی دۆزینەوەو بەکارهێنان و خستنە ژێر ڕکێفی فەزا دەکەن، کە سەروەریێتی هیچ دەوڵەتێکی بەسەرەوە نییە.

- ڕێککەوتننامەی ڕزگارکردنی کەشتیەوانان، گەڕانەوەی خۆیان و ئەو شتانەی کە چوونە بۆشایی لە ٢٢ی نیسانی ١٩٦٨ بەسترا، لەمەڕ چۆنیەتی یارمەتیدانی کەشتیوان لە کاتی ڕووداو، هەروەها گەڕاندنەوەی کەشتییەکە بۆ دەوڵەتی خۆی.
- ڕێککەوتننامەی تایبەت بە بەرپرسیاریێتیی نێودەوڵەتی تایبەت بەو زیانەی کە لە کەشتی ئاسمانی دەکەوێتەوەو لە ٢٩ی ئازاری ١٩٧٢ دا بەسترا. ئەمەش لەسەر هەموو ئەو داوایانە جێبەجێ دەبێت کە لە هەر زەرەرێکی کەشتیوانی ئاسمانییەوە سەرچاوەی گرتبێت، جا کەشتییەکە سروشتێکی سەربازی هەبێت یان شارستانی.
- ڕێککەوتننامەی تۆمارکردنی ئەو شتانەی کە بۆ بۆشایی هەڵدەدرێن. ئەم ڕێککەوتننامەیە لە ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٥دا بەستراوە کە دەبێ دەوڵەتان کەشتییەکانیان لە لای سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان تۆمار بکەن.
- ڕێککەوتننامەی ساڵی١٩٧٩ کە حوکمی چالاکی دەوڵەتان سەبارەت بە مانگ و تەنە ئاسمانیەکان دەکات، کە نزیکە لە دەقەکانی پەیماننامەی ساڵی ١٩٦٧، ئەگەر چی دانی بەوەدا دناوە کە مانگ و بەروبوومەکانی کەلتوری هاوبەشی مرۆڤایەتین.

هەروەها گرفتەکانی تر سەبارەت بەم چالاکییانە لە چوارچێوەی ئەم ڕێککەوتننامەیەدا چارەسەرکراون.

### ١٠- یاسای پەنابردنە بەر هێز:

لە بواری یاساناسی نێودەوڵەتیدا، یاسای نەهێشتنی شەڕ یان مافی شەڕکردنیشی پێ دەگوترێت. پەنابردنەبەر بەکارهێنانی هێز، تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیش کارێکی ناڕەوا نەبوو، بەڵکو وەك ڕێگەیەکی پەسەندکراو بۆ کۆتاییهێنان بە ململانێکان دادەنرا.

ئەم بۆچوونە ئەو پرسیارە دێنێتە پێش کە ئایا جەنگ کارێکی رەوایە؟ ئەگەر شەڕی دەوڵەت بۆ بەرپەرچدانەوەی کارێکی دوژمنکارانە بێت، یان بۆ پاراستنی مافێکی بێت، کە بەبێ پاساو پێشێلکراوە، ئەوا جەنگ لەم بارەدا لە لایەك لە خانەی بەرگری لە خۆکردندایە و لە لایەکی تر سزایە کە پارێزگاری لە مافی ئەو دەوڵەتە دەکات بۆ پاراستنی ماف و رەتدانەوەی کاری دوژمنکارانە. بەڵام ئەگەر جەنگ بۆ زاڵبوون و داگیرکردن و دەسەڵات سەپاندن و خستنەژێر رکێفی دەوڵەتانی تر بێت، ئەوا کارێکی ناڕەوایە و دەبێ بە رەهایی

قەدەغە بکرێت، بۆیە زۆربەی یاساناسان باس لە جەنگی ڕەوا دەکەن کە دەوڵەت پەنای بۆ دەبات بۆ ئەوەی بەرگری لە ماف و بەرژەوەندییەکانی بکات و ئەم شەڕە ڕەوایی وەردەگرێ، بەڵام جەنگی ناڕەوا یان دوژمنکارانە، ئەوا سیفەتی ناڕەواییان پێدابوو و هەر کارێکی لەم چەشنە ئەوا بە شەڕانگێزی لە قەڵەم دەدرێ، بۆیە یاسای جەنگ و بەکارهێنانی هێز هەیە تا ئەم کارانە ڕێکبخات و لە گەڵ لایەنی مرۆڤایەتی بگونجێت.[١٠٢]

بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بە یەکجاری قەدەغەی کردووە کە ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیاندا هێز بەکاربێنن، یان هەڕەشەی هێزبەکارهێنان بکەن، بەڵام لە کاتێکدا دەوڵەتێك یان کۆمەڵە دەوڵەتێك پەلامار دەدرێن لە لایەن دەوڵەتێك یان کۆمەڵە دەوڵەتێکی ترەوە، ئەوا بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان مافی خۆپاراستن و بەرگری لە خۆکردن چ بە تاك چ بە کۆمەڵ دەپارێزێت، هەروەها ئەنجوومەنی ئاسایش بە گوێرەی بەشی حەوتەمی میساق دەتوانێ بۆ سەرکوتکردن و گێڕانەوەی ئاشتی هێز بەکاربێنێ، هەروەها بۆ پاراستنی ئاشتی، بۆ بزووتنەوە ئازادیخوازەکان کە بۆ بە دەستهێنانی مافی چارەنووسی گەلەکانیان خەبات دەکەن، وەك پێشتر ڕوونکراوەتەوە بەکارهێنانی هێزیان بە ڕەوا زانیوە، مافی بەرگری ڕەوایە کە لە ماددە (١٢)ی بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە، لە لایەك لە چوارچێوەی ماف و ئەرکی دەوڵەتانە، لە لایەکی تر لە گەڵ پێداویستی یاسایی و لایەنەکانی یەکسانیپارێزی و دادخوازیدا دەگونجێت و ناساندنێکی یاسایی سیستەمی نێو دەوڵەتی هاوچەرخە.[١٠٣]

## ١١- یاسای ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان

ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان کە لە گۆڕانکارییەکانی سەدەی نۆزدەی کۆمەڵی نێودەوڵەتی کەوتوونەتەوە لە کاتێك کە بیری دەوڵەتی نەتەوەیی هاتە ئاراوە، ئەو گۆڕانە خێرایانەی کە چەمکی بەرژەوەندی و جۆری پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتان دەیخوازێت. دەرکەوتنی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و پێشکەوتنیان بۆ دوو هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە[١٠٤]:

١٠٢. د. علي صادق أبو هيف، المصدر السابق، ص٧٨٢.

١٠٣. د. حسن الجليي، المصدر السابق، ص٤٣٨.

١٠٤. د. فخري رشيد المهنا و د. صالح ياسين داود، المنظمات الدولية، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، جامعة الموصل، ص٥-١٣.

١.   بـاری ململانـێ و جـەنگی ئـەوروپا و جیهـان بەگشـتی، سـەرنەکەوتنی کـۆنگرەو هاپەیمانێتییەکان بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی و ئاسایش، ئەمەش وای لە رووناکبیر و بیریاران کرد کە داوای هاتنە ئارای رێکخراوی لەم جۆرە بکەن.

٢.   پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژی و شۆڕشی پیشەسازی و باری ئابووری و ئاڵوگۆڕی بازرگانیی نێودەوڵەتی، ئەمەش بـەهۆی نزیکـی نێـوان کیشـوەرەکان، پێویسـتی دەکـرد کـە رێکخستنێك هەبێت، بەردەوام و جێگیر تا گەیشتە ئەوەی کە ئەمڕۆ هەیە.

یاساناسان پێناسەی جۆربەجۆریان بۆ رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان کردووە، دەکرێ لەناویاندا ئـەو پێناسـەیە وەربگـرین کـە دەڵـێ (رێکخـراوی نێودەوڵـەتی دامـەزراوێکی نێودەوڵـەتی هەمیشەییە، خاوەن خواستی زاتی خۆیەتی و کەسایەتی نێودەوڵـەتیی سـەربەخۆی هەیـە، بـە رێککەوتنی چەند دەوڵەتێك دێتەدی، بۆ ئەوەی ئەو تایبەتمەندی و دەسەڵاتانە پیادەبکـات کـە لە رێککەوتنەکەدا هاتوون). لەمەوە تێدەگەین ئەم رێکخراوانە چەند توخمێکیـان هەیـە وەك، خەسڵەتی نێودەوڵەتی، بەردەوامی، خواستی سەربەخۆ و خاسیەتی رێککەوتن.[١٠٥]

رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان چەند جۆرێکن لەوانە[١٠٦]:

- رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان- ئامانجدار: کە بۆ ئامـانجێکی تایبـەت کاردەکـەن، وەك رێکخراوی ئابووری، سەندوقی دراوی نێودەوڵـەتی، بـازاڕی ئـەوروپی، رێکخـراوی بازرگـانیی نێودەوڵەتی و هتد.
- رێکخـراوە نێودەوڵەتییـەکان- سیاسـی: وەك یـەکێتیی ئـەوروپا، بزووتنـەوەی بـێ لایەنەکان، کۆمکاری عەرەبی. هتد.
- رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان- سەربازی: کە بە هاوپەیمانییە نێودەوڵەتییەکانیش ناوزەد دەکرێت، وەك پەیمانی ئەتڵەسی، پەیمانی جارانی وارشۆ..هتد.
- رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان - هونەری: وەك رێکخـراوی تایبـەت بـە پارێزگـاری لـە موڵکییەتی ئەدەبی و هونەری، یەکێتیی نێودەوڵەتی بۆ گەیاندنی پەیوەندیی بەسـیم و بێتـەل، رێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ چاودێری کەشوهەوا، رێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنی..هتد.

---

١٠٥. د. رشاد عارف السید، الوسیط فی المنظمات الدولیة، ط٢، ٢٠٠٧، ص١١-١٤.

١٠٦. د. سهیل حسین الفتلاوي، التنظیم الدولي، دار الثقافة للنشر والتوزیع، ط١، ٢٠٠٧.

- رێكخراوی نێودەوڵەتی-كۆمەڵایەتی: وەك رێكخراوی پەروەردەو زانست، یەكێتی پەخش و بڵاوكردنەوە و وێستگەكان، رێكخراوی تر كە بایەخ بە زانست و رۆشنبیری و پەروەردەو فێركردن و توێژینەوەی زانستی و راگەیاندن و بڵاوكردنەوە...هتد دەدەن.
- رێكخراوی نێودەوڵەتی- مرۆڤایەتی: وەك رێكخراوەكانی مرۆڤدۆستی و خێرخوازی، نموونە: لیژنەی نێودەوڵەتیی مافەكانی مرۆڤ، رێكخراوی مافەكانی مرۆڤی یەكێتیی ئەوروپا،...هتد، رێكخراوە نێودەوڵەتییە ناحكومییەكان، وەك رێكخراوی هیومان رایتس وۆچ، رێكخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی و رێكخراوی پزیشكانی بێ سنوور.
- رێكخراوی نێودەوڵەتی دارایی: وەك سندووقی دراوی نێودەوڵەتی و بانكی نێودەوڵەتی بۆ بنیاتنان و ئاوەدانكردنەوە....هتد.
- رێكخراوی نێودەوڵەتی- رۆشنبیری: بۆ ڕێكخستنی پەیوەندییە ڕۆشنبیرییەكان لەنێوان دەوڵەتان و ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیری و ئیسلامی وەك یونسكۆ.
- ڕێكخراوە دادوەری و یاساییەكان: وەك دادگای دادی نێودەوڵەتی و دادگای سزادانی هەمیشەیی و...... هتد
- ڕێكخراوی فرەكار و مەبەست:

بەمەبەستی ئەنجامدانی چەندین ئامانجی سیاسی و ئابووری و سەربازی و مرۆڤایەتی و خێرخوازی، وەك نەتەوە یەكگرتووەكان، ڕێكخراوی خواروی ڕۆژهەلاتی ئاسیا، كۆنگرەی ئیسلامی و كۆمكاری دەوڵەتانی عەرەبی.

**دووەم:**

**ڕێكخراوە نێودەوڵەتییەكان بەگوێرەی پێگەی جوگرافییان دابەش دەبن بۆ رێكخراوی جیهانی و رێكخراوی هەرێمی:**

**أ- ڕیكخراوی جیهانی: كە تیایدا ئەندامێتی بۆ هەموو دەوڵەتانە، چەند جۆرێكن لە وانە:**

- ڕێكخراوی جیهانیی بێ مەرج

كە لە كۆندا هەبووە و بەبێ هیچ مەرجێك دەوڵەت قبوڵ دەكات. هەنووكە ئەم جۆرە ڕێكخراوەیە نەماوە، وەكو ڕێكخراوی پۆستی جیهانی كە تا ساڵی ١٩٤٧ مابوو.

- ڕێكخراوی جیهانیی مەرجدار:

دەبێ دەوڵەت مەرجی تێدابێت و ڕیكخراوەكە قبوڵی بكات، بۆ بوونە ئەندام دەوڵەت داوایەك پێشكەش دەكات، وەكو نەتەوە یەكگرتووەكان، ڕێكخراوی بازرگانیی جیهانی و ڕێكخراوی كاری نێودەوڵەتی.

### ب-   ڕێکخراوی هەرێمی:

ئەو ڕێکخراوانەن کە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان ڕێکدەخەن کە چوارچێوەیەکی هەرێمی یان ناوچەیی یان بەرژەوەندیی هاوبەش کۆیان دەکاتەوە، گوتەی ڕێکخراوی هەرێمی زۆر پێشکەوتووە، کە سەرەتا گوزارشتێکی هەرێمی بوو ئەوا ئێستا هۆکاری جوگرافی هۆکاری بنەڕەتی نییە بۆ دیاریکردنی ڕێکخراوی جوگرافیی هەرێمی، بەڵکو ئەو دەوڵەتانە دەگرێتەوە کە لەیەك هەرێمدا نین وەك کۆمکاری دەوڵەتانی عەرەب کە دەوڵەتانی ئاسیاو ئەفریقیا دەگرێتەوە. چەند جۆرێکن:

- فاکتەری جوگرافی لە ڕێکخراوە هەرێمییەکاندا

فاکتەری جوگرافی بنەمایەك و پێویستییەکە بۆ دیاریکردنی ڕێکخراوەی هەرێمی و ڕێکخراوەی جیهانیش بۆ ڕێکخستن و جێبەجێکردنی ئامانجەکانیان کار بۆ دابەشکردنی جیهان دەکات بۆ ناوچەی هەرێمی جوگرافی. نموونە نەتەوە یەکگرتووەکان ناچار بوو کە چالاکییەکانی دابەش بکات لە ڕێگای ئاژانس و نووسینگەی هەرێمیی جوگرافی یان لە ڕێگەی دەوڵەتانی ناوچەنشین بە دروستکردنی ڕێکخراوی هەرێمی تایبەت بەخۆیان لەو ڕێکخراوە هەرێمییانەی کە لەسەر بنەمای جوگرافی دروست بوون وەك ڕێکخراوی دەوڵەتانی ئەمریکای لاتینی، ڕێکخراوی یەکێتیی ئەوروپا، ڕێکخراوی یەکێتیی ئەفریقیا، ڕێکخراوی ئاسیان.

- هۆکاری سیاسی لە ڕێکخراوە هەرێمییەکاندا.

جگە لە هۆکاری جوگرافی، هۆکاری هاریکاری هاتەئاراوە، ڕێکخراو هەیە لەسەر بنەمای لێکنزیکی سیستەم یان ئایدۆلۆژی دامەزراوە وەك یەکێتیی ئەوروپا، یان بەهۆی ناردەی سامانی سروشتی بنەڕەتی وەك ڕێکخراوی دەوڵەتانی هەناردەی نەوت (ئۆپك)، یان هۆکاری نەتەوەیی وەك کۆمکاری عەرەبی، یان هۆکاری ئایینی وەك کۆنگرەی جیهانی ئیسلامی، یان فاکتەری ئارامی و ئاسایش وەك بزووتنەوەی بێ لایەن و کۆمۆنوێڵسی بەریتانی و یەکێتیی رووسی بۆ دەوڵەتە سەربەخۆکان و پەیمانی باکوری ئەتڵەسی، دەکرێ ڕێکخراوی هەرێمی بۆ هەموو دەوڵەتان کراوەبێ وەك ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی کە بۆ هەموو دەوڵەتانی ئیسلامی کراوەیە، یان داخراوە وەك ئەنجوومەنی هاریکاری دەوڵەتانی کەنداوی عەرەبی.

- ڕێکخراوی هەرێمیی سنووردار لە چوارچێوەی ڕێکخراوێکی هەرێمیدا وەك ئەنجوومەنی هاریکاریی دەوڵەتانی کەنەدا، یەکێتی مەغریبی،.......هتد.

## ١٢- یاسای بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی

بەرپرسیارێتی responoler وشەیەکی قانوونیی رۆمانییە، کە سەرەتا مانایەکی ئـابووری و دارایی دەبەخشی و هیچ ئاماژەیەکی بـۆ بەرپرسـیارێتی لـە هەڵـەی تێـدا نـەبوو لـەنێوان خاوەنقـەرزو قـەرزدارو کـەفیلی خاوەنقـەرز. بـەلاّم نـاوەڕۆکی بەرپرسـیارێتی لـە سـەدەکانی ناوەڕاستدا گۆرا، یاساناسان جێگەی یاسای کلێساو پیاوانی لاهوتیـان گرتـەوەو پوختـەی ئـەو یاسایە ئەوەیە کە هەڵسوکەوتی تاك بەشێکی گرنگی بەرپرسیارێتییە، هەڵە پێوەری سـەرەکیی بەرپرسیارێتییە، دەبێ تاك ئەنجامی هەڵەی خۆی وەئەستۆ بگرێ.گرۆسیۆس ئەم کۆنسێپتەی لە بەرپرسـیارێتی وەرگرتـووە.[١٠٧] یاسـاناس ئـەنزیلۆتی مەسـەلەی بەرپرسـیارێتی بەسـتەوە بـە قەرەبووکردنەوەی زیان لێکەوتوو. دادگای هەمیشەیی دادی نێودەوڵەتی ئاماژەی بـەم ڕێسـایە داوە لە کێشەی کارخانەی شاروف،کە دەڵێ (پرینسیپێك هەیە لە یاسای گشتیی نێودەوڵەتیـدا کە دەڵێ هەر چەشنە پێشێلکارییەکی ڕێسایەك دەبـێ بەشـێوەیەکی گونجـاو چـاك بکرێتـەوە، قەرەبووبکرێتەوە، کە ئەمەش دەرئەنجامێکی گرنگی پێشێلکردنی هەر پەیماننامەیەکـە ئەگـەر لە پەیماننامەکەشدا نەهاتبێت. کەواتە هەڵسوکەوتی زیانبەخشی کەسێکی یاسایی نێودەوڵەتی بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی دەکەوێتە سەر).[١٠٨]

لیژنـەی یاسـایی نێودەوڵـەتی سـەربە نەتـەوە یـەکگرتووەکان پرینسـیبی بەرپرسـیارێتی نێودەوڵەتی جێگیر کردووە لەسەر بابەتی بەرپرسیارێتیی دەوڵەت بەهۆی ئەو زیانەی کە تووشی کەس و پارەی بێگانە دەبێت لە خاکەکەیدا. بۆیە لە ماددەی یەکدا هاتووە کە دەبـێ دەوڵـەت قەرەبووی بکاتەوە.[١٠٩]

سیسـتەمی یاسـایی نێودەوڵـەتی وەك سیسـتەمە یاسـاییەکانی تـر ئیلتیزامـات لەسـەر کەسەکانی دروست دەکات کە دەبێ جێبەجێی بکات و مافیان دیاری دەکات، هەربۆیە کەسـی یاسایی نێودەوڵەتیش کە ئەرکەکانی جێبەجێی نەکرد، ئەوا بەرپرسـیارێتی دەکەوێتـە ئەسـتۆ. عورفیش ئەمەی قبوڵ کردووە، هەندێ حوکم لەم بارەوە لە ڕێککەوتننامـە نێودەوڵەتییەکانـدا

---

١٠٧. د. غسان الجندي، المسؤولية الدولية، مطبعة التوفيق، ط١، ١٩٩٠، ص ص٣-٤.

١٠٨. نفس المصدر السابق، ص٤.

١٠٩. د. علي صادق أبو هيف، المصدر السابق، ص.٢٤٨

هـاتوون، لـە یاسـای نێودەوڵەتیـدا پێگـەی یاسـایی بـەهێزیان بـۆ پەیـدابووە.[110] کەواتـە بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی، سیستەمێکی یاسـاییە کـە هـەر کەسـێکی یاسـای نێودەوڵـەتی کارێکی نارەوا بکات، واتە کارێك بکات پێچەوانەی یاسای نێودەوڵەتی یان کارێك نەکات کـە بێئیلتیزامـی یاسـایی لێبکەوێتـەوەو زیـان بەکەسـێکی تـر بکـەوێت، ئـەوا بەرپرسـیارێتیی قەرەبووکردنەوەی دەکەوێتە سەر.[111]

بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی یان ڕاسـتەوخۆیە یـان ناڕاسـتەوخۆیە (کـاتێ دەوڵـەت لـەژێر سیستەمی "حیمایە، یان ماندێت، یان چاودێری" دابێت، مەرجەکانی ئەوەن کە دەبێ کارەکـە بدرێتە پاڵ دەوڵەت، یان نارەوا بێت، لە دەرئەنجامی ئەوکارە نارەوایەدا زیان کەوتبێتـەوە. لـە ساڵی ١٩٩١ ەوە پڕۆژەیەك لەلایەن لیژنەی یاسای نێودەوڵەتییەوە سـەبارەت بەبەرپرسـیارێتی نێودەوڵەتی پێشکەش کراوە.

**١٣- یاسای چارەسەرکردنی ئاشتییانەی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان**

مەبەست لە چەمکی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان، ئەو داوا دژانەن کە لەنێوان دووکەس یـان زیاتری نێودەوڵەتیدا هەیە، بەگوێرەی ڕێساکانی یاسای نێودەوڵەتی تایبەت بە یەکلاکردنـەوەی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان یەکلادەبنەوەو چارەسەردەبن.[112]

لە بڕیاری ٣٠/اب/١٩٢٤ ی دادگای هەمیشەیی دادی نێودەوڵەتی دا هاتووە کە مەبەست لە ناکۆکی نێودەوڵەتی، تێکگیرانـی نێـوان دوو دەوڵەتـە لەسـەر مەسـەلەیەکی یاسـایی یـان ڕووداوێکی دیاریکراو، یان بەهۆی جیـاوازی بـیرو بۆچـوونی یاسـایی، یـان بـەهۆی جیـاوازی بەرژەوەندییەوە. یاساناسـان و مامەڵـەی نێودەوڵـەتی جیـاوازی لـەنێوان دووجـۆرە نـاکۆکیی سەرەکیی نێودەوڵەتی دا دەکەن.

**یەکەمیان** ناکۆکی یاسایی، کە ئەو ناکۆکییەیە کە سیمایەکی یاسایی هەیە، یان لە دادگـا بـەگوێرەی ڕێسـاکانی یاسـای نێودەوڵـەتی چارەسـەر و یەکلادەکرێتـەوە، چـونکە لـەم جـۆرە ناکۆکییەدا جیاوازی لەسەر چۆنیەتی جێبەجێکردنی حوکمێك یان شیکردنەوەی حوکمەکەیە.

---

١١٠. د. حامد سلطان، المصدر السابق، ص٢٢١.

١١١. فالآ فريد ابراهيم، المسؤولية المدنية الدولية عن جريمة الأبـادة الجماعيـة، مطبعـة جامعـة صـلاح الـدين، اربيل، ٢٠٠٤، ص٥٩ وما بعدها.

١١٢. د. سهيل حسين الفتلاوي، ود. غـالب عـواد حوامـدة، القـانون الـدولي العـام، الجـزء الثـاني، المصـدر السابق، ص١٧٢.

**دووەمیان** ناکۆکی سیاسی کە سیمایەکی سیاسی هەیە بەو پێیەی یەکێ لە لایەنەکان داوا دەکات باری وەستاوو ئەوەی کە هەیە بگۆڕێت. دەبێ ئەم ناکۆکییە بە ڕێگەی تری دیپلۆماسی چارەسەر بکرێت.

هەندێ سەرچاوە ئاماژە بە ناکۆکیی هونەری یان زانستیش دەکەن کە لە ڕێگەی ئاژانسەکانی تایبەتمەندیی هونەرییەوە چارەسەر دەکرێت. ئامرازەکانی یان ڕێگاکانی یەکلاکردنەوەی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان چەند جۆرێکن.[١١٣]

- ڕێگای دیپلۆماسی: کە دانوستان و کۆششی چاکەکارانە و ناوبژیوانی و لێکۆڵینەوەو بەیەکەوە سازانە.
- ڕێگای سیاسی: کە لە ڕێگەی نەتەوە یەکگرتووەکان، یان ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی ترەوە بەڕێوە دەچێت.
- ڕێگای ناوبژیوانیکردن:کە بە ئاگاداری کەسێك یان دەستەیەك و بەڕەزامەندی هەردوولا و قبولکردنی بڕیارەکە بەڕێوەدەچێت.
- ڕێگای یەکلاکردنەوەی دادوەری: پرینسیپێکی سەرەکی هەیە کە دادوەری بەستراوەتەوە بە خواستی دەوڵەتانەوە،کە زیاتر مەسەلە یاساییەکان دەگرێتەوە. دادگاش بەگوێرەی حوکمەکانی یاسای نێودەوڵەتی یەکلایان دەکاتەوە.

**١٤- یاسای پەیماننامەکان**

یاسای پەیماننامەکان، سەرچاوەیەکی گرنگی یاسای نێودەوڵەتی دەگرێتەوە کە ئەویش پەیماننامە نێودەوڵەتییەکانە، ئەم یاسایە پەیماننامەکان ڕێکدەخات، مەرجەکانی بەستنیان نیشان دەدات، ڕۆڵی پەیماننامە نێودەوڵەتییە دوو قۆڵی و سەراپاگیرەکان و فرە لایەنەکان دەخاتە ڕوو، لەگەڵ چۆنیەتی بەستنی ئەو پەیماننامانە، یاسای پەیماننامەکان پێناسەی پەیماننامە و جیاوازی لەگەڵ ئەوانی ترو ئەو مەرجانەش کە پێویستە لە پەیماننامەدا هەبن دەخاتە ڕوو، هەروەها چۆن پەیماننامە پەسەند (تصديق) دەکرێت و چۆن کەسی یاسای نێودەوڵەتی دەچێتە ناویەوە. هەروەها پەیماننامە چۆن دروست دەبێت، چۆن دەوڵەتان پێیەوە پابەند دەبن، سەرپێچیکردنی چی لێ دەکەوێتەوە، چۆن دەستی پێوە دەگیرێ (تحفظات - خۆگیری)، یا هەموار دەکرێ یان هەڵدەوەشێتەوە، یان پاشەکشەی لێدەکرێ و لەکار دەخرێ،

١١٣. د. سهيل حسين الفتلاوي، وصاحبه، المصدر السابق نفسه.

هــەروەها کاریگــەریی پەیماننامــە لەســەر کەســێ کــە لایــەن نــەبێ لــە پەیماننامــە چــییە. ئەحکامەکانی پەیماننامە بەگوێرەی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بۆ یاسـای پەیماننامــەکان کـە لــە ١٩٦٩دا بەستراوە ڕێکخراون، دواتر بە درێژی باسی دەکەین.

**١٥- یاسای تیرۆری نێودەوڵەتی**

توندوتیژی لە مێژووی مرۆڤایەتیـدا ریشــەئاژۆیە، وەك دیاردەیــەکی کۆمەڵایــەتی لەگــەڵ ڕۆژگاردا پێشڤەچوونی بەخۆوە دیتووە، دواتر تاوانەکان رەهەنـدی نوێیـان لــە شـێوەو قــەبارەو شێوازی ئەنجامدان بە خۆوە دیتووە، لەوانەش تاوانەکانی توندوتیژی و تیرۆرن. زۆر لــە کــردەوە تیرۆریستەکان رۆڵی گرنگیان لە رێڕەوی مێژوودا بینیوە، هۆکاری سەرەکی هەڵگیرسانی هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهان بوون، هەزارەی سێیەمیش بە کارەساتی جیهانهەژێنی تــاوانی ١١ی سیبتەمبەری ٢٠٠١، کە بە تاوانی تیرۆری نێودەوڵــەتی لەقەڵــەم دەدرێـت، گۆڕانکـاری بنەڕەتی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان هێنایەئاراوە.

سەدان پێناسە بۆ تیرۆر لە لایەن دەوڵەتان و رێکخراوە هەرێمی و کومەڵەی گەلان و ئاژانس و دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان و یاساناسانی بواری نێودەوڵەتی و.. هتد کراوە. بەڵام تا ئێسـتا نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر پێناسەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی رێکنەکەوتووە.

گرنگترین ئەو پەیماننامەو رێککەوتننامانــەی کــە باسـیان لــە ناسـاندنی تــیرۆر کــردووە، پەیماننامەی پاریسە کە کۆتی خستۆتە سەر بەکارهێنانی هێز لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا. لە کۆنگرەی بروکسلی تایبەت بە تیرۆر کە ساڵی ١٩٢٦ بەڕێوەچوو، تــوانرا چــەمکی تــیرۆری سیاسی بخرێتە گەڕ. تاوانەکانی یاسای گەلان لــە کــۆنگرەی یەکــەمی یەکخسـتنی یاسـاکانی سزادان لە وارشۆ لە ساڵی ١٩٢٧، بەڵێننامەی پاریس (بریان کیلۆج)، لە ساڵی ١٩٢٨جیاوازی کرد لەنێوان جەنگی رەواو ناڕەواو کۆتی خستە سەر بەکارهێنانی هێزو جەختی کردەوە لەســەر پرینسیپی قەدەغەکردنی جەنگ وەك هۆیەك بۆ یەکلاکردنــەوەی ناکۆکییــە نیودەوڵەتییــەکان، گرنگی پێدان لە لای دادوەران لە کۆنگرەی زانستی سێیەمی یەکخستنی یاساکانی سزادان لــە برۆکسل لە ســاڵی ١٩٣٠ دەسـتی پێکــردو چــەمکی تــیرۆری نێودەوڵــەتی هاتــە ناوباســان و پێناسەی تیرۆر وا کرا کە بەکارهێنانی بە ئەنقەستی ئامرازەکانی ئەنجامدانی ئەو کارانەیە کــە ژیانی تاکەکان رووبەڕووی مەترسی و لەناوبردن دەکاتەوە، جـا رەگــەزیان هــەر چـییەك بێـت، هەروەها موڵکی مـاددیش وەك سـووتان و بــەکارهێنان و تێبــەردانی مـاددەی زیانبــەخش و بەکارهێنانی ماددەی خنکێنەرو، وروژاندنی ئاژاوەو لــە ئامرازەکـانی گواسـتنەوەو گەیانـدن،

لەکارخستنی خزمەتگوزارییەکانی دامەزراوە گشتییەکان و پیسکردنی ئاوو بەرووبومی کشتوکاڵی و ئاژەڵی و بەروبوومی خۆراکی. لە کۆنگرەی چوارەمدا کە لە پاریس بەسترا لە ساڵی ١٩٣١، کۆنگرەی پێنجەم لە مەدرید لە ساڵی ١٩٣٤ تیرۆری دابەشکرد بۆ دوو بەش: سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاماژەی بۆ ئەوەکرد کە تاڵان و کاری تێکدەری و بەکارهێنانی توندوتیژی لە تاوانەکانی تیرۆری سیاسی لە قەڵەم دەدرێن، لە کۆنگرەی شەشەمی یەکخستنی یاساکانی سزادان لە کۆپنهاگن لە ساڵی ١٩٣٥، لە تاوانی تیرۆری لە هەردوو ئاستی نێودەوڵەتی و ناوخۆی کۆڵیەوە، کە تیایدا هاتووە ئەو تاوانانەی کە مەترسی گشتی یان حاڵەتێکی ترس و تۆقاندن دێننەئاراوە بە تاوانی سیاسی لەقەڵەم نادرێن.[114]

کۆمەڵەی گەلان لە ١٦/ ١١/ی ١٩٣٧ گەیشتە رێککەوتننامەی نەهێشتنی تیرۆرو سزادان لەسەری، کە بە رێککەوتننامەی ژنیڤ ناسراوەو دوو پێناسەی بۆ تیرۆر کردووە: پێناسەیەکی پێوەری و پێناسەیەکی ژماردنی کارە تیرۆریەکان. کۆمەڵەی گشتیی و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانیش ئەگەر چی نەگەیشتونەتە پێناسەیەکی یەکگرتوو، بەڵام بۆ رووبەڕووبوونەوەو نەهێشتن و لەناوبردنی تیرۆر، چەندین بڕیاریان دەرکردووە.[115]

هۆکارەکانی تیرۆر زۆرن بۆ نموونە، هۆکاری کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و ئابووری و سیاسی و نەتەوەیی و ئایینی و ئیدۆلۆژی و هۆکارەکانی پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژی و رەوایی دەسەلات و دیموکراسی و مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ و دووروویی سیستەمی نێودەوڵەتی و..هتد دەگرنەوە.[116]

پێناسەی ئێمە بۆ تاوانی تیرۆر، بریتییە لە ئەنجامدانی کردەوەیەکی توندوتیژی (ماددی یان مەعنەوی) یان هەڕەشەکردن پێی، بە شێوەیەکی ناڕەوا بۆ دروستکردنی بارێکی ترس و تۆقاندن، کە تاك و کۆمەڵەکان و قەوارەو رێکخراوەکان و دەوڵەتەکان بۆ بە دیهێنانی ئامانجی دیاریکراو پێی هەڵدەستن.[117]

---

١١٤. عثمان علي حسن، الأرهاب الدولي ومظاهره القانونية والسياسية في ضوء القانون الدولي العام، مطبعة المنارة- هەولێر، ط١، ٢٠٠٦، ص٨١.

١١٥. عثمان علي حسن، المصدر السابق، ص ٨١وما بعدها.

١١٦. عثمان علي حسن، المصدر السابق، ص٣٨-٥٧.

١١٧. بۆ زیاتر بڕوانە: المصدر السابق نفسه، ص ٧٥.

## ١٦- خستنەڕوو و شیکاریی چەند لقێکی تر

یاسای نێودەوڵەتیی هاوچەرخ باس لە چەندین چالاکی دەکات کە پێشتر تەنیا لەلایەن یاسای ناوخۆوە باس دەکران. چەند وێستگەیەك دەخەینە ڕوو کە یاسای نێودەوڵەتی باس و خواسی لە بارەوە کردوون.[١١٨]

- یاسای دەستووری نێودەوڵەتی

ئەم یاسایە باس لە ئەرك و دەسەلاٚت و چۆنیەتی دابەشکردنی دەسەلاٚتەکان دەکات لەنێوان دەزگا جۆربەجۆرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسە تایبەتمەندییەکان و ڕێکخراوە هەرێمیەکاندا.

بە بۆچوونی ئێمە ئەم یاسایە جارێکی تر لەوەدا نویٚ دەبێتەوە کە باس لە ڕێسا هاوبەشەکانی نێوان دەستوورەکانی ناوخۆی دەوڵەتان بکات، جا چ بەهۆی پەیماننامەوە دروست بووبن، یان بەهۆی گوزارشتی ناوخۆییەوە، بواری پشتگیری و یارمەتیدانی نێودەوڵەتی لە بواری یاساییدا بۆ دەوڵەتی جیهانی سێیەم دەکریٚ وەك نموونەیەکی زیندوو بزانین.

ئێستا کۆنسێپتێکی تر بۆ ئەم یاسایە دروست دەبێت بە هۆی ئەو چوونە ناو یەکە فراوان و گەورەیەی کە لەنێوان یاسای نێودەوڵەتی و یاسای ناوخۆدا هەیە، کە گەیشتۆتە ئەوەی (ئەم لقە بە مانایەکی تر خۆی بنوێنێت — دانەر)، بە تایبەت لقێکی نویٚ لە بواری یاسای دەستووریدا دەردەکەویٚ، لەو بوارەدا کە پرینسیپەکانی مافی مرۆڤ و دیموکراسی و دژایەتیکردنی تیرۆر هەیە، کە زۆر ۆرك شۆپ و کۆنگرەی نێودەوڵەتی لەسەر بەستراوە، وەك کۆنگرەی ئەسینای کۆمەڵەی نێودەوڵەتی یاسای دەستووری بەراورد کە لە حوزەیرانی ٢٠٠٧ دا بەسترا، کۆنگرەی سۆربۆن لە مانگی ١٠ ی ٢٠٠٧.[١١٩]

- یاسای بەڕێوەبردنی نێودەوڵەتی

کرۆکی ئەم یاسایە ناساندنی بڕیارە کارگێڕییەکانە، واتە باسکردنە لە گونجاندنی بەرژەوەندیە سیاسییەکان و بەرژەوەندییە گشتیەکانی تر کە ئیدارە لەگەڵ مافەکانی تاك باسی

---

١١٨. بڕوانە، د. محمد طلعت الغنیمی، الأحکام العامة في قانون الأمم (قانون السلام)، منشاة المعارف بالأسکندریة، ص٢٢٥ وما بعدها.

١١٩. بڕوانە جواس حسن رسول، طبیعة الأتحاد الأوروبی، رسالة ماجستیر، کلیة القانون جامعة صلاح الدین، ٢٠٠٧، ص١٧٦.

لەسەر دەكات، جا ئەوانە هاولاَتی یان فەرمانبەر بن، بەمەبەستی پاراستنیان لە دەستێوەردانی حوكم بەسەرداكردن (التدخل التحكمی). لە ئاستی نەتەوە یەكگرتووەكاندا ئەم لقە لە ڕێگەی یاسای خزمەتكردنی مەدەنیی نێودەوڵەتی بەرەوپێش چوو، واتە ڕێساو مەرجەكانی بەكارهێنانی فەرمانبەرانی نەتەوە یەكگرتووەكان و ئاژانسەكانی. هەوەها دادگای دادی ئەورووپی — كە سەیری ناكۆكی نێوان دەسەلاَتەكانی راپەڕاندن دەكات و لەنێوان حكوومەتەكان و پرۆژە تایبەتییەكانی دەوڵەتانی ئەندام، بۆ ئەوەی ئەوە دیاری بكرێت كە ئایا حكوومەت لە دەوڵەتێكی ئەندامدا یاسای پێشێل كردووە، یان دەسەلاَتی خراپ بەكارهێناوە، یان دەسەلاَتی نرخاندن و خەملاَندنی بەزاندووە، بەشداری لەم بوارەدا كردووە.[120]

- یاسای كاری نێودەوڵەتی

ئەم لقەش پێشكەوتووە بەهۆی بوونی ڕێكخراوی كاری نێودەوڵەتی، كە نزیكەی سەدەیەكە هەیەو بەردەوام لە پێشكەوتندایە بەهۆی ئەوەی كە پرینسیپی شارستانی لە بواری كاردا دەگرێتەخۆ بەشێوەیەك كە وێڕای ئەوەی هەر دەوڵەتە فەلسەفەی خۆی هەیەو یاسای كاری هەیە، بەلاَم باوەڕی نێودەوڵەتی بۆ باشكردنی باری ژیان و یەكسانی لە كاردا تا ئاستێكی زۆر پێشكەوتووە و لەم ڕووەوە چەندین ڕێككەوتننامە كراوە. هەروا چەندین ڕێككەوتننامەی تایبەت بەم بوارەو بۆ شرۆڤەكردنی پەیوەندیی كارو خاوەن كاروباری كار هەن.

- یاسای كۆمەلاَیەتیی نێودەوڵەتی (القانون الدولي الأجتماعي)

مەبەست لە یاسای كۆمەلاَیەتی لە سیستەمی یاسای ناوخۆ ئەوەیە كە كۆمەڵە ڕێسایەكی یاسایی دەگرێتە خۆ كە پارێزگاری كۆمەلاَیەتی بۆ هەموو هاولاَتییەك لە دەوڵەتدا بەرجەستە دەكات لە هەر مەترسییەكی كۆمەلاَیەتی كە ڕووبەڕووی كۆمەڵگا دەبێتەوە. وەك پاراستنی لە نەخۆشیەكانی، بەسالاَچوان، بێكاری، تاوانەكان، پاراستنی چینی كرێكاران لە ستەم و زۆری خاوەنكارەكان، دڵنیاییان بەرامبەر بە كارەساتەكانی كارو قەرەبووكردنەوەیان ڕێكخستنی كۆچی كارگەر لە دەوڵەتەوەو هاتنی بۆی و پاراستنیان. بەشێوەیەكی گشتیی ڕێساكانی یاسای كۆمەلاَیەتی پایەكانی ئاسایشی كۆمەلاَیەتی لەناو كۆمەڵگادا پتەو دەكەن. پێشكەوتنەكانی جیهان، گۆڕانی بنەڕەتییان بەسەر یاسای گشتیی نێودەوڵەتیی كلاسیكی دا هێناوە، بەشێوەیەك كە جگە لەلایەنی سیاسی، ئەم یاسایە بوارەكانی كۆمەلاَیەتی و زانستی و ئابووری

---

١٢٠. د. محمد طلعت الغنيمي، المصدر السابق، ص ص ٢٢٦- ٢٢٧.

و.... هتد، دەگرێتەوە کە پێشتر لە دەسەلأتەکانی ناوخۆی دەولەت دەهاتنە ژماردن. لەم ناوەدا چەندین رێککەوتننامەی جۆربەجۆر هاتونەتەئاراوە. هەربۆیە دەکرێ پێناسەی ئەم یاسایە بکەین کە لقێکی نوێی یاسای گشتیی نێودەولەتییە کە رێساکانی بایەخ بە بەدیهێنانی پێداویستییە کۆمەلأیەتییەکانی کۆمەلی نێودەولەتی دەدات و بایەخ بە هەر کارێکی تر دەدات کە بتوانێ ئاسایشی کۆمەلأیەتیی ناو کۆمەلگا بەرجەستە بکات.[121]

ئەم یاسایە لە ئاستی نێودەولەتی بوارەکانی وەك، یاسای پاراستنی کارو نەخۆشیەکان و بەرەنگاربوونەوەی تاوان و پیسبوونی ژینگە و بوارەکانی مولکییەتی ئەدەبی و پیشەسازی و کشتوکالێ و مافە ئابووری و کۆمەلأیەتی و رۆشنبیریەکان و...هتد دەگرێتەوە.

**دووەم: دابەش کردنی یاسای نێودەولەتی لە ڕووی چوارچێوەی جوگرافی**

کاتێ باس لە دابەشکردنی ئەم یاسایە دەکرێت لە چوارچێوەی جوگرافیدا، لەوانەیە لەگەلێ چەمکی نێودەولەتییەکە نەگونجێت کە دەبێ لەسەر هەموو دەولەتان و هەموو کەسە یاساییەکانی تر جێبەجێ بێت، بەلأم لە بواری پراکتیکدا سەرەڕای بوونی ڕێسای لەم جۆرە، ڕێسای تریش هەیە کە لەسەر هەرێمێکی جوگرافی تایبەتدا جێبەجێ دەبێت، بۆیە دەکرێ لەم ڕووەوە یاسای نێودەولەتی دابەش بکەین بۆ[122]:

- یاسای نێودەولەتی (گشتیی): کە بەسەر هەموو کەسەکانی یاسای گشتیی نێودەولەتی جێبەجێ دەبێت بەبێ جیاوازیکردن لەسەر هەرێمێك یان شوێنێکی جوگرافی، واتە یاسایەکی جیهانییەو هۆکاری شوێن ڕۆلی ئەوتۆی تێدا نییە.
- یاسای نێودەولەتی هەرێمی (کیشوەری یان ناوچەیی): کە تایبەتە بە هەرێمێکی دیاریکراو یان کیشوەرێك، وەکو یاسای نێودەولەتیی ئەمریکی، یان ئەوروپی، یان ئیسلامی، یان ئەفریقی، یان عەرەبی و... هتد،

کەواتە یاسایەکی نێودەولەتیی کیشوەری یان هەرێمی هەیە کە سیمایەکی هەماهەنگی و هاریکاری نێوان کەسەکانی ئەو هەرێمە یان سیستەمی سیاسی لێکنزیکیان هەیە، شانبەشانی بوونی یاسای نێودەولەتی (گشتیی)، کە لەوانەیە گرفتێك بێنێتە پێش لەوانە:

١. ئایا بواری کارایی هەریەکە لە یاسای جیهانی و هەرێمی چۆنە؟

---

١٢١. د. محمد منصور الصاوي، أحكام القانون الدولي، دار المطبوعات الجامعة، ص٧٣.

١٢٢. د. أحمد أبو الوفا، المصدر السابق، ص ص٣١-٣٢.

٢.   کاتێ ناکۆکی لەنێوانیاندا هاتەئاراوە، کامەیان لە پێشتر دەبێ.... هتد.

بیروڕای جۆربەجۆر هەیە، بۆ نموونە، هەندێك پێیانوایە کە دەرهاویشتەی هەریەکە لە یاسای نێودەوڵەتی و یاسای ئەوروپی جیاوازن، چونکە دەوڵەتان بەتێپەڕبوونی چەندین سەدە، یاسای نێودەوڵەتییان، پێشخستووە، بۆ بەبەدەنگەوەچوونی چەند پێداویستییەکی گرنگ و چەند مەسەلەیەکی وەك مامەڵەی چوونیەك و پێداویستی لانی کەمی ئەمان و ئاسایش و واقیعیەت و نیەتپاکی بەشدارییان لە بەرەوپێشبردنیدا کردووە، بەلاّم یاسای ئەوروپی، بەپێچەوانەی ئەمەوە بە هۆی پەیماننامەو کاری یاسادانانەوە گەیشتوونەتە هەندێ ئامانجی گرنگ و بەردەوام، بە پلەی یەکەم سروشتێکی ئابووریی هەیە لەسەر زۆربەی ئەو ئامانجانەی کە پێویست بوو جێبەجێ بکرێت ڕێککەوتوون، ئەگەرچی گرفتی قوڵ هەیە لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی بۆ جێبەجێ کردنیان بەهۆی ڕێسای یاسای گشتیی نێودەوڵەتییەوە، لەلایەکی تر هەندێ وادەبینن کە گرنگترین پرینسیپی یاسای ئەمریکی، مافی پەنابەری دیپلۆماسی، سەروەرێتی، پرینسیپی هێشتنەوەی سنووری میراتگری ئیمپریالیزم وەك خۆی، وەکەشتیەوانی لە دەریای نێودەوڵەتی،و دەستنەخستنە ناو کاروباری یەکتر، وەدیاریکردنی بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی،و پیادەکردنی پاراستنی دیپلۆماسیەت....هتد.

بەلاّم لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا دەڵێین کە بالاّدەستی بۆ ئەو ڕێسایانەیە کە سیمایەکی جیهانییان هەیە نەك هەرێمی —ناوچەیی.[١٢٣]

١٢٣. المصدر السابق، ص٣.

## ٥

# سەرچاوەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی

وەزیفەی یاسا لە هەر کۆمەڵگایەکدا بۆ رێکخستنی ئەو پەیوەندیانەیە کە دەکەوێتە چوارچێوەکەیەوە. ئەم رۆڵەش بۆ هەر کۆمەڵگایەك نیشتمانی (ناوخۆیی) بێت یان نێودەوڵەتی وەکیەکە.

پرسیار ئەوەیە کە ئایا ئەو یاسایانە چۆن لە دایك دەبن؟ چۆن گەشە دەکەن؟

لەسەر ئاستی نیشتیمانیدا کە رێکخستن و دامەزراوەیی دەزگاکان هەیە دەڵێین سەرچاوەکان هەژموونگەریین (مصادر سلطوية- sources authorities) واتە لە دەرەوەی چالاکی خەڵك و لەسەرەوە دێن و لە رووی هێزی یاساییەوە هەرەمیین وەك ئەوەی کە یاسای دەستووری هەیە، دواتر یاساو نیزام و رێنمایی و....هتد، کە هێز لە دەستوور وەردەگرن.

لە یاسای ناوخۆدا سەرچاوەی هەندێ رێسا لەو چالاکییە کارگێڕییانە دێت کە حوکمەکانی رووبەروویان دەکرێتەوە، وەك لە دانانی هەندێ گرێبەستی یاسایی کە بۆ رێکخستنی پەیوەندیی لایەنەکان دێتەئاراوە کە رێسای (گرێبەست یاسای لایەنەکانە- العقد شريعة المتعاقدين) هاتۆتەئاراوە.

لە لایەکی تر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەژێر کاریگەریی رەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و...هتد، لە پێشکەوتنی بەردەوامدان، لەمەشەوە پێشکەوتنی بەها کۆمەڵایەتییەکان لە کات و کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا دێتەپێش، ئەم گۆڕانەش هانمان دەدات کە گۆڕان لە یاساکان بێتەدی، یان لە رێگەی یاسادانانەوە، یان بەهۆی چالاکییە دادوەرییەکان، کە رۆڵی گرنگ دەبینن نەك هەر لە سیستەمی ئەنگلوسکسۆنی common law بەڵکو لە سیستەمی لاتینی civil lawیشدا.

بەلاَم لە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتیدا، ئەوا کۆمەڵگای نێودەوڵەتی کە دەوڵەت کارەکتەری سەرەکی و پێکهاتەی بنەڕەتییە، هیچ دەسەلاَتێ جا دەستووری بێ یان تەشریعی لەسەرووی دەسەلاَتەکانی دەوڵەتەوە نییە، لەسەرووی خواست و ڕەزامەندی ئاشکراو پەنهانی دەوڵەت ڕێسای یاسایی لەسەر فەرزبکات، بەڵکو لەم کۆمەڵگایەدا ئەوا چەمکی هاوتەریبی (شانبەشانی - هاوسێیەتی) سەروەرییەکان (تجاور فی السیادات) هەیە کە لە ڕێگەیەوە دەتوانین بە سەرچاوەی یاسای نێودەوڵەتی بگەین. لەلایەکی تر مەسەلەیەکی لۆژیکی گرنگە کە بزانین سەرچاوەی ڕێککەوتن (وەك پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان) پێشەنگی سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتییە، لەگەڵ ئەمەشدا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بەرەو دەستەبەرکردن و دانانی سەرچاوەی بالاَدەسەلاَت لەم یاسایەدا ڕۆیشتووە کە هەر ئەمەش هاندەری سەرەکی دروستبوونی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بووە.[١٢٤]

بەگشتی دوو چەمکی جیاواز سەبارەت بە فیکرەی سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتی هەیە، کە ئەوانیش چەمکی دانراوە (المفهوم الوضعي) و چەمکی بابەتی (المفهوم الموضوعي)یە.[١٢٥]

### ١- چەمکی دانراو:

لەم چەمکەدا بەیەکگەیشتن و ڕێککەوتنی خواستەکان تەنیا سەرچاوەی یاسای نێودەوڵەتییە، کە بەشێوەیەکی ئاشکرا پەیماننامەمان هەیە، بە شێوەی پەنهانیش عورف هەیە. ئەمانە لە یەککاتدا هەم دروستکەری ڕێسای نێودەوڵەتین و ملکەچی ئەم ڕێسایەشن.

### ٢- چەمکی بابەتی:

لێرەدا جیاوازی لەنێوان سەرچاوەکانی دروستکردنی یاساو (المصادر المنشئة)، سەرچاوە شکڵییەکانی یاسا دەکرێت، یەکەمیان سەرچاوە ڕاستەقینەکانی یاسا دەگرێتەوە کە (سەرچاوە ماددییەکانی وەك رای گشتیی، ویژدانی بەکۆمەڵ، بیرۆکەی دادپەروەری، باوەڕهێنانی یاسایی، هاریکاری، هەستکردن بە پەیوەندیبوونی کۆمەلاَیەتی و....هتد) بەهۆی کۆمەڵێ لە وەقائعی ماددی وەك پێداویستی ئابووری، ڕێکخستنی سیاسی...هتد، چەمکی نموونەیی ئایدیایی وەك

---

١٢٤. د. محمد سعيد الدقاق، مصادرالقانون الدولي، من كتاب- القانون الدولي العام، د. محمد سامي عبدالحميد، ود. محمد السعيد الدقاق، أبراهيم أحمد ضيفة، منشأة المعارف بالأسكندرية، ٢٠٠٤، ص٧,٦.

١٢٥. شارل روسو، القانون الدولي العام، ترجمة شكر الله خليفة وعبدالمحسن سعد، الأهلية للنشر والتوزيع، بيروت، ١٩٨٢، ص٣١.

بیروکاری سوننەتی- تقالید-، بیروباوەڕ، پێداویستییە کۆمەلآیەتی و نیشتیمانییەکان..هتد) دەگرێتەوە، ئەم سەرچاوە مادیانە پەیوەندییان هەیە بە زانستی کۆمەلآیەتیی یاسایی و فەلسەفەی یاسا، نەوەك بە یاسای دانراو. بەلاّم دووەمیان سەرچاوە شکلّییەکان (پەیماننامەو داب) یاسا دروست ناکەن، بەلّکو تەنیا ڕۆلّی دارِشتنەوە دەبینن.

بە گشتیی هەر ڕێسایەکی یاسایی دوو جۆر سەرچاوەی هەیە، سەرچاوەی سروشتیی ناڕاستەوخۆ کە ئیلهامی لێوەردەگیرێ و ڕێسای روحی پێ بنیات دەنێ و هۆی وجودی لێوە سەرچاوە دەگرێ، وەك پێویستی ژیان لە لایەنی کۆمەلآیەتی و ئابووری و پرینسیپەکانی عەدالەت و هەستکردن بەهاریکاری لەنێوان تاکەکانی ڕەگەزی مرۆڤایەتی و...هتد. سەرچاوەی دانراوی ڕاستەوخۆ کە ڕێسای روالّەتی بوون وکیانی دەرەوەی لێ وەردەگرێ.

بەم شێوەیە سەرچاوەی بنەڕەتیی رەسمی (ئەسلّی) کە ڕێسای یاسایی پێ دیاری دەکرێ، سەرچاوەی نارەسمی— یاریدەدەر هەیە کە دەلالەتی پێ دەکرێ لە بوونی ڕێساو بواری جێبەجێکردنەوە.

لە دوو سەرچاوەی دانراودا بەدوو دەقی ڕوون سەرچاوەکانی یاسایی نێودەولّەتی خراونەتە ڕوو:

**یەکەمیان** ماددەی حەوتەم لە ڕێککەوتننامەی لاهای لە ١٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٠٧ سەبارەت بە دامەزراندنی دادگای دادی نێودەولّەتیدا هاتووە، کە ئەو سەرچاوە یاساییانە باس دەکات کە بۆ جێبەجێکردن دەشێن لەلایەن ئەم دادگایەوەو دەلّێت (ئەو مەسەلەیەی کە بەدەق هاتووە لە ڕێککەتننامەیەکدا لەنێوان دوو دەولّەت، ئەوا دادگا بە ئەحکامەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە پابەند دەبێت. ئەگەر ئەم ڕێککەوتننامەیە دەقێکی گونجاوی تێدا نەبوو، ئەوا دادگا ڕێساکانی یاسای نێودەولّەتی جێبەجێ دەکات.و ئەگەر ڕێسایەکی دانپێدانراو نەبوو ئەوا بەگوێرەی پرەنسیپە گشتییەکانی ماف و دادوەری حوکم دەکات).

بەهۆی ئەوەی ئەم دادگایە نەهاتە واری جێبەجێکردنەوە، ئەوا ئەم پۆلێنکردنە بۆ سەرچاوەکانی یاسای نێودەولّەتی تەنیا بەهایەکی فیقهی هەیە.

**دووەمیان** ماددەی ٣٨ لە نیزامی دادگای دادی هەمیشەیی نێودەولّەتی لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٠، کە بە تەواوی لە ماددەی ٣٨ لە دادگای دادی نێودەولّەتی کە بەشێکی بەلّێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانە لە٢٦ /١٩٤٥/٦. ئەو دەقە دەلّێ:

دادگا ئەمانە جێبەجێ دەکات:

١. ڕێککەوتننامە نێودەولّەتییە گشتی و تایبەتییەکان کە ڕێسای دانپێدانراوی نێوان دەولّەتە پێکناکۆکەکان دەگرنەخۆ.

٢. عورفی نێودەوڵەتی.
٣. پرینسیپەکانی یاسای گشتیی کە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان دانی پێدانراوە.
٤. بڕیارەکانی دادگاو ڕێبازی گەورە یاسازانان، بە هۆی تری دیاریکردنی ڕێساکانی یاسا دادەنرێت.
٥. ئەم دەقە ڕێگر نییە لەوەی دادگا دەسەلاّتی حوکمدانی هەبێت، ئەگەر لایەنەکان ڕازی بوون بە گەڕانەوە بۆ پرینسیپەکانی دادوەری و ویژدان.

کەواتە دوو سەرچاوەی سەرەکیمان هەیە بۆ یاسای نێودەوڵەتی:

أ- **سەرچاوە فەرمییەکان:**

کە بریتین لە پەیماننامە و عورفە نێودەوڵەتییەکان، بنەماکانی یاسای گشتیی کە بە سەرچاوەی ڕاستەوخۆ دادەنرێن بۆ دروستکردنی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی.

ب- **سەرچاوە یارمەتیدەرەکان:**

کە بریتین لە حوکمی دادگاکان و بۆچوونی یاسازانەکان و پرەنسیپەکانی دادو ویژدانی.

## یەکەم: سەرچاوە فەرمییەکان

ئەو ڕێسا یاساییانەی کە بوونیان هەیە، لایەنی پەیوەندیدار بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکان ڕاستەوخۆ پەنایان بۆ دەبات، لە پێش سەرچاوەکانی ترەوە دێن. ئەم ڕێسایانە خاسیەتی سەراپاگیرو گشتگیریان هەیە و ڕەزامەندییان لەسەرە، دەتوانن ببن بە ڕێسای یاسایی نێودەوڵەتی، ببن بە ڕێسای پابەندکار. بەم شێوەیە باس لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی و عورفی نێودەوڵەتی و پرەنسیپە گشتییەکانی یاسا دەکەین.

أ- **پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان:**

پەیماننامە سەرەکیترین سەرچاوەی یاسای نێودەوڵەتییە و بەم شێوەیە دەیخەینە ڕوو:

**١- پێناسەو ناساندن**

پەیماننامە هەرچۆنێك بێت لەوە دەرناچێ کە گوزارشتە لە ڕێککەوتنی نێوان کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی کە دەیانەوێت کارێکی یاسایی لێبکەوێتەوە.[١٢٦]

---

١٢٦. شارل روسو، المصدر السابق، ص٣٤.

پەیماننامە، بەگرنگترین سەرچاوەی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی دەژمێررێت، سەرجەم ئەو ڕێسا یاساییە نێودەوڵەتییانە دەگرێتەوە کە حوکمی سیستەمی بەستن و مەرجەکانی جێبەجێکردنی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان دەگرێتەوە لەگەڵ چۆنیەتی هەڵوەشانەوەیان کە لە ڕێککەوتننامەی ڤیننا بۆ یاسای پەیماننامەکان لە ٢٣/أیار/١٩٦٩ دا هاتووە.

بڕگەی یەکەم لە ماددەی (٢)ی ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٦٩ی ڤیننا پێناسەی پەیماننامە بەم شێوەیە دەکات: مەبەست لە پەیماننامە ڕێککەوتنێکی نووسراوی نێودەوڵەتییە لەنێوان دوو دەوڵەت یان زیاتردا، کە بۆ ڕێساکانی یاسای نێودەوڵەتی ملکەچ دەکات کە لە نووسراوێکی رەسمیدا یان زیاتر هاتبێت و هەر ناوێکی لێ نرابێت.

برگەی دووەم لە ماددەی (١) لە یاسای پەیماننامەی عێراقیدا هاتووە کە مەبەست لە پەیماننامە بەیەکگەیشتنی ئیرادەی دوو کەس یان زیاتری نێودەوڵەتییە ((کە لە بڕگەی (١) داهاتووە)) بە شێوەیەکی نووسراو بە مەبەستی بەجێهێشتنی شوێنەوارێکی یاسایی کە بۆ ئەحکامەکانی یاسای نێودەوڵەتی ملکەچ دەبێت، جا ناولێنانی ئەو نووسراوە هەرچییەك بێت، وەك: پەیماننامە، ڕێککەوتننامە، ڕێککەوتن، پڕوتوکۆل، بەڵێننامە، یان پەیمان، یان کۆنووسی هاوبەش، یان یاداشتنامە، یان نامە و نووسراوی ئاڵوگۆڕکراو، یان هەر ناوێکی تر ئەگەر مەرجەکانی ئەم بڕگەیەی تێدا بوو.

بەڵام ئەم ڕێککەوتنامانە، بە ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی ناژمێردرێن:

١. ئەو ڕێککەوتننامانەی لەگەڵ هۆزو گەلان دەبەسترێن.
٢. گرێبەستی هاوسەریی ئەندامانی خێزانی پاشاو فەرمانڕەوایان.
٣. ڕێککەوتننامەی نێوان دەوڵەت و تاکی بێگانە، یان نێوان تاکەکانی بێگانە.
٤. ڕێککەوتننامەی نێوان ڕێکخراوەکان و ڕێکخراوە ناحکومییەکان.
٥. ڕێککەوتننامەی نێوان ئەو هەرێمانەی کە سەربەخۆییان نییە.
٦. ڕێککەوتننامەی نێوان بزووتنەوەکانی ئازادیخواز یان بەرگری یان یاخیبووان.
٧. ڕێکەتننامەی نێوان کۆمپانیا نیشتمانی و بێگانەکان.
٨. ڕێککەوتننامەی نێوان دەوڵەت و دەوڵەتێکی تر کە بۆ کڕینی دەزگاو کەل وپەلی تایبەت دەبەسترێ، واتە ئەو گرێبەستانەی کە وەك کەسێکی یاسایی نێودەوڵەتی نابەسترێ.

بەڵام ئەم ڕێککەوتننامانە بە ڕێککەوتننامە دەژمێررێن:

١. ڕێککەوتننامەکانی نێوان دەوڵەتانی کۆمۆنوێڵسی بەریتانی.
٢. ڕێککەوتننامەی ئایینیی نێوان پاپاو دەوڵەتانی کاسۆلیك.

٣. ڕێککەوتننامەی نێوان دەوڵەت و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان.
٤. ڕێککەوتننامەی نێوان دوو ڕێکخراوی نێودەوڵەتی.

## ٢- تایبەتمەندییەکانی پەیماننامەی نێودەوڵەتی

لە چەند خاسیەتێکدا خۆیان دەنوێنن کە ئەمانەن[١٢٧]:

١. کرۆکی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان بریتییە لە بەیەکگەیشتنی ئیرادەی دوولایەن یان زیاتری کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی، کە دەبێ ئەو پەیماننامەیە نووسراو بێت. ئەم خاسیەتەش لە عورف و ڕێککەوتنی جێنتلمانی جیای دەکاتەوە.

٢. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك پێیانوایە کە دەکرێ پەیماننامە لەسەر بنەمایەکی زارەکی دروست بێت و شتێك نییە لە یاسای نێودەوڵەتی کە شکڵی پەیماننامە ڕێکبخات. لێ ئەوەی لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا ماددەی (٢ بڕگەی أ) ئاماژەی پێکراوە تەنیا بۆ ئەوەیە لە گرفتی ناڕۆشنی و جیاوازی لە شیکردنەوەدا ڕزگارمان ببێ. کەواتە پەیماننامە دەقێکی یاسایی دووقۆڵی یان بەکومەڵە کە دەوڵەتان یان ڕێکخراوەکانی نێودەوڵەتی لەنێوان خۆیاندا دەیبەستن و بەرفرمانی حوکمەکانی یاسای نێودەوڵەتییە. کەواتە پەیماننامە ڕێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتییە، جاری وایە دەگوترێ ڕێککەوتننامە Convention، یان ڕێککەوتن Accord، یان پەیمان- میثاق Chart، یان پەیڕەو Statue، یان لێدوان (ڕاگەیاندن)ی هاوبەش Joint Declaration، یان یەکلاکردنەوەی کاتی (Modus vividness)، یان سیستەمی بنەڕەتی، یان پەیمان pact، یان پروتۆکۆڵ protocol و... هتد.

٣. ڕێککەوتننامە لەنێوان دوو کەس یان زیاتری کەسەکانی یاسای نێودەوڵەتی دەبێت. لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ماددە (٣)ی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بکەین کە تیایدا هاتووە ئەم پێناسەیەی کە لە ماددەی یەکەمدا هاتووە، لەگەڵ ئەو ڕێککەوتننامانەی کە لەنێوان دەوڵەت و کەسەکانی تری یاسای نێودەوڵەتی دەبەسترێ، یان لەگەڵ ئەو ڕێککەوتننامانەی کە شێوەیەکی نووسراو بەخۆوە دەبینن کاریگەریی لەسەر نابێ:

- بەهای یاسایی ئەو ڕێککەوتننامانە.

---

١٢٧. د. محسن أفكيرين، المصدر السابق، ص٣٢ وما بعدها.

- له ڕووی شـوێنی جێبـەجێکردنی هەریەکـە لـەو ڕێسـایانەی کـە ئـەم ڕێککەوتنـە دەیگرێتە خۆ لەسەر ئەو ڕێککەوتننامەیە بەو پێیـەی کـە ڕێسـای یاسـای نێودەوڵەتییـە جـا سەرچاوەکەی هەر چییەك بێت.
- ڕووی جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکـە بەنسـبەت ئـەو پەیوەندییـەی کـە لـەنێوان دەوڵەت و کەسە یاساییەکانی ترەوە هەیە.
- دەبێ بابەتی پەیماننامەکە ملکەچی ئەحکامەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتی بێت.

## ٣- پەیماننامە: هاوواتاو جۆرەکانی

زاراوەو گوزارشتە بەکارهاتووەکانی تایبـەت بـە پەیماننامـە زۆر و هەمـەجۆرن، لـە ڕووی پەیوەندیی و وێکچوون وجیاوازییانەوە، پولێنکردن و جۆرەکانیان بەم شێوەیە دەخەینە ڕوو[١٢٨]:

**یەکەم: هاوواتاکانی پەیماننامە**

پەیماننامە، چەند شێوەی هەیـە لـە ڕووی نـاوو شـێوەوە کـە لـە دەوری یـەك مانـا دەخولێنەوە لەوانە:

١- پەیماننامە (المعاهدة - Treatment) واتە ڕێککەوتنی نێوان دوو دەوڵەت یان زیاتر بۆ دیاریکردنی ماف و ئەرکەکانیان، یان بۆ چارەسەری کێشـەیەك یـان بـۆ پەیوەنـدیی لەگـەڵ یەکدیکردن، یان بۆ دانانی ڕێساو سیستەمێك کە دەوڵەتان پەیمان بدەن ڕێزی لێ بگرن و کـاری پێ بکەن. پەیماننامە بە پلەی یەکەم ڕێککـەوتنی لایەنـە نێودەوڵەتییەکانـە، ئەگەرچـی ئـەم ڕێککەوتننامانە ناوی جۆراوجۆرو شێوازی هەمە چەشنە و مەبەستی هەمەجۆریان هەبێت. بـۆ دیاریکردنی کرۆکی ئەم چەمکە بەشێك لە یاساناسان دەڵێن ئەم وشـەیە بەسـەر هـەموو ئـەو ڕێککەوتننامانەدا جێبەجێ دەبێت کە تایبـەتن بـە مەسـەلەیەکی گـرنگ، وەك پەیماننامـەی هاوپەیمانێتی، ئاشتەوایی و بازرگانی.

پەیماننامە بە مانـا تایبەتییەکـەی بـەو ڕێککەوتننامـە نێودەوڵەتییانـە دەگوترێـت کـە سیمایەکی سیاسییان هەیە و گرنگن وەك پەیماننامەی دۆستایەتی و هاوپەیمانێتی.

---

١٢٨. د. محمد المجذوب، الوسيط في القـانون الـدولي العـام، المصـدر السـابق، ص٤٨٨ ومـا بعـدها. د. السـيد مصطفى أحمد أبو الخير، المبادئْ العامة في القانون الدولي المعاصر، أيتراك للطباعـة والنشـر، ط١، ٢٠٠٦، ص ص٦-٧.

٢- ڕێککەوتننامانە (اتفاقیة – Convention) ئاسان نییە پەیماننامەو ڕێککەوتننامە لێکجیابکرێنەوە. ماددەی ٣٨ی نیزامی دادگای دادی نێودەوڵەتی وەك هاوواتای پەیماننامە، باس لە ڕێککەوتننامە دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك دەڵێن ڕێککەوتننامە لەم بارانەدا بەباشتر لە پەیماننامە دادەنرێت:

- کاتێ یەکێ لە لایەنەکان ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی بێت، چونکە بەستنی پەیماننامە پێویستی بە مایەی خۆتێکردنی سەرۆکی دەوڵەت هەیە، ڕێکخراوەکان سەرۆکی لەم چەشنەیان نییە. بۆیە ئەو پەیماننامانەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان و لقەکانی دەیبەستن، ڕێککەوتننامەیان پێ دەوترێت.
- کاتێ باسی ڕێککەوتننامەیەکی بەکۆمەڵ دەکرێت کە ڕێسای یاسایی نێودەوڵەتیی تێدا بێت، وەکو ڕێککەوتننامەی لاهای سەبارەت بە یاسای جەنگ و یەکلاکردنەوەی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان، ڕێککەوتننامەکانی ژنێڤ سەبارەت بە بوارە جۆربەجۆرەکان.
- کاتێ باس لە ڕێککەوتنەکانی بواری ئابووری دەکرێت، وەك ڕێککەوتننامە گومرکییەکان.
- ڕێککەوتننامە بەو ڕێککەوتننامە فرەلایەنە دەگوترێت کە هاریکاری نێوان دەوڵەتان ڕێکدەخا و دەیەوێ سازییەکی یاسایی بۆ ئەو مەسەلانە دروست بکات کە جێی بایەخی کۆمەڵی نێودەوڵەتیین.

### ٣- ڕێککەوتن، پێکهاتن (اتفاق- Accord)

مانای زمانەوانیی – ڕێککەوتن- واتە کۆدەنگی بۆچوون و تێگەیشتن لەسەر خاڵێك یان مەسەلەیەکی دیاریکراو. بە زمانی یاسایی واتە ئەو هەڵسوکەوت (ڕەفتار)ەی کە دوولایەن (یان زیاتر) بە ڕەزامەندی خۆیان دەیگرنەبەر کە ئامانجی هاتنەئارای دەرئەنجامێکی یاسایی بێت لەنێوانیاندا. ئەمەیان شێوەو مەبەستی جیاوازی هەیە، کە دەکرێ لەنێوان دەوڵەتان، یان دەوڵەت و ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی بێت، یان لەنێوان ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا بێت، یان دەوڵەت و تاك، یان لەنێوان تاکەکاندا بکرێ. دەکرێ ڕێککەوتنێکی هەرێمی، یان بازرگانی، یان پیشەسازی، یان ڕۆشنبیری بێت، هەروەها دەکرێ بەو شێوەیە ببەسترێ کە پەیماننامەی پێ دەبەسترێت یان بەهەر شێوازێکی تر. کەواتە زیاتر بۆ ئەو هاوپەیماننامە دوو قۆڵییانە بەکاردێت کە سیمایەکی هونەرییان هەیە.

**٤- وێڕای پەیماننامە و ڕێککەوتننامە و ڕێککەوتن چەند زاراوەیەکی تر هەن وەك:**

١. پەیمان (العهد – Pact): بەو ڕێککەوتننامانە دەگوترێت کە گرنگییەکی تایبەتییان هەیەو دەیانەوێ پیرۆزییەکی پێ بدەن، (نمونە پەیمانی کۆمەڵەی گەلان).

٢. بەڵێننامە (الميثاق- Chart) زیاتر بەو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییانە دەگوترێت کە شێوازێکی دەستووری و ڕێکخستنیان هەیە، کە زێتر بۆ دروستبوونی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بەکاردێت.

٣. پەیڕەو (النظام- Statue)کە بەو پەیماننامەیە دەگوترێت کە شێوازێکی دامەزراوەیی هەیە و زێتر بۆ دروستبوونی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان بەکاردێت، وەك نیزامی بنەڕەتی دادگای دادی نێودەوڵەتی.

٤. گرێبەست (العقد- Act) بەو پەیماننامانە دەگوترێت کە ڕێسای یاسایی دادەنێن.

٥. جاڕنامە- بەیان (الاعلان – البيان) وەك ڕاگەیاندنە نێودەوڵەتییەکان.

٦. پرۆتۆکۆڵ (Protocol): زاراوەیەکە بۆ کاروباری جۆراوجۆر بەکاردێت، کە دەیەوێت ڕێسای یاسایی دابنێ یان پەیماننامەیەك جێبەجێ بێت یان هەموار بکرێت یان شی بکرێتەوە یان تەواو بکرێت. یان بە گوتاری ڕەسمی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی دەگوترێت.

٧. یەکلاکردنەوە (التسوية- Arrangement): ئامرازێکی دیپلۆماسییە دەیەوێ ڕێگای کارکردن بە پەیماننامەیەکی گشتیی پێشوو ئەنجام بدات، یان پەیڕەوێکی نوێ دابنێت.

٨. ڕێککەوتنی کاتی (Modus vividness)

٩. لێدوان، جاڕدان (ڕاگەیاندن - Decleration): بەو ڕێککەوتننامانە دەگوترێت کە جەخت لەسەر پرینسیپێکی یاسایی یان سیاسی هاوبەش دەکەنەوە. وەك لێدوانی ئەتڵەنتیی ڕۆزفلت و چەرچل.

لە ڕاستیدا ئاسان نییە، جیاوازی لەنێوان ئەم چەمکانەدا بکرێ، چونکە لە جیاوازیی ناوەکاندا هیچ ئەنجامێکی پراکتیکیمان دەست ناکەوێت، زۆربەی یاساناسان لەسەر ئەوە کۆکن کە دەڵێن: ئەم زاراوانە یەك واتایان هەیە و حەزو ئارەزووی هەندێ سیاسەتمەدارە کە دەیانەوێ ناوی جیاجیایان لێ بنێن یان گەمە بە زراوەکان بکەن. ئەگەرنا دەکرێ هەموو ئەم زاراوانە بۆ جێبەجێکردنی ئەوکردارە یاساییە بەکاربێن، هەر هەمووشیان هەمان هێزی پابەندکارانەیان هەیە.

**٥- رێككــەوتنی شــێوە ســاكار ((الاتفــاق ذات الشــكل المختصــر أو المبســط))، رێككەوتننامەی ڕاپەراندن:**

پەیماننامە نێودەوڵەتییەكان لە رێگای سەرۆكی دەوڵەتەوە بە شێوەیەكی فەرمی دەبەسترێن. بــەلاّم ئــەم ڕێككەوتنــە شــێوە ســاكارە لــە رێگــەی وەزارەتــی دەرەوە، یــان نوێنــەرە دیپلۆماسییەكانەوە گرێ دەدرێن بەبێ مایەی خۆتێكردنی سەرۆكی دەوڵەت.

ئەم رێككەوتنە كە بە چەمكی ئەمریكی Executive agreementی پێ دەگوترێت بــەم خاسیەتانە دەناسرێتەوە[129]:

١. خێرایی ئەنجامدان، چونكە بە هەنگاوەكانی دانوستان و واژۆكردنی ئەنجام دەدرێـت، زۆرجار بە نامە، یان بەیاننامە، یان یاداشتێك، یان راگەیاندنێكی تۆماركراو دەردەچێت و بە سەرجەم ئەو هەنگاوانەدا ناڕوات كە بەگشتی پەیماننامەی پێدا تێدەپەرێت، بەڵكە تـەنیا بــە واژۆكردن و قبوڵكردن یان ڕەزامەندی Approbation دەچێتە واری جێبەجێكردنەوە، بـەبێ گەڕانەوە بۆ دەسەلاّتی ڕاپەراندن.

٢. ئەم جۆرە رێككەوتنە ئێستا زۆر بەكاردێت بە تایبەتی لە بواری ئیداری و هونەری و پەیوەندیی دیپلۆماسی و سەربازی و ئاگربەست و وەستانی شەڕو ڕێككەوتنی شێوە تەكنیكی (وەك گومرگی هەوایی و پۆستە). زۆرجار دەستووری ولاّتان ئەم رێككەوتننانە دیاریدەكات.

٣. دەكرێ ئەم رێككەوتنە خاسیەتی دوالیزمی هەبێ، بۆ لایەنیك پەیماننامــە بــێ و بــۆ لایەكەی تر ڕێككەوتنی شێوە ساكار بێ.

٦- ڕێككــــەوتنی شــــەرەف یــــان جێنتلّمــــانی (اتفــاق الشــرف - Agreement Gentleman): رێككەوتننامەیەكی نێودەوڵەتییە بێ هـیچ ئیلتیزامـاتێكی یاسـایی كـە یاسانسی ئەنگلۆسكسۆنی پێی دەڵێ ئیلتزاماتی شەڕەف و هیچ پابەندبوونێكی یاسایی بـۆ لایەنەكان تێدا نییە. بەلاّم لە ڕووی مەعنەوییەوە، لایەنەكان بەیەكەوە پەیوەسـت دەكـات. نموونە: بەڵێننامەی ئەتڵەسی یان ڕاگەیاندنی ئەمریكی – بەریتانی لە لایەن رۆزڤلت وچەرچل لــە ١٩٤١/٨/١٤ كــە پرینســیپی هاوبەشــی سیاســەتی هــەردوو دەولــەتی گرتــەخۆ. ئــەم رێككەوتننامەیە كە لەسەر شێوەی لێدوانی هاوبەش دێت بۆ دووپاتكردنەوەی پرینســیپێكی یاسایی یان سیاسەتێكی هاوبەشە.

---

١٢٩. بڕوانە – د. عصام العطية، المصدر السابق، ص١٠٨ – ١١١.

لەم بارەدا دەوڵەت بەرپرس نییە ئەگەر سیاسەتی وڵات پێچەوانەی ئەو رێککەوتنە شەرەفییە بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەدەگمەن رێکدەکەوێت لایەنەکان پێچەوانەی ئەحکامەکانی ئەم رێککەوتنە رەفتار بکەن، بە هۆی ئەوەی کە مەسەلەکە پەیوەست دەبێت بە شەرەف و ناوبانگی ئەدەبی ئەو لایەنە لە بواری نێودەوڵەتیدا، بەڵکو سەرۆك و حکوومەت و وەزیری دەرەوەی دەوڵەتان پابەند دەبن بە جێبەجێکردنی ئەو رێککەوتنەی کاربەدەستانی پێشەخۆیان مۆری کردووە بۆ پاراستنی سەنگی سیاسەتی نێودەوڵەتیی وڵاتەکانیان بەشێوەیەکی گشتی.

**دووەم: پۆلێنکردنی پەیماننامە**

لە ڕووی شکڵی و بابەتییەوە، چەند دابەشبوونێك هەیە، گرنگترینیان:

أ. لەلایەنی شکڵیەوە: پەیماننامەی دوانەیی (Bilateral) کە لەنێوان دوو کەسی یاسای نێودەوڵەتی دەبەسترێت، پەیماننامەی بەکۆمەڵ- Multi lateral))کە لەنێوان چەند دەوڵەتێکدا دەبەسترێ.

ب. لەلایەنی بابەتییەوە: دابەش دەکرێت بۆ:

١. پەیماننامەی سیاسی: کە رێککەوتنە هاوپەیمانییە سەربازییەکان، هاوکاری هاوبەش و پەیوەندییە دیپلۆماسییەکان- هتد..دەگرێتەخۆ.

٢. پەیماننامەی ئابووری: وەك پەیماننامەکانی بواری کشتوکاڵ و پیشەسازی و راگەیاندن و......هتد.

٣. پەیماننامە لەسەر بابەتی تایبەت: وەك هاریکاری هونەری، ڕۆشنبیری، یاسایی.

ئەم شێوە پۆلێنکردنە لە ڕووی فیقهی و بارودۆخی پراکتیکیەوە هیچ بەهایەکی یاسایی نییە.

أ- لەڕووی سروشت و جێکەوتی یاساییەوە: دابەش دەبن بۆ[١٣٠]:

**١- پەیماننامەی گرێبەست، تایبەت (Trait's- Contracts)**

ئەو پەیماننامەیە لەنێوان دوو دەوڵەت یان ژمارەیەکی دیاریکراودا ئەنجام دەدرێت سەبارەت بە کارێك یان بەرژەوەندییەکی دیاریکراو، تەنیا لایەنەکانی ئەم گرێبەستە پێیەوە پابەند دەبن وەکو پەیماننامەکانی هاوپەیمانێتی و ئاشتەواییکردن و دیاریکردنی سنوورو

---

١٣٠. د. حسن الجلبی، القانون الدولی العام، المصدر السابق، ص٥٤.

بازرگانی و قەرەبووکردنەوە و....هتد. ئەم پەیماننامە تایبەتانە وەك سەرچاوەیەکی ڕێسایی یاسای نێودەوڵەتی گشتیی ئەژمار ناکرێن، بەڵکو دەکرێ وەك هۆیەکی ناڕاستەوخۆ بۆ جێگیربوونی ڕێسایەکی نێودەوڵەتی بن، ئەوەش لە بارێکدا ئەگەرهاتوو ئەم جۆرە گرێبەستە تایبەتە لەسەر بابەتێك لەنێوان چەند دەوڵەتێکدا دووبارە بۆوە و ببێتە عورفێك کە دەوڵەتان پێیەوە پابەند بن و پابەندێتی لە عورفەکە وەربگرن. نموونە: ڕێسای رادەستنەکردنەوەی پەنابەرە سیاسییەکان کە بە بەردەوامی لە پەیماننامە تایبەتییەکاندا دووبارە بۆتەوە، سەرئەنجام بوو بە عورفێکی نێودەوڵەتی.

**٢- پەیماننامە دانەریەکان-گشتییەکان (الشارعة - Traits Lois)**

ئەم جۆرە پەیمانە لەنێوان کۆمەڵە دەوڵەتێکدا دەبەسترێت و تیایدا لەسەر دروستکردنی چەند ڕێسایەکی گشتیی یان سیستەمێك ڕێکدەکەون کە هەموو دەوڵەتان پێیەوە پابەند دەبن بەو دەوڵەتانەشەوە کە تیایدا ئەندام نین، واتە تەنیا بەسەر ئەو بارەدا جێبەجێ نابێت کە لە پێناویدا دروستکراوە، بەڵکو بەسەر هەموو حاڵەتێکی ئایندەیشدا جێبەجێ دەبێت. ئەم پەیماننامەیە وەك یاسای ناوخۆ وایە چونکە ڕێسای یاسایی دادەنێت و بەم پێیە سەرچاوەیەکی سەرەکی یاسای نێودەوڵەتیی گشتییە. نموونە: وەك پەیماننامەی ژنێڤ بۆ یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی، بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان..هتد.

لێرەدا هەم ئەو دەوڵەتانەی کە ئەم ڕێککەوتننامەیان پەسەند کردووە، پێیەوە پابەند دەبن، بەو دەوڵەتانەشەوە کە نەچوونەتە ناویەوە وەکو ئەوەی نەریتێکی نێودەوڵەتیی بێت، پێیەوە پابەند دەبن.

**٤- بەستنی پەیماننامە**

ئەو هەنگاوانەی کە پەیماننامەیان پێ دێتە ئاراوە لە دەستووری دەوڵەتاندا، یان لە هەندێ ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی یان لە عورفی نێودەوڵەتیدا هەن. زۆربەی دەوڵەتانی جیهان ڕێککەوتننامەی ڤیێننا بۆ یاسای ساڵی ١٩٦٩ی پەیماننامەکانیان واژۆکردووە. بەشێوەیەکی گشتیی هەنگاوەکان دەکرێنە چوار قۆناغ، ئەوانیش بریتین لە: گفتوگۆ، دانوستاندن (المفاوضات- Negotiation)، نوسین و واژۆکردن (التحرير والتوقيع)، پەسەندکردن (التصديق)، تۆمارکردن (التسجيل).[١٣١]

---

١٣١. بڕوانە: د. احمد ابو الوفا، القانون الدولي والعلاقات الدولية، دار النهضة العربية، القاهرة، ٢٠٠٦، ص٥٤ وما بعدها، د. محمد عبدالحميد ود. مصطفى سلامة حسين، قانون الدولى العام، مركز الكتب الثقافية

**یەکەم:** گفتوگۆ، دانوستاندن (Negotiation)

ئامرازی قۆناغی ئالۆگۆڕی ڕاوبۆچوونە لەنێوان نوێنەرانی دوو دەوڵەت یان زیاتر بە مەبەستی یەکخستنی بۆچوونەکان و هەوڵدان بۆ گەیشتنە چارەسەرو ڕێکخستنی باس و بابەتەکە و دانانی ڕێوشوێنی چارەسەرو ڕێکخستنی ئەو شتانەی ڕێککەوتننیان لەسەر کراوە بەشێوەی ماددە. لە زۆربەی حاڵەتدا وەزیری دەرەوە، یان نوێنەرگەلی دیپلۆماسی، یان سەرۆکی دەوڵەت خۆی دانوستان دەکات.

**ڕێگەپێدان (التفويض- Pleins Pouvoirs)**

دوای ئەوەی دەوڵەت نوێنەری خۆی بۆ ئەنجامدان و بەستنی پەیماننامەیەك دیاریدەکا، ئەوا دەبێ بەڵگەنامەی ڕێپێدانی بداتێ و لە یەکەم دیمانەی شاندی هەردوو وڵاتدا، دەبێ ئەم بەڵگەنامەیە ئاڵوگۆڕ بکرێت ئەگەر پەیماننامەکە دووقۆڵی بوو، یان لەلای لایەنی چاودێری کۆنگرە دایبنێ، ئەگەر پەیماننامەکە چەندلایەنە بوو.

ماددەی (٢ بڕگەی ج) لە یاسای پەیماننامەکانی ساڵی١٩٦٩ی ڤێننا، بەم شێوەیە پێناسەی ڕێگەپێدان دەکات کە: بەڵگەنامەیەکە لە دەسەڵاتی تایبەتیی دەوڵەت دەردەچێت بۆ دیاریکردنی کەسێك، یان چەند کەسێك تا نوێنەرایەتیی ئەو دەوڵەتە بکەن لە دانوستاندن بۆ گرێدانی پەیماننامەیەك یان قبوڵکردن و چەسپاندنی، یان ڕەزامەندی نیشاندانی دەوڵەت بۆ ئیلتیزامکردن بە پەیماننامەیەك، یان هەستان بەهەر کارێك بەرامبەر پەیماننامەیەك. کەواتە ڕێگەپێدان مەسەلەیەکە بۆ یاسای ناوخۆی هەر دەوڵەتێك دەگەڕێتەوەو هەر کەسێك دەبێتە نوێنەری دەوڵەت لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

١. ئەگەر بەڵگەنامەی ڕێگەپێدانی داواکراوی پێ بوو.

٢. ئەگەر لە بارودۆخەکەدا ئەوە ڕوون بۆوە کە نیازی دەوڵەت وایە ئەو کەسە ببێتە نوێنەری وڵاتەکەی.

٣. سەرۆکی دەوڵەت، سەرۆکی حکوومەت، وەزیری دەرەوە، سەرۆکی نێردراوە دیپلۆماسییەکان و نوێنەرانی دەوڵەت لە کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی یان ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی و نوێنەرانی دەوڵەتەکانیان.

---

للنشر والتوزيع، ١٩٨٨، ص٢٧، ود. محمد سعيد الدقاق، مصادر القانون الدولى، من كتاب القانون الدولى العام، المصدر السابق، ص٢١ وما بعدها.

بڕوانە ماددەی ٧ لە بڕگەی ٥ لە ڕێککەوتننامەی ڤیێننا لە ساڵی ١٩٦٩.

ئەگەر کەسێك هەر کارێکی کردو ڕێگەی پێنەدرابوو لەلایەن دەوڵەتەکەیەوە، ئەوا کارەکەی هیچ جێکەوتێکی یاسایی نابێ، مەگەر دواتر دەوڵەتەکە ڕێگەی پێبدات. ئەو کاتە لەو ڕۆژەی کە کاری کردووە هەڵسوکەوتەکانی مولزەم دەبن، بەو پێیەی ڕێگەپێدانی دواتر وەك ڕەزامەندیی پێشینەیە.

**دووەم: نووسین (پرۆژە)ی پەیماننامە (ڕەشنووس - مسودە)**

ئەگەر وتووێژ گەیشتە پلەی بەیەکگەیشتنی بۆچوونەکان، ئەوا پەیمانەکە دەنوسرێتەوەو لایەنەکان واژۆی لەسەر دەکەن. دەکرێ بڵێین کە نووسینەوەکە بۆتە مەرجێکی کلاسیکی و عورفی نێودەوڵەتی لەسەری راهاتووە.

لەکاتی نووسینی پەیماننامە چەند مەسەلەیەك دێتە پێش کە بریتین لەمانەی خوارەوە[١٣٢]:

- **زمانی پەیماننامە**

گرنگترین روخسارو شێوەی پەیماننامەی نێودەوڵەتی ئەو زمانەیە کە پێی دەنوسرێتەوە. ئەگەر ڕێککەوتنەکە لەنێوان دوو لایەن و بە دوو زمان نووسرابوو، ئەوا هەردوو زمان شوێنەوار (جێکەوتی)ی یاسایی خۆیان هەیە لە کاتی لێکدانەوەو شیکردنەوەدا. بەلاّم ئەگەر ڕێککەوتننامەیەکی چەندلایەنە بوو، ئەوا لەم کاتەدا لەسەر یەکێك لە زمانە ڕەسمییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێکدەکەون کە ئەویش ئینگلیزی و فەرەنسی و رووسی و چینی وئیسپانی و عەرەبین.

- **پێکهاتەی پەیماننامە:**

پەیماننامە لە رووی شێوەو پێکهاتەوە بۆ سێ حاڵەتی ناوخۆیی دابەش دەبێت:

١- ناونیشانی پەیماننامە: لایەنەکان لەسەر ناونیشان ڕێکدەکەون. لە ڕێککەوتننامەی دووقۆڵیدا وێنەی بەڵگەنامەی هەر دەوڵەتەیان، ناوی خۆی لەپێشتر دەنووسێ. نموونە: ڕێککەوتنی عیراق ئێران بۆ ئەو وێنەیەی لای عیراق دەبێت.

**٢- دیباچە (پێشەکی):** پێشەکی پەیماننامەیە و پێویستی دەرچوون — هۆیەکانی (الأسباب الموجبة) بەستنی پەیماننامەو ئامانجەکان و ناوی لایەنەکانی تێدا دەنووسرێت، کە هەندێ جار

---

١٣٢. د. حامد سلطان، المصدر السابق، ص١٦٠ وما بعدها. و د. عصام العطية، المصدر السابق، ص١١٩ وما بعدها.

بەناوی دەوڵەتان، یان ناوی سەرکردەکان، یان ناوی حکوومەتەکان و هەندێ جار بەدەگمەن بەناوی گەلانەوە دەنووسرێت. بەگوێرەی رای پەسەندکراو پێشەکی وەکو ناوەڕۆك و پاشکۆکان، بەشێکە لە پەیماننامەو سیفەتی پابەندکاری هەیە.

**٣- ناوەڕۆك، تێکست (المتن- الأحكام):** شێوەی دەروازەو ماددەو بڕگە بەخۆوەدەگرێ. بۆ نموونە بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە (١١١) مادده پێکدێت و بەسەر ١٩ دەروازەدا دابەشکراوە. ئەگەر بە دوو زمان زیاتر نووسرایەوە، ئەوا باڵایی دەدرێتە یەکێکیان وەك زمانی سەرەکی، هەروەها پەیماننامە بە زمانی هەموو ئەو وڵاتانەی بەشدارییان لە پەیماننامەکەدا کردووە دەنووسرێتەوە و هەمان هێزیان هەیە. لێ باش نییە پەیماننامە بە زۆر زمان بنوسرێتەوە، چونکە ئەستەمە زاراوەی وا لە هەموو زمانەکاندا هەڵبژێردرێ بەشێوەیەك کە هیچ گرفتێك لە شیکردنەوەدا دروست نەکات. لە کاتی هاتنەئارای کێشەو گرفتدا، ئەوا سوود لە وەزیفەی ڕاوێژکاریی دادگای دادی نێودەوڵەتی وەردەگیرێت و ئەم دادگایە ئەو ناڕۆشنی و گرفتانە یەکلادەکاتەوە کە لە شیکردنەوەی ڕێککەوتننامەکانەوە دێنەدی.

**٤- کۆتایی:** چەند کارێکی شکڵی گرنگ دەگرێتەخۆ لەوانە[١٣٣]:

ئەو ڕێکارانەی کە پەیماننامەکە بە هۆیەوە دەچێتە واری جێبەجێکردنەوە:

١. مێژووی جێبەجێکردن.

٢. ماوەی جێبەجێکردن و ڕێگەکانی درێژکردنەوە.

٣. ڕێگەکانی هەموارکردن و چاوپێداخشاندنەوە.

٤. ڕێگەکانی کۆتاپێهێنان.

٥. ڕێگەکانی یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکان کە لە جێبەجێکردن یان شیکردنەوەی پەیماننامەکە دێنەپێشەوە.

٦. زمان.

٧. بەروار و شوێنی ئاڵوگۆڕی بەڵێننامەکان.

٨. ئەو شوێنەی کە پەیماننامە ئەسڵییەکەی پێ دەسپێردرێت، ئەگەر ئەسڵی بوو.

**٥- پاشکۆ (الملاحق):** هەندێ ئەحکامی درێژکراوەو ڕێکخستنی هەندێ کاروباری هونەری وەك (نەخشە) و......هتد دەگرێتەخۆ و هەمان هێزی یاساییان هەیە کە پەیماننامەکە خۆی هەیەتی.

---

١٣٣. بڕوانە ماددەی ١١لە یاسای پەیماننامەکانی عێراق ساڵی ١٩٧٩.

**سێیەم: واژۆکردن**

دوای نووسینەوەی پەیماننامەکـە، قۆنـاغی واژۆکـردن دێتـەپێش کـە مانـای ڕەزامەنـدیی نوێنەرەکان دەگەیێنێ کە لە دەرەنجامی وتووێژەوە هاتۆتـەدی، هـەروەها دیـاریکردنی شـوێن و مێژووی پەیماننامە، واژۆکردنی هیچ ئیلتیزامێکی یاسـایی لەسـەر دەوڵـەت دروسـت ناکـات، بەڵکو تەنیا شێوەیەکی چەسپاندن و سەلماندنی ئەو شتەیە کە وتووێژەکە پێی گەیشـتووە، هـەر شاندێ، پرۆژەکە بۆ دەوڵەتەکەی خۆی دەباتەوە بۆ ئـەوەی قبـوڵ بکـرێ، هـەروەها واژۆکـردن پابەندییەکە بۆ لایەنەکان کە بەنیەتپاکییەوە پێیەوە پابەندبن و هیچ کارێك نەکەن پێچـەوانەی ئەو ڕێککەوتنە بێ کە ئامادەیە بۆ پەسندکردن یان تا دەوڵەت ڕادەگـەیێنێ ئـەو پەیماننامەیـە پەسند ناکات.[١٣٤]

ماددەی ١٢ لە ڕێککەوتننامەی ڤێننا ئەو بارانـەی دیـاری کـردووە کـە واژۆی نوێنـەری دەوڵەت شوێنەواری یاسایی ئیلزامی دەبێت بە پەیماننامە، ئەوانیش:

١- ئەگەر لە پەیماننامەکەدا هاتبوو کە بە واژۆکردن ئەم پابەنبوونە دروست دەبێت.

٢- ئەگەر ئەوە چەسپا کە دەوڵەتانی وتووێژکار، لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون کە واژۆکردن ئەم کاریگەرییەی دەبێت.

٣- ئەگەر لە بەڵگەنامەی راسپاردندا ئەوە هاتبوو کە تەنیا بە واژۆکردنی پەیماننامەکە، دەوڵەت پابەند دەبێت.

٤- ئەگەر نوێنـەری دەوڵـەت واژۆیـەکی کـرد کـە لەسـەر راوێـژکردن بـە دەوڵەتەکـەی وەستابوو، دواتر دەوڵەتەکە ڕێگەیدا بە واژۆکردنەکە و قبوڵێکرد.

بێگومان واژۆکردن جگە لەم سێ حاڵەتە، دەنا پەیماننامە خاسیەتی پابەندبوون وەرنـاگرێ، تەنیا ئەوکاتە نەبێ کە پەسندو قبوڵ بکرێ.

ئەو کەسانەی کە بۆ واژۆکردن بەڵگەی ڕێگەپێدانیان ناوێ بریتین لە: سەرۆکی دەوڵەت، سەرۆکی حکوومەت و وەزیری دەرەوە، بەڵام ئەگەر واژۆکردن لەلایەن سەرۆکی دەستەی نێردراو یان کەسـێکی ترەوە بوو، ئەوا پێویستی بەم بەڵگەیە دەبێ بۆ ئەوەی واژۆکە بدرێتە پاڵ نوێنەری دەوڵەتەکە.

لە هەندێ بـاردا واژۆکـردن بـەپێتی یەکـەمی ناوەکـان دەبێـت، واتـە رێککەوتننامـەی موعەللیم (Initials) و واژۆکردن بەناوی تەواو، کە ئەمانە واژۆی کۆتـایی نابێـت و مـولزەم

١٣٤. د. حامد سلطان، المصدر السابق، ص ص ١٦٢ و ١٦٣.

نابێت، هیچ شتێك نوێنەرەكان ناچار ناكات بۆ واژۆی كۆتـایی، بـەڵكو ئەمـە دەرفەتێكـە بـۆ گەڕانەوەی هەریەكەیان بۆ دەوڵەتی خۆی.[١٣٥]

**چوارەم: پەسندكردن (التصدیق- Ratification)**

پەسندكردن، هەڵسوكەوتێكی یاساییە كە دەسەڵاتی تایبەتمەنـد بـە بەسـتنی پەیماننامـە، ڕەزامەندی لەسەر دەردەبڕێ و قبوڵی دەكات كە پێیەوە پابەند بێت.[١٣٦]

بەمانایەكی تر ڕەزامەندیی دەوڵەتە بەگوێرەی ڕێوشوێنە دەستوورییەكان، واتـە بـەگوێرەی ڕێسای یاسای نیشتمانی كە پابەندبوونی خۆی بەشێوەیەكی كۆتایی پێ ڕابگەیێنێ.[١٣٧]

حیكمەت لە پەسندا ئەوەیە كە لەلایەك دەرفەتێك بدرێتـە دەوڵـەت بـۆ ئـەوەی چـاو بـە پەیماننامەكەدا بخشێنێتەوە، ئەگەر لەگەڵ بەرژەوەندیی وی نەگونجا، یان لەلایەكی دیكە ئەگـەر بارێك بێتە پێشەوەو وا بكات لە بۆچـوونەكانی پاشـگەز بێتـەوە. بـەڵام لەكاتێكـدا دەوڵـەت ئازادیی ڕەهای هەیە كە هەڵوێستی خۆی لە پەسند دیاری بكات، ئەوا ڕەتكردنەوەی پەیماننامە بەبێ هۆ، لەگەڵ لێهاتوویی و پرینسیپی ڕەوشتی گشتیی ناكۆكە، هەروەها كاریگەریی لەسـەر بڕوایی دادەنێت كە داخوا نوێنەرەكە لە سنووری دەسەڵاتی ڕێگەپێدراودا هەڵسوكەوتی كردووە یان نا؟ دەكرێ پەسند شێوازی ئاشكرا یان شاراوە بەخۆوەبگرێ.[١٣٨]

بەگوێرەی پرینسیپی گشتیی، پەسندكردن كاریگەریی بەسەر ڕابردووەوە نییە و ناگەڕێتەوە، كە لە ڕۆژی واژۆكردنەوە كاریگەریی هەبێ، بەڵكو تەنیا لە كاتی ئاڵوگۆڕی پەسندكردنەوە ئەو شوێنەوارەی دەبێ، مەگەر دەقێكی ئاشكرای پێچەوانەی ئەمە، هەبێ.[١٣٩]

**پێنجەم: تۆماركردن (Enregistrement)**

تۆماركردن بۆ دەستەبەركردنی ئامانجی ئاشكراگۆیی دیپلۆماسییە، هەروەها بۆ ڕێگرتن لە بەسـتنی پەیماننامـەی نهێنـی كـە ئاشـتی و تـەنایی نێودەوڵـەتی دەخاتـە مەترسـی و بـۆ

---

١٣٥. د. حامد سلطان، المصدر السابق، ص ١٦٣.

١٣٦. د. محمد سامي عبدالحمید، المصدر السابق، ص ٣٦-٣٧.

١٣٧. د. محمد سعید الدقاق، مصادر القانون الدولي، المصدر السابق، ص ٢٨

١٣٨. د. علی صادق أبو هیف، القانون الدولي العام، المصدر السابق، ص ٥٤٤-٥٤٦.

١٣٩. د. حامد سلطان، المصدر السابق، ص ١٦٣.

چاودێریکردنه که بزانرێ ئەو پەیماننامەیە، پێچەوانەی ڕێسایەکی بەرفەرمان نییە لە ڕێساکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی، سەرەڕای ئەوە تۆمارکردن سەلماندنی پەیماننامە ئاسان دەکات، لە سۆنگەی ئەمەوە بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بە مەرجی گرتووە کە دەبێ پەیماننامە لە لای سکرتاریەتی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان تۆمار بکرێت.

مەبەست لە تۆمارکردن ئەوەیە کە پەیماننامە بە سکرتاریەتی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بدرێ و لە تۆمارێکی تایبەتی تۆمار بکرێ، ئەمەش لە ماددەی ٨٠ی ڕێککەوتننامەی ڤیێننادا هاتووە.

بەهای یاسایی تۆمارکردن لەلای سکرتاریەتی گشتیی ئەوەیە کە هەر پەیماننامەیەك تۆمار نەکرێ بەتاڵ نابێتەوە، بەڵکو دروست و پابەندکارە بۆ دەوڵەتان، بەلاّم ناکرێ لەلای هیچ لقێك لە لقەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان پەنای پێ ببردرێت و بەبەڵگە بهێندرێتەوە. هەروەها دەکرێ پەیماننامە، نهێنی بێت و تۆمار نەکرێت، دیسان ئەمەش بەتاڵ نییە، بەلاّم ناکرێ لە هیچ دەزگایەکی نەتەوە یەکگرتووەکان **بە ئەرگیومێنت دابندرێ**.[140]

**شەشەم: خۆگری (تحفظ)**

ڕێککەوتننامەی ڤیێننا پێناسەی دەست پێوەگرتنی کردووە بەوەی کە ڕاگەیاندنێکی تاکلایەنەیە، دەوڵەتێك لەکاتی واژۆکردنی پەیماننامە، یان پەسەندکردن (تصديق)، یان چوونە ناو، یان لەکاتی قبوڵکردندا پەنای بۆ دەبات، بەو مەبەستەی جێکەوتی یاسایی هەندێ ئەحکام لەکاتی جێبەجێکردندا لەسەر خۆی دووربخاتەوە، یان شیکردنەوەیەکی تر، یان گۆڕانێك یان هەموارنێکی تێدا بکات.

بۆ زانینی شوێنەوارو جێکەوتە یاساییەکانی دەستپێوەگرتن پێویستە جیاوازی لەنێوان هەردوو شێوەی پەیماننامەی دووقوڵی و بەکۆمەڵدا بکەین.[141]

١. لە پەیامننامەی دووقۆڵیدا: دەستپێوەگرتن لەکاتی واژۆکردن یان پەسندکردنیدا دەکرێت. لەم حاڵەتەدا دەستپێوەگرتن وەك خستنەڕوویەکی نوێ وایە بۆ لایەنی بەرامبەرو ئەویش بۆی هەیە پەیماننامەکە بەو (تحفظ)ـەی بۆی زیادکراوە قبوڵ بکات، یان ڕەفزی بکاتەوە.

---

١٤٠. د. سهيل حسين الفتلاوي و د.غالب عواد حوامدة، المصدر السابق، ص ١١١.

١٤١. د.عصام العطية، المصدر السابق، ص١٤٢

٢. لە پەیماننامەی بەکۆمەڵدا: دەکرێ (خۆگری - تخفظ) لەکاتی واژۆکردنی پەیماننامەدا بێت، یان پەسەندکردن، یان چوونە ناویەوە، لەم حاڵەتانەشدا رەواو دروست دەبێت لەگەڵ بابەتی پەیماننامەکە و ئەو مەبەست و ئامانجانەی کە لەپێناویدا دروست بووە بەمەرجێك ناکۆك و دژ نەبێت (وەك بازرگانی نەکردن بەکۆیلە)، هەروەها دەبێ لە پەیماننامەکەدا نەهاتبێ کە نابێ بەشێوەیەکی گشتیی یان لەسەر هەندێ دەقی پەیماننامەکە (تخفظ)ی لەسەر بکرێ.

**٥- هۆیەکانی کۆتاییهێنان، وەستاندن، لە کارخستن و جێبەجێکردنی پەیماننامە**

چەندین هۆ هەیە کە بەکورتی لەم لایەنە گرنگانەی خوارەوەدا کۆدەبنەوە:

**أ. هۆیەکانی کۆتاییپێهێنانی پەیماننامە**

چەند هۆیەك دەبنە هۆی کۆتاییهێنان بە پەیماننامە:

**یەکەم:** پوچەڵبوون — بەتاڵبوونەوە (البطلان)

تیۆریی پوچەڵبوون لە یاسای ناوخۆدا رۆڵی گرنگ دەبینێ و لە یاسای نێودەوڵەتیشیدا گرنگی خۆی هەیە، کە لە خوارەوە هۆیەکان و کاریگەریی و جێکەوتەکانی روون دەکەینەوە:

أ- هۆیەکانی پووچەڵبوون

هۆیەکانی پوچەڵبوون لە یاسای نێودەوڵەتیدا بریتین لە: نەنگی - خەوشەکانی (خەوشەکانی ڕازیبوون — نەنگی لە رەزامەندی)، سەرپێچیی یاسای دەستووری و تێکگیرانی لەگەڵ ڕێسایەکی بەرفەرمانی نێودەوڵەتی[١٤٢]:

١- سەلامەتی خەوشەکانی ڕەزامەندی:

بۆ ڕاست و دروستی ئەنجامدانی پەیماننامە، دەبێ لایەنەکان بە ئەحکامەکانی پەیماننامە رازی بن و ئارەزووی پابەندبوونیان هەبێت. ئەو ڕازیبوونە نابێت هیچ خەوشێکی وەك بەهەڵەچوون، غەش (فێڵ - تەڵەکەبازی)، یان گەندەڵاندنی نوێنەری دەوڵەت، یان تۆبزی لێکردنی تێدابێت. لێرەدا پێویستە بگوترێ کە بەشی دووەم لە دەروازەی پێنجەمی رێککەوتننامەی ساڵی ١٩٦٩ ڤێننا کە پەیوەستە بە بەتاڵکردنەوەی پەیماننامە، لەسەر خەوشەکانی ئیرادەی نووسیوە.

---

١٤٢. د. احمد ابو الوفا، الوسيط في القانون الدولي العام، المصدر السابق، ص١٧ وما بعدها، ود.ابراهيم محمد العنابى، المصدر السابق، ص١٢٧ وما بعدها، ود.حامد سلطان، المصدر السابق، ص١٧٤ وما بعدها.

ا- بەهەڵەداچوون (الغلط)

بەهەڵەداچوون، وەرگرتنی بۆچوونێكی ناڕاستە سەبارەت بە واقیعەیەك كە كاریگەریی هەبێ لەسەر ڕازیبوونی لایەنێك كە پابەندبێت بەپەیماننامە بە پێچەوانەی گرێبەستەكان لە یاسای تایبەتدا. گرنگی بەهەڵەداچوون لە پەیماننامەكاندا سنووردارە، چونكە دەوڵەت زۆر بەدەگمەن دەكەوێتە هەڵەوە، ئەمەش بەو هۆیەی كە پەیماننامە بە چەند قۆناغێكدا دەڕوات و وردبینی و وەردانەوەی زۆری تێدا دەكرێت، واتە دەكرێ بەهەڵەدانەچوون بدۆزرێتەوە لەپێش قۆناغی كۆتایی كە دوای ئەوە پەیماننامە مولزەم دەبێت.بەلاّم زۆر لە یاساناسان وەك (ئۆپنهایم و فوشی) دەڵێن: ئەگەر هەڵە ئاشكرا نەبوو، تەنیا دوای بەستنی پەیماننامە بەشێوەیەكی كۆتایی، ئەوا ئەو دەوڵەتەی كە دەكەوێتە هەڵەوە بۆی هەیە داوای بەتاڵكردنەوەی بكات. بەم شێوەیە، چەمكی هەڵە لە پەیماننامە نێودەوڵەتییەكان دوو مانای هەیە[١٤٣]:

١- بەهەڵەداچوون لە داڕشتنی دەقی پەیماننامەدا، ئەگەر سیفەتی فەرمی درا بە پەیماننامەكە و هەڵەیەكی تێدابوو، ئەوا بەچاكردنەوەو ڕاستكردنەوەی هەڵەكە، چارەسەر دەكرێت.

٢- بەهەڵەداچوون لە ڕەزامەندیدا، ئەگەر بەهەڵەداچوون پەیوەندیی بە واقیعێكی دیاریكراو، یان هەڵوێستێكی دیاریكراوەوە بێت، ئەمەش هۆكاری بنەڕەتیی ڕەزامەندیی لایەنەكان و ڕازیبوونیان بێت بە ئیلتزامكردن بە پەیماننامەكە.

دەبێ ئەوەش بگوترێ، ئەو بەهەڵەداچوونەی كە دەبێتە هۆی بەتاڵكردنەوەی پەیماننامە دەبێ هەڵەیەكی جەوهەری بێت، یان بەلایەنی كەمەوە بەهەڵەداچوونێكی گەورە بێ، هەڵەی بچووك نابێتە هۆی بەتاڵبوونەوەی پەیماننامە.

بەگشتیی هەڵە دوو جۆرە: هەڵەیەكی دەروونی كە پەیوەندیی بەمەسەلەی قبوڵكردن و قبوڵنەكردنی پەیماننامەوە هەیە، هەڵەیەكی ماددی كە پەیوەندیی بە خودی بەڵێننامەكەوە هەیە، جۆری یەكەم دەگمەنەو لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكاندا قبوڵ نییە، جۆری دووەم واقیعییە (وەك هەڵە لە سنووردا كە پەیوەندیی بە نەخشەی نادروستەوە هەبێت)، یان زمانەوانی بێت (ئەو هەڵەیەی لە وەرگێڕانی پەیماننامە لە زمانێك دەكەوێتەوە بۆ زمانی لایەنەكەی تر دەكەوێتەوە.

١٤٣. بڕوانە مادەی ٤٨ و ٧٩ لە ڕێككەتننامەی ڤیەننا ساڵی ١٩٦٩.

یاساناسان جیاوازی دەكەن لەنێوان هەڵەی واقیعی و یاسایی، تەنیا یەكەمیان جێی بایەخە، بەلاّم هەڵەی یاسایی، پەیماننامە خەوشدار ناكات، چونكە دەوڵەت پێویستە یاسا بزانێ و ڕێوشوێنی گونجاو بگرێتەبەر. باشترین ڕێگەش بۆ چارەسەری هەڵە ئەوەیە كە دەوڵەتان ڕێكبكەون و بە پاشكۆیەك ئاماژە بەو هەڵەو كەماسییانە بكەن كە لە پەیماننامەكەدا هاتوون.[١٤٤]

ب- غەشكردن (فرت و فێڵ) **(الغش- التدليس- التغرير- الخداع)**

فرتوفێڵ، خەوشێكە كار لە ڕازیبوونی یەكێك لە لایەنەكانی پەیماننامە دەكات، ئەگەر هاتوو ڕەفتارێكی فێلاّوی لایەنێكی تر وای كردبێت كە هانی لایەنێكی تر بدات بۆ بەستنی گرێبەستێك. فرتوفێڵ حاڵەتێكی ناراست بۆ لایەنێك دێنێتە پێش كە وای لێ بكات پەیمانەكە ببەستێت.[١٤٥]

لە مادده ٤٩ی هەردوو ڕێككەوتننامەی ڤێننادا هاتووە كە دەوڵەتێ، یان ڕێكخراوێكی نێودەوڵەتی، ڕەفتاری تەڵەكەبازی لایەنێكی تر هانی دابێ بۆ گرێبەستن، ئەوا دەتوانێ پاساوی بەغەشكردن بهێنێتەوە وەك هۆكاری بەتاڵبوونەوەی ڕەزامەندیی پابەندبوون بەو پەیماننامەیە.

پێویستە ئاماژە بەوە بكەین كە لە هەردوو باری بەهەڵەداچوون و غەشكردندا، ئەگەر لایەنێك بەردەوام بوو لە جێبەجێكردنی پەیماننامە لەدوای ئاگاداربوونەوە لەو خەوشەی كە لە خواستیدا بووە، ئەوا وەكو وازهێنان و دابەزین لە مافی بەتاڵكردنەوەی پەیماننامە لە قەڵەم دەدرێت. ئەم هەڵسوكەوتە وەك ڕێگەپێدانێكی دواتری پەیماننامە لەقەڵەم دەدرێت، ئیدی ئەو لایەنە مافی گرتنەبەری بەتاڵكردنەوەی نامێنێ كە تیۆریی داخستن (نظرية الاغلاق) جێبەجێ دەبێ، كە دادگای نێودەوڵەتی جەختی لەسەر دەكاتەوە.[١٤٦]

ج- بەشخوران **(الغبن):**

بەشخوران لە یاسای شارستانیدا ئەو نایەكسانی و ناهاوتاییەیە كە لە وەرگرتن و پێداندا بۆ لایەنێكی گرێبەست دێتەدی.[١٤٧] كەواتە بەشخواردن لە هەندێ گرێبەستدا ئەو ناهاوسەنگییە،

---

١٤٤. د.محمد المجذوب، الوسيط، المصدر السابق، ص ص٢٢٦-٢٢٧.

١٤٥. د.عبدالمجيد الحكيم وصاحبيه، الوجيز فى نظرية الألتزام في القانون لمدني العراقي، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، ١٩٨٠، ص٨٦.

١٤٦. د.ابراهيم محمد العناني، المصدر السابق، ص١٣٤ وما بعدها.

١٤٧. بۆ زیاتر بڕوانە: د.عبد المجيد الحكيم، المصدر السابق، ص٨٦ وما بعدها.

یان ئەو جوداییە ناباوەیە کە لەنێوان لایەنەکانی گرێبەست لە سنووری ئاساییدا دەردەچێت. لێرەدا پرسیار ئەوەیە کە ئایا بەشخواردن لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا دەبێتە هۆی ئەوەی کە راست ودروستیی پەیماننامە لەکەدار ببێ.

یاساناسان ئەمە بەدوور دەزانن و پێیانوایە ئەوە ئەرکی دەوڵەتە، کە پێش پابەندبوون بە رێککەوتننامە، باش بیری لێ بکاتەوە و دیراسەی بکات و بەحیکمەت و خوێندنەوەی دروست دەوری بکاتەوە. هەروەها ئەستەمە تیۆریی بەشخوران لە یاسای نێودەوڵەتی جێبەجێ بکرێت، چونکە ئەستەمە دادگایەك هەبێ و بڕیاری بوونی ئەم بەشخورانە بدات. لە یاسای نێودەوڵەتیدا رێسایەك نییە کە پلەو رێژەی بەشخورانی پێویست دیاری بکات کە بەهۆیەوە رێککەوتن هەڵوەشێنێتەوە.[١٤٨]

## د- گەندەڵاندنی نوێنەری دەوڵەت (افساد ممثل الدولة)، (بەرتیل – الرشوة)

لە رێ لابردنی خواستی نوێنەری دەوڵەت بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، کە کاریگەریی لەسەر خواستی دەوڵەت دابنێ لەو کاتەی نوێنەری دەوڵەت بۆچوونێك دەربڕێ کە لە بەرژەوەندیی دەوڵەتانی تردا بێ.

هەروەکو لە ماددەی ٥٠ی رێککەوتننامەی ڤیەننادا هاتووە: ئەگەر گوزارشتی رەزامەندیی دەوڵەت بە پەیماننامەیەك لە دەرئەنجامی بەلارێ دابردنی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی نوێنەرانی ئەم دەوڵەتە هاتبێ بەهۆی دەوڵەتێکی تر کە لە وتووێژەکە دایە، ئەوا ئەو دەوڵەتە بەهۆی ئەم بەلارێ دابردنە دەتوانێ داوای پوچەڵکردنەوەی پەیماننامەکە بکات.

## هـ- تۆبزیکردن (الأكراه)

تۆبزی لێکردن دوو شێوەی هەیە، یان زۆر لە کەسی نوێنەری دەوڵەتەکە (الأكراه الشخصي) خۆی کرابێت یان لە خێزانی، یان لە دەوڵەتەکە خۆی جا ئەوە لە رێگای بەکارهێنانی هێز، یان هەڕەشەلێکردن، بەپێچەوانەی پرینسیپەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان.

سەبارەت بە تۆبزیکردن لە نوێنەرانی دەوڵەت ئەوا یاساناسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە پەیماننامەکە هێزی پابەندبوونی خۆی لەدەست دەدات و دەبێتە هۆی پوچەڵ بوونەوە. لە

---

١٤٨. د.محمد الجذوب،المصدر السابق، ص٥٣٢.

ماددەی ٥١ی ڕێککەوتننامەی ڤێننادا هاتووە: ئەگەر ڕەزامەندیی دەوڵەت بۆ پابەندبوون بەپەیماننامە بەهۆی زۆرلێکردن یان هەڕەشەلێکردنەوە بوو، ئەوا پەیماننامەکە یاسایی نابێ. لە روانگەی یاسای نێودەوڵەتیی کلاسیکەوە، ناچارکردنی دەوڵەت جا ماددی بێت وەك جەنگ و دەرئەنجامەکانی، یان مەعنەوی بێت وەك فشاری سیاسی و ئابووری....هتد، ئەوا پەیماننامەکە بەتاڵ نابێتەوە، هەربۆیە ئەو پەیماننامە ئاشتییانەی کە لە دوای جەنگ دەبەسترێن، سەرەڕای ئەوەی کە دەوڵەتی سەرکەوتوو خواستی خۆی بەسەر دەوڵەتی بەزیو دا دەسەپێنێ، پەیماننامەی دروستن. زۆربەی یاساناسە نێودەوڵەتییە کلاسیکییەکان دەڵێن: ئەگەرچی جەختکردن لەسەر ئەوەی پەیماننامە دەرئەنجامی حاڵەتێکی وا لەگەڵ لۆژیك و پرینسیپەکانی دادوەری ناکۆکە، بەلاّم ڕەخنەلێگرتن کار لەسەر بوون و زەرورەتی ناکات، بەپێچەوانەوە نا ئارامی لە کاروباری نێودەوڵەتاندا دروست دەکات و لە ڕێزو بەهای پەیماننامە کەم دەکاتەوەو دەرفەت بە هەر دەوڵەتێك دەدات کە بەبیانووی زۆرلێکردن لە پەیماننامە بێتە دەرەوە، متمانە لەنێوان دەوڵەتاندا نامێنێ، ئەمەش کیانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی دەخاتە مەترسیەوە، ئەگەرچی بالاّدەستیی بۆ ئەم ئارامیە لەسەر حیسابی دادپەروەری کارێکە لە ڕووی ئایدیالییەوە مایەی ڕەخنەلێگرتنە، بەلاّم مەسەلەیەکی مانابەخشە لەڕووی واقیعییەوە.[١٤٩] سەرەڕای ئەوە زۆربەی یاساناسە کلاسیکییەکان بیانوو دەهێننەوە کە ئەگەرچی ئەمە لەگەڵ پرینسیپە گشتییەکانی یاسادا ناکۆکە، لەوانە ئۆپنهایم کە دەرئەنجامێکی لۆژیکی داننانە بە جەنگ وەك ئامرازێکی ڕەوا لە ئامرازەکانی گۆڕانی یاسا، زۆربەیان دەڵێن کە دەبێ ڕێز لەو پەیماننامەیە بگیرێت کە بەزەبری هێز بەسەر دەوڵەتێکدا دەسەپێنرێت، ئەگەر نا جەنگ بەردەوام دەبێ و ناتوانرێت کۆتایی پێ بهێنرێ، سەرەڕای ئەوە قبوڵکردنی پەیماننامەیەکی بەم جۆرە ئارەزووکردنە بەدوورخستنەوەی مەسەلەیەکی خراپتر کە ئەویش بەردەوامیی جەنگە. بەلاّم لەڕاستیدا ناکرێ پابەندی ڕێسایەکی لەم چەشنە بین کە بلّێ، نابێ ناڕەزایی سەبارەت بە تۆپزیکردن هەبێ بۆ بەتاڵکردنەوەی پەیماننامە لەبەر ئەم هۆیانە [١٥٠]:

١- لەڕووی یاساییەوە: ناکۆك بوونی ئەم ڕێسایە لەگەڵ هەموو پرینسیپە گشتییەکانی تری سیستەمی یاسایی کە دەڵێ دەبێ گوزارشتکردن لە خواست سەربەست بێت، ئەگەر نا

١٤٩. د.محمد سامي عبدالحميد وصاحبه، ص ص٧٣-٧٢.

١٥٠. محمد حافظ غانم (مبادئ القانون الدولي العام)، ص٣٨٤-٣٨٦

خواست خەوشدار دەبێت. رازیبوون بە مانایەکی پێچەوانەمان دەبات، بۆ حاڵەتی سەرەتایی کۆمەڵی نێودەوڵەتی، نەك پرینسیپ و ڕێسا نوێیەکانی دوای جەنگی جیهانی دووەم، کە تیایدا جەنگ حەرام و پەنا بردنە بەر هێز بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان قەدەغەکراوە، هەروەها بوونی ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییانە کە ئامانجیان جێگرتنی یاسایە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا.

٢- ئەو ئارامیەی کە لەسەر چەسپاندنی بارێکی زاڵمانە دەستەبەر دەبێت، ئەوا ئارامی و ئاسایش نییە، چونکە گەلان دەیانەوێ مافی زەوتکراوی خۆیان وەرگرنەوە، بەبێ گوێدانە فشارو ماف زەوتکردن.

٣- زۆر لە دەوڵەتان — بەتایبەت دەوڵەتە بچوکەکان- داوایان کردووە کە دان بە ڕەوایی پەیماننامەیەکدا نانێن ئەگەر لەژێر سێبەری داگیرکاریدا هاتبێتە پێش.

لەکۆتاییدا دەڵێین کە پەیماننامەی ئاشتی و ئاشتەوایی کە لەنێوان دەوڵەتی سەرکەوتوو دۆڕاودا دەبەسترێت ناکرێ، ببێتە پەیماننامەیەکی دروست ئەگەر بڵێین تۆپزیکردن پەیماننامە خەوشدارناکات، هەروەك ماددەی ٥٣ پەیماننامەی ساڵی ١٩٦٩ ی ڤیێننا دا هاتووە کە (پەیماننامە بەتاڵە ئەگەر بەستنی، دەرئەنجامی هەڕەشەکردن یان بەکارهێنانی هێز بێت بەپێچەوانەی پرینسیپە گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی کە لە بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە). بەڕای ئێمە دەبێ جەخت لەسەر ئەم بۆچوونە بکەینەوە.

نابێ لەبیرمان بچێت کە لە هەموو بارێکدا دەوڵەت ناتوانێ بیانووی تۆپزیکاری بۆ بەتاڵکردنەوەی پەیماننامە بەکاربێنێ، مەگەر لە چەند حاڵەتێکی دەگمەندا نەبێت، بۆ خێرو خۆشی مرۆڤایەتی و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانە کە ئەو دەوڵەتانەی سکاڵا لەدەست ناچارکردنیان بەواژۆکردنی پەیماننامەیەك دەکەن و هەوڵ بدەن مەسەلەکە بگەیێننە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، یان لەگەڵ دەوڵەتانی لایەن لە رێککەوتننامەکە بگەنە هەمواركردنی پەیماننامەکە کە گونجاو ڕەزامەندبەخش بێت.[١٥١]

٢- سەرپێچیکردنی پەیماننامە بۆ دەقێکی دەستووری، یان یاسای ناوخۆ

سەبارەت بە بەهای یاسایی پەیماننامەیەك کە پێچەوانەی ڕێسای دەستووریی ناوخۆی دەوڵەتێك بێت، سێ ڕێبازی شیکاریمان هەیە لە بواری یاسای نێودەوڵەتیدا.[١٥٢]

---

١٥١. د. محمد المجذوب، ص٥٤٣.

١٥٢. د. محمد المجذوب، ص١١٣و دواتر.

١- ڕێڕەوو ئاڕاستەی نێودەوڵەتی- الاتجاه الدولي: ئەم ڕێبازە پێیوایە ناتەبایی لەگەڵ یاسای ناوخۆدا کارناکاتە سەر راست و دروستیی پەیماننامەکە لە ئاستی نێودەوڵەتی، ئەمەش لەبەر ئامانج و ئارەزووی دەستەبەرکردنی ئارامی و ئەمانە لە پەیوەندییە یاساییە ڕێککەوتنەکاندا.

٢- ڕێڕەوی دەستووری – الاتجاه الدستوري: ئەم ڕێبازە دەڵێ مادام کۆتی دەستووری مەرجێکە بۆ بەستنی پەیماننامە، بۆ دروستیی پەیماننامە لە ئاستی نێودەوڵەتی، کەواتە هەر پەیماننامەیەك بە پێچەوانەی ئەمە ببەسترێ بەتاڵە، یان بەلایەنی کەمەوە دەکرێ بەتاڵ بێت و دەڵێ دەبێ لایەنەکەی تر لە پەیماننامە، سروشت و بوونی کۆتی دەستووریی پەیوەنددار بەدەسەڵاتی بەستنی پەیماننامە بزانێ.

٣- ڕێبازی ناوەڕاست: دەیەوێ لە ڕەق و تەقی ڕێڕەوی دەستووری و نەرمی ڕێڕەوی نێودەوڵەتی دوور بکەوێتەوە و دەیەوێ دەورو خولی هەندێ کۆت و پێوەر بدات کە دەیانەوێ تەحەکوم و نیەتی خراپ دووربخاتەوە. هەربۆیە لایەنگرانی ئەم ڕێبازە هەندێ پێوەر پێشنیار دەکەن وەك: پێشێلکردنی دیارو بەرچاوی دەقی دەستووری، لە بارێکی وادا پەیماننامە بەتاڵە، ئەگەرنا سەرەڕای بوونی خەوش دروستە. ماددەی ٤٦ لە ڕێککەوتننامەی ڤیێننا دەیەوێت چارەیەکی ناوەندی دابنێت لەنێوان ئەم سێ ڕێبازە و دەیەوێ بەلانسێك لەنێوان ئاسایشی یاسایی پەیوەندییە ڕێککەوتنەکان لەلایەك و ڕێزگرتن لە ڕێسای یاسای ناوخۆی تایبەت بەبەستنی پەیماننامە لە لایەکی ترەوە رابگرێ. ناوەڕۆکی ماددە ٤٦ لە برگە (١) دا دەڵێ ناکرێ، هیچ دەوڵەتێك بڵێ کە ڕەزامەندیم بۆ پەیماننامە پێچەوانەی حوکمێکە لە یاسای ناوخۆ کە پەیوەستە بە دەسەڵاتی بەستنی پەیماننامە وەك هۆیەك بۆ بەتاڵکردنەوەی، واتە دەبێت دەوڵەت بەڕەزامەندیی نیشاندان پاپەند بێ لەبەرامبەر لایەنەکانی تردا. (کە ئەم چارەی نزیکییە بۆ ڕێبازی یەکەم)، بەلاّم کۆتایی هەمان برگە دەڵێ مەگەر سەرکێشییەکی ئاشکرا بێت بۆ ڕێسایەك کە گرنگییەکی پڕ بایەخی هەبێ بۆ ڕێسایەکی ناوخۆ، برگەی دوو دەڵێ لادانی ئاشکرا (الآخلال واضحا) ئەوەیە کە بەشێوەیەکی بابەتی هەر دەوڵەتێك بە ڕەفتاری ئاسایی و بەنیەتپاکی مامەڵە بکات (کە ئەمەش لە هەردوو ڕێبازی دووەم و سێیەم نزیکە). هەروەها بەگوێرەی ماددەی ٤٧ ئەگەر کۆتێکی تایبەت لەسەر دەسەڵاتی نوێنەری دەوڵەت هەبوو بۆ گوزارشتکردن لە ڕەزامەندیی تایبەت بە پەیوەستبوون بە پەیماننامە، ئەوا بەهەندوەرگرتنی ئەم کۆتە لەلایەن نوێنەرەکەوە و پشتگوێخستنی، پەیماننامەکە بەتاڵ ناکاتەوە، تەنیا ئەگەر دەوڵەتانی ئەندام تایبەت بەم کۆتە ئاگادار کرابنەوە پێش گوزارشتکردن بەڕازیبوون بە پەیماننامەکە. لەم بارەشەوە هۆی بەتاڵبوونەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئاگادارکردنەوەی

دەوڵەتان لە لایەك، ناشیاوی لێنەهاتوویی نوێنەری دەوڵەت سەبارەت بە سنووردارییی دەسەڵات و تواناكانی لە لایەكی ترەوە.

**٣- ناكۆكی پەیماننامە لەگەڵ ڕێسایەكی بەرفەرمانی لە ڕێسایەكانی یاسای نێودەوڵەتی- ڕەوایەتی ناوەڕۆك و هۆ:**

مەبەست لە ڕەوایی ناوەڕۆك و مەبەست لەم بوارەدا، واتە نەبوونی دژایەتییە لەنێوان ناوەڕۆك یان مەبەستی پەیماننامە و ڕێسایەكی بەرفەرمان لە ڕێساكانی یاسای نێودەوڵەتی. دروستبوونی پەیماننامە دەخوازێ، بابەتەكەی ڕەواو دروست بێت، واتە دەبێ یاسای نێودەوڵەتی ڕێگە بە ماددەی ڕێككەوتنەكە بدات و پرینسیپەكانی رەوشت بیگرێتە خۆی و لەگەڵ پەیماننامە و پابەندبوونێكی پێشوەختە ناكۆك نەبێت. هەروەك لە ماددەی ٥٣ لە ڕێككەوتننامەی ڤێننا دا هاتووە كە ئەو پەیماننامەیەی لەگەڵ ڕێسایەكی بەرفەرمان (قاعدة آمرة-jus cogens) دا لە یاسای نێودەوڵەتی ناكۆك بێ، بەتاڵە. ڕێسای بەرفەرمان، هەر ڕێسایەكە كە كۆمەڵی نێودەوڵەتی قبوڵی دەكات و دانی پێدادەنێت بەو پێیەی ڕێسایەكە ناكرێ لەكەدارو پێشێل بكرێت، یان هەموار بكرێت مەگەر بە ڕێسایەكی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی تر كە هەمان خاسیەتی هەبێت.

بەم شێوەیە ڕێسای مەشروعیەتی بابەتی پەیماننامە، ڕێسایەكی سەلماوە لە ڕێسایەكانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی،[153] ماددەی ١٠٣ لە بەڵێننامەی نەتەوە یەكگرتووەكان دەڵێ: ئەگەر ئیلتیزامی ئەندامێكی نەتەوە یەكگرتووەكان بەگوێرەی بەڵێننامەی نەتەوە یەكگرتووەكان لەگەڵ هەر ئیلتیزامێكی نێودەوڵەتی تر ناكۆك بوو، ئەوا پابەندبوون بە بەڵێننامەی نەتەوە یەكگرتووەكان بە هەند وەردەگیرێت.

بەهەمان شێوە ماددەی ٦٤ بەنسبەت دەركەوتنی ڕێسایەكی بەركاری نوێ دووپات دەكاتەوە كە هەر پەیماننامەیەك پێچەوانەی ئەم ڕێسایە بێت بەتاڵەو كاری پێ ناكرێت.

بۆ نموونە ئەگەر پەیماننامەیەك[154]:

١- ناكۆك بوو لەگەڵ ڕێسایەك لە ڕێساكانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی وەك ئەوەی كە پەیماننامەیەك لەسەر بەكارهێنانی ناڕەوای هێز جەخت بكاتەوە، یان ڕێككەوتننامەیەك بۆ لەناوبردنی بەكۆمەڵ......هتد.

---

١٥٣. د.محمد حافظ غانم- مبادئ..ص٣٨٢

١٥٤. د.علی صادق أبوهیف، ص ص٥٣٥-٥٣٦.

٢- ناكۆك بوو لەگەڵ ڕەوشتچاكی، یان لەگەڵ پرینسیپە گشتییەکانی مرۆڤایەتی وەك ڕێککەوتنی دوو دەوڵەت لەسەر وەرگرتنی ڕێوشوێنی بەزۆری ناڕەوا دژ بەتاك و ڕەگەزێکی دیاریکراو یان تایفەیەکی دیاریکراو، بەمەبەستی زەلیلکردن و زاڵبوون بەسەریدا، یان ئەگەر دەوڵەتێك پەیماننامەیەك بەسەر دەوڵەتێکی تردا فەرزبکات کە چەند مەرجێکی تێدا بێت، دەستدرێژی و غەدرێکی بێ پەروای بۆ سەر مافە بنەڕەتییەکانی دەوڵەتێکی تر تێدا بێت. وەك ڕێککەوتننامەی جەزایری ١٩٧٥/٣/٦ی نێوان صدام حسێن و شای ئێران کە لەسەر حیسابی کورد ئەنجامدرا.

٣- ئەگەر پەیماننامەیەك ناکۆك بوو لەگەڵ پەیمانێکی پێشوەخت کە لایەنێك پێیەوە پابەند بێت، ئەوا بەگوێرەی ماددەی ٢٠ لە بەڵێننامەی کۆمەڵەی گەلان و ماددەی ١٠٣ لە بەڵێنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان وەك لەپێشتر ئاماژەی بۆ کرا، دەبێ پابەندی بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بن.

٢- شوێنەوارو کاریگەریی پووچەڵبوونەوەی پەیماننامە:

دەقەکانی هەر پەیماننامەیەکی بەتاڵبۆوە (پووچەڵ) ناملوزەمن، بەلاّم لەوانەیە پەیماننامەیەك ماوەیەك جێبەجێ ببێت (بەهۆی دەرکنەکردن بە پووچەڵیی بەهۆی لایەنەکانی)، کەواتە ئایا چ کاریگەرییەکی دەبێت، لەم ڕووەوە دوو ڕێسای گرنگمان هەیە[١٥٥]:

لەلایەك هەر لایەنە بۆی هەیە داوا لە لایەنەکەی تر بکات کە بەگوێرەی بۆلوان بگەڕێنەوە بۆ باری پێش کارکردن بە پەیماننامەکە، وەکو ئەوەی کە پەیماننامە جێبەجێ نەبووبێت (فیکرەی گەڕانەوەی حاڵەت بۆ باری پێشووی کە هەیبووە). بێ گومان ئەوکارانەی کە کراون بەنیەتپاکی پێش وروژاندنی پوچەڵیی ناڕەوا نابن بەهۆی پووچەڵیی پەیماننامە، هەروەها ئەو لایەنەی کە تووش بووە بە فرت وفێڵ و تۆپزی و بەرتیل سوود لەو پووچەڵییە وەرناگرێت.

لەلایەکی تر هەروەك لە ماددەی ٤٥ی ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٦٩ی ڤیێننادا هاتووە دەوڵەت مافی دەستگرتن بە هۆیەك لە هۆیەکانی پووچەڵبوونی پەیماننامە، یان کشانەوە، یان کارپێنەکردنی لەدەست دەدات، لەو هۆیانە وەك دەستگرتن بە حوکمەکانی یاسای ناوخۆ، یان بەو ناوەی کە نوێنەری دەوڵەت لەو کۆتانەی بۆی داندراوە، چۆتە دەرێ و سنووری بەزاندووە، یان بەهۆی بەهەڵەداچوون، یان فرت و فێڵ وبەرتیل، یان بەهۆی پێشێلکردن، یان بوونی

---

١٥٥. د. محمد المجذب، ص ص١٧٤-١٧٥.

گۆڕانێکی بنەڕەتیی بارودۆخ ئەمانەش بەگوێرەی مادەکانی (٤٦-٥٠ یان ٦٠-٦٢)، ئەگەر هاتوو بە ئاشکرا قبوولّی پەیماننامەکەی کرد کە راست و دروستە، ئەگەر بەهۆی ڕەفتاری خۆیەوە وای نیشاندا کە دروستی پەیماننامەکە و بەردەوامبوونی و جێبەجێکردنی قبولّ دەکات.

### دووەم: کۆتاییهێنان بە پەیماننامە بەڕەزامەندیی لایەنەکان

بێ گومان هەر یەکێ کارێکی یاسایی بکات مافی کۆتایی پێهێنانیشی هەیە، بەلاّم کۆتاییهێنان بە پەیماننامە دەبێ بەڕەزامەندیی لایەنەکان بێت، لەمەشدا شکلێکی تایبەت نییە بۆ ڕەزامەندیی لایەنەکان لەسەر کۆتاییهێنانی، دەکرێ پەیماننامەیەکی هاوشێوەی یەکەم کۆتایی بێت (تیۆریی کاری پێچەوانە-کە تیۆرێکە یاسای گشتیی نێودەولّەتی دانی پێدانانێت)، یان کۆتاییهێنانی شاراوەبێت وەك پەیماننامەی دواتر بەئاشکرا لابردنی پەیماننامەی یەکەم باس ناکات، بەلاّم دەقی وا دەگرێتەخۆی کە دژە لەگەلّیدا.

ماددەی ٥٤ لە ڕێککەوتننامەی سالّی ١٩٦٩ی ڤێننا دا هاتووە کە بۆ کۆتاییهێنان بە پەیماننامەیەك، یان کشانەوە لێی بەگوێرەی حوکمەکانی و بەڕەزامەندیی لایەنەکان، دەبێ:

- بەگوێرەی حوکمەکانی پەیماننامەکە بێت.
- یان لە هەرکاتێکدا دەبێ بەڕێککەوتنی لایەنەکان بێت دوای گفتوگۆ لەگەلّ سەرجەم دەولّەتانی ئەندام.

### سێیەم: جێبەجێبوونی پەیماننامە

ئەگەر لایەنەکانی پەیماننامە، هەموو ئیلتزامەکانی خۆیان جێبەجێکرد، ئەوا پەیماننامەکە جێبەجێ بووە، ئەمەش هۆیەکی سروشتیی کۆتاییهێنانە بە پەیماننامە.

### چوارەم: مەحالّ بوونی جێبەجێنەبوونی پەیماننامە

حالّەتی وا دێتە پێشێ کە وا بکات جێبەجێبوونی پەیماننامە مەحالّ بێت، ئەمەش بەهۆی لەناوچوون، یان نەمانی کۆتایی ئەو شتە دەبێ کە دەبێ جێبەجێ بکرێت، بۆ نموونە پڕبوونەوەی کەنداوێك یان وشکبوونی ڕووبار یان تێکشکانی پرد یان فرۆکە یان مردنی تاوانبارێك پێش تەسلیمکردنەوەی. هتد، هەروەك لە ماددەی ٦١ بڕگەی یەکەمدا هاتووە، بەلاّم بەهۆی سەرپێچیی بەرچاوی لایەنێك بۆ ئیلتیزام بەگوێرەی پەیماننامە بێتە پێش یان

هەر ئیلتیزامێکی تر، ئەوا ئەو لایەنە بەرامبەر لایەنەکانی تر دەبێ پابەند بێت، هەروەك لە بڕگەی ٢ لە ماددەی ٦١ هاتووە.

## پێنجەم: بەهۆی خواستی تاکلایەنە.

پەیماننامە لە دەرئەنجامی خواستی لایەنەکان دێتە ئاراوە، بۆیە بەگوێرەی ئەحکامی پەیماننامەکە، یان لە ڕێگەی ڕێککەوتنی دواتر دەتوانن پەیماننامە کۆتایی پێ بێنن، بەلاّم پرسیار ئەوەیە کە حوکمی تاکلایەنە چۆنە؟ ئەگەر لە پەیماننامەکە دەقێکی وا هەبوو ئەوا گرفتێك نییە، بەلاّم ئەگەر دەقێکی وانەبێ ئەوا کشانەوەی تاکلایەنە کارێکی ناڕەوایە و بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی لە ئەستۆی ئەو دەوڵەتەدایە، چونکە دەبێتە هۆی ئەوە هەرکاتێ دەوڵەت ویستی لە پەیماننامە بکشێتەوە، ئەمەش بڕواو متمانەو ئاسایشی یاسایی دەخاتە مەترسیەوەو دەبێتە هۆی بلاّوبوونەوەی ئاژاوە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا.[١٥٦]

لە ماددەی ٥٦ ی ڕێککەوتننامەی ڤێننادا هاتووە ئەگەر لە پەیماننامە دەقێك نەهاتبێ، نابێ بە خواستی تاکلایەنە کۆتایی بە پەیماننامە بێت، تەنیا لە دوو حاڵەتدا نەبێت:

- ئەگەر ئەوە سەلمێنرا کە لایەنەکان نیازی وایان بووە کە بتوانن بەتاکلایەنە کۆتایی پێ بێنن.
- ئەگەر بتوانرێت لە سروشتی پەیماننامەکە ئەوە دەرك پێ بکەین، بۆ نموونە پەیماننامەی هاوپەیمانێتی.

لە هەردوو حاڵەتدا ئەو لایەنەی کە کۆتایی پێ دێنێ، یان دەکشێتەوە لە پەیماننامە دەبێ لایەنەکانی تر ئاگادار بکاتەوە.

## شەشەم: ڕوودانی گۆڕانی گرنگ و بنەڕەتی لە بارودۆخەکەدا

لەبنەڕەتدا دەوڵەت پابەند دەبێت بە پەیماننامەیەك، ئەگەر ئەو مەبەستەی تێدا بێ کە لەپێناویدا هاتۆتەدی، گونجاوبێ بۆ ئەو بارەی کە بەردەوام جێبەجێ دەبێت، بەلاّم کە مەبەستی پەیماننامەکە لە ئارادانەما، یان ئەو بارودۆخە گۆڕا کە گرێبەستەکەی هێناوەتە پێش، یان بەشێوەیەك گۆڕا کە بەردەوامیی دەست پێ گرتن بەم پەیماننامە زەحمەت بێ کە زیان بە

---

١٥٦. د.أحمد أبو الوفا، القانون الدولي والعلاقات الدولية، المصدر السابق، ص ص١٢٣- ١٢٤.

بەرژەوەندیی لایەنێك بگەیێنێ، لە باری وادا کە هەموو لایەنەکان هەستیانکرد کە پێویستە چاوی پێدابخشێنرێتەوە، یان هەمواربکرێ، یان کۆتایی بەو پەیماننامەیە بهێنرێ بەگوێرەی بارودۆخی هاتووەپێش ئەوا گرفتێك نییە، بەلاّم گرفت لەوەدایە ئەگەر لایەنێك ئەم هەستەی هەبوو، ئەوانی تر نەیان بوو، لەم بارەدا ئایا بەتەنیا دەتوانرێ لە هەموو یان بەشێکی ئیلتیزامەکە خۆی ئازاد بکات و چۆن؟

یاساناسان دەڵێن هەر پەیماننامەیەك کە ماوەی دیاری نەکرابێ و مەرجێکی ئاشکرای تێدا نەبێ کە لە کاتێکی دیاریکراودا مافی خۆکشانەوەت پێبدات، ئەوا مەرجێکی نائاشکرا لەخۆدەگرێت کە پێویستە بەردەوام پابەندبین پێیەوە ئەگەر ئەو بارودۆخەی کە لە پێناویدا پێکهاتووە وەك خۆی مایەوە.[157]

بەلاّم دەگوترێ کە ئەم پاساوە پەسند نییە چونکە لەلایەك فێڵ یان گریمانەیەکی ناواقیعی لەخۆدەگرێ، لە لایەکی تر لایەنەکان پێشبینی هیچ گۆڕانێك لە بارودۆخدا ناکەن، خۆ کە ئەو پێشبینییە بکەن ئەوا بەو شێوەیەی کە دەیانەوێ دەتوانن چارەسەری بکەن، جگە لەوەی کە ئەم بۆچوونە دەرگا بۆ خوێندنەوەی تایبەتی و زاتی بۆ پەیماننامەکە دەکات و خراپ بەکاردەهێندرێ بۆ جێبەجێکردن یان جێبەجێنەکردنی. بۆیە رێبازی نوێ بەرەو ئەوەیە کە تیۆریی گۆڕانی بارودۆخ وەك رێسایەکی یاسایی بابەتی وایە کە بەهۆیەوە دەکرێ لایەنێکی پەیماننامە، لەبەر هۆی دادپەروەری و بەمەرجی دیاریکراو دەکرێ گۆڕانی بارودۆخ وەك هۆیەك بۆ کۆتاییهێنان بە پەیماننامەکە لە قەڵەم بدات و بیوروژێنێ.[158]

بۆیە دەکرێ گۆڕانی گرنگ لەو بارودۆخەدا کە پەیماننامەکەی لە پێناو ئەنجام دراوە، ببێتە هۆی کۆتاییهێنان بە پەیماننامەکە، ئەمەش پێی دەوترێت مەرجی مانەوەی شت لەسەر باری خۆی وگۆڕانکاری تێدەکەوێ، هەندێ جار بارێکی نادادپەروەر دێنێتە پێش یان مەحاڵ دەبێ هەموو یان بەشێك لە ئیلتیزامەکە جێبەجێ بێت. بۆیە مەرجی گۆڕانی گرنگ لە بارودۆخدا هاوسەنگییەك بۆ رێزگرتن لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی دێنێتەدی، ئەمەش دووکێشە دروست دەکات.[159]

---

١٥٧. د. السيد مصطفى احمد ابو الخير، المصدر السابق،ص٧٥ وما بعدها.

١٥٨. د. أحمد أبو الوفا، الوسيط...، ص١٨٠.

١٥٩. د. أحمد أبو الوفا، الوسيط....،ص١٨١-١٨٢.

١- ئەم تیۆرییە وەك پەردەیەك بۆ نیەت یان مەبەستێكی ناڕەوا بەكاربێت كە ببێتە سەرپێچیی لە پرەنسیپی وەفاداریی بە پەیمان (گرێبەست شریعەتی هەردوولایەنە یان پرەنسیپی پیرۆزی گرێبەست) و مەترسی دروست بكات، بۆیە وا باشە تاكلایەنە كۆتاییهێنان بە پەیماننامە نەوروژێنرێ ئەگەر لایەنەكان ڕێك نەكەوتن، بەڵكو دەكرێ شێوازی وەك تەحكیم —سەرپشكی- و ناوبژیوان وكاری پیاوچاكان یان پەنابردن بۆ ڕێكخراوی نێودەوڵەتی و دادگای دادی نێودەوڵەتی هەڵبژێردرێ.

٢- گۆڕانی بارودۆخ لەوانەیە هەندێك بۆشایی یاسایی لەنێوان پەیوەندیی لایەنەكاندا بێنێتەدی. كە پەیماننامەیەك سیستەمێكی یاسایی لەنێوانیاندا دروست بكات بەڵام گۆڕانی بارودۆخ ئەو سیستەمە ناهێڵێ بەهۆی نەمانی پەیماننامەكە بەبێ ئەوەی نیزامێكی تر جێی بگرێتەوە كە لەگەڵ بارە نوێیەكە رابێت. بۆیە چارەسەری ئەمە ئەوەیە كە بە وتوویێژ و دانوستان بەمەبەستی چاوپێداخشاندنەوە ئەم گرفتە چارەسەر بكەن و دەقەكە سەرلەنوێ دابڕێژنەوە كە لەگەڵ بارودۆخی تازەدا بگونجێ، وەك لە مادده (١٩)ی بەڵێننامەی كۆمەڵەی گەلاندا هەیە، بەڵام لە بەڵێننامەی نەتەوە یەكگرتووەكاندا ئاماژەیەكی لەم چەشنە نییە.

لە ماددەی ٦٢ ی ڕێككەوتنامەی ساڵی١٩٦٩ی ڤیەننا دا هاتووە كە گۆڕانی بارودۆخ هۆیەكە بۆ كۆتاییهێنان بە پەیماننامەیەك ئەگەر ئەم مەرجانە هاتنەدی:

١. ئەگەر گۆڕانەكە بەسەر شتێكدا هاتبێ كە بۆ بەستی پەیماننامەكە لەكاتی گرێبەستەكەدا هەبووبێ.

٢. دەبێ گۆڕانەكە گرنگ و بنەڕەتی بێت.

٣. دەبێ لایەنەكان چاوەڕوانیان نەكردبێت.

٤. دەبێ بوونی ئەو بارودۆخە بنەچەیەك بێت بۆ قبوڵكردنی لایەنەكان بە ئیلتیزام بە پەیماننامەكە.

٥. ئەگەر گۆڕانەكە ریشەیی بێت لە چوارچێوەی ئیلتیزامی لایەنەكاندا بەشێوەیەك كە جێبەجێكردنی ئەستەم و نادادوەر وگران بێت بۆ لایەنەكە.

٦. بەڵام نابێ تیۆریی گۆڕانی گرنگ وەك هۆیەك بۆ كۆتاییهێنان، یان كشانەوە لە پەیماننامەیەكدا لەم حاڵەتانەدا پشتی پێ ببەسترێت:

- ئەگەر پەیماننامەكە پێوەندیی بە سنوورەوە هەبوو.
- یان گۆڕانە گرنگەكە لە بارودۆخدا بە هۆی سەرپێچیی لایەنەكە خۆی بەپابەند بوون بە پەیماننامەكە یان هەر ئیلتیزامێكی تری نێودەوڵەتی بۆ هەر لایەنێكی پەیماننامە، هاتبێتەدی.

**حەوتەم: پچراندنی پەیوەندیی دیپلۆماسی و قونسوڵی.**

پەیوەندیی دیپلۆماسی بە ڕێکەوتنی دوودەوڵەت دەبێت،و لە زۆربەی کاتدا بە تاکلایەنە کۆتایی دێت کە لایەنی تر ئاگادار دەکاتەوە،و پچڕانی پەیوەندیی دیپلۆماسی کارێکی ڕەوایە،و دروستە لەهەر کاتێکدا بێت و ئەو دەوڵەتە هیچ بەرپرسیارێتییەکی لەسەر نییە، بەڵام کارێکی مەترسیدارەو دەوڵەت پەنای بۆ نابات مەگەر هۆی زۆر بەهێزو گرنگ هەبێت، وەك ناکۆکی یان دەستدرێژیکردن بۆ سەری یان بۆ سەر بەرژەوەندییەکی، یان بەهۆی نارەزاییەکی توند لەسەر کارێك کە دەوڵەتی بەرامبەر کردوویەتی، حاڵەتی گۆڕانی سیستەمی حوکم لە یەکێك لە دەوڵەتەکان بەهۆی شۆڕش و دەوڵەتەکەی تر ڕەتیدەکاتەوە کە دان بەو حکوومەتەدا بنێت. بەڵام مەرج نییە پچڕانی پەیوەندیی دیپلۆماسی، پچڕانی پەیوەندیی قونسوڵی بەدوادابێت،و نابێتە هۆی کۆتاییهێنان بە پەیماننامەی نێوانیان یان وەستان یان لەکارخستنی.[١٦٠]

هەربۆیە بەگوێرەی ماددەی ٧٤ و ٦٣ لە هەردوو ڕێککەوتننامەی ١٩٦٩و١٩٨٦، پرەنسیپی گشتیی ئەوەیە کە پەیوەندییە ڕێکەوتنامەییەکان و پەیوەندییە دیپلۆماسییەکان و قونسوڵییەکان لە ڕووی پرینسیپەوە بە هیچ پەیوەستییەکی یاسایی پابەند نابن. لە ماددەی ٦٣ داهاتووە کە پچڕانی پەیوەندیی دیپلۆماسی و قونسوڵی لەنێوان لایەنەکانی پەیماننامەیەك کاریگەریی لەسەر ئەو پەیوەندییە یاساییە نابێ کە پەیماننامەکە بنیاتی ناوە، مەگەر ئەو پەیوەندییە دیپلۆماسی و قونسوڵییە پێویستییەك بێت بۆ جێبەجێکردنی پەیماننامەکە. هەروەها ماددەی ٧٤یش جەخت دەکاتەوە کە پچڕان و نەبوونی پەیوەندیی دیپلۆماسی و قونسوڵی لەنێوان دوو دەوڵەت یان زیاتر نابێتە هۆی نەبەستنی پەیماننامە لەنێوانیاندا، بەستنی پەیماننامەش خۆی لە خۆیدا کاریگەریی نابێ لەسەر باری تایبەتی پەیوەندیی و دیپلۆماسی و قونسوڵیی نێوانیان.

لە خوێندنەوەی ئەم دەقەوە ڕێسایەك و ریزپەڕێك — جیاییەك - (استثناء) دەبینین کە بریتیە لە:

١- وەك ڕێسایەکی گشتیی پچڕانی پەیوەندیی دیپلۆماسی و قونسوڵی هیچ کاریگەریی لەسەر مانەوەی ئیلتیزامکردنی لایەنەکان بە جێبەجێکردنی پەیماننامەکە نابێ، ئەمەش سێ هۆکاری هەیە:

---

١٦٠. د. محمد سامی عبدالحمید، القانون الدبلوماسی، من کتاب- القانون الدولی العام، المصدر السابق، ص٣٠٧-٣٠٨.

• ئەم دەقە گوزارشتە لە چەمکی وەفاداری بە پەیماننامە (الوفاء بالمعاهدات)، کە پێویستە خاسیەتی ئیلزامی پەیماننامە ڕووبەڕوی هەر لەرینێك ببێت کە لە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتەکان دێتەدی.

• ئارەزووکردن لە بەرقەرارکردنی ئارامی و ئەمان لە پەیوەندییە یاساییە نێودەوڵەتییەکان، کە بە هۆی پابەندبوون بە پەیماننامەکەوە دێتەدی و پچڕانی پەیوەندی دەپیلۆماسی و قونسولییەکان کاریگەر نابێت.

• ئەگەر پچڕانی پەیوەندیی دیپلۆماسی و قونسولی ببێتە هۆی وەستانی پەیوەندییە دیپلۆماسییە ئاساییەکانی نێوان دەوڵەتان، دیارنەمانی هۆیەك کە پێویستە بۆ جێبەجێکردنی پەیماننامە، لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەت پەنا بۆ دەوڵەتی تر یان تەنانەت ئامرازی راستەوخۆش دەبات کە بۆ ناردنی هەموو نامەو پەیوەندییەکان پێویستە بۆ جێبەجێکردنی پەیماننامە.

٢- ریزپەڕەکەش ئەوەیە کە بە شێوەیەك پچڕانی پەیوەندیی دیپلۆماسی و قونسولی کاریگەریی لەسەر پەیماننامەیەك بەجێبێڵێت، ئەگەر هاتوو بە هۆی بوونی ئەو پەیوەندییە پەیماننامەکە جێبەجێ بێت. لەراستیدا بوونی ئەم حاڵەتە وەك ریساکە گرنگە.

گرنگترین ئەو پەیماننامانەی کە کاریگەرییان نابێت بە پچڕانی پەیوەندیی دیپلۆماسی و قونسولی، پەیماننامەکانی تایبەت بە سنوورو پەیماننامەکانی فرەلایەنەن.[١٦١]

**هەشتەم:** کۆتاییهێنان بە پەیماننامە بە هۆی پێشێلکردنیەوە (انهاء المعاهدة نتيجة خرقها)

ئەگەر لە رێککەوتننامەیەکی دوو قۆڵیدا، لایەنێك ئیلتیزاماتی خۆی جێبەجێنەکرد، ئەوا لایەنەکەی تر بۆی هەیە کۆتایی بە پەیماننامەکە بهێنێت یان کار بە بەشێکی یان هەر هەمووی نەکات. بەڵام لە رێککەوتننامەیەکی فرەلایەندا ئەگەر لایەنێك پەیماننامەکەی پێشێلکرد، ئەوا لایەنەکانی تر بۆیان هەیە یان بەردەوامبن یان کۆتایی پێبێنن و هەڵیوەشێننەوە جا هەموو یان بەشێکی پەیماننامەکە بێ بەرامبەر ئەو لایەنەی کە پێشێلی کردووە بەو پێیەی کە بارودۆخەکە دەیخوازێت. هەروەك لە ماددەی (٦٠) لە رێککەوتننامەی ڤیێننادا هاتووە.

**نۆیەم: جەنگ**

جەنگ پچڕانی تەواوەتی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی لێ دەکەوێتەوە، حاڵەتی جەنگ بێگومان گونجاو نییە بۆ مەبەستی پەیماننامەو جەنگ هۆیەکە بۆ کۆتاییهێنانی، بەڵام وەك

١٦١. د. سهيل حسين الفتلاوى وصاحبه، المصدر السابق، ص١٣٥.

شۆڕش وایە بۆ دەستووری ناوخۆ، هۆیەکی ناسروشتییە، بەڵکو هۆیەکە لە دەرەوەی یاسای دانراودا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا حاڵەتی نائاساییمان هەیە سەبارەت بە جەنگ و کاریگەریی لەسەر پەیماننامە.[١٦٢] گرفتی واقیعی بەنسبەت جەنگەوە لەوەدایە کە لە لایەك لەوانەیە دەوڵەت جەنگ دژی لایەنێکی تر هەڵبگیرسێنێ وەك هۆیەك بۆ خۆرزگارکردن لە پەیماننامەیەك کە لە بەرژەوەندیدا نییە و نایەوێت، لە لایەکی تر جەنگ لەگەڵ بەردەوامی پەیوەندیی دۆستانە و ئاشتییانەدا ناکۆکە کە لەنێوان دەوڵەتاندا پێویستە هەبێت، کە ئەمەش پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان بە پلەی یەکەم دەیرەخسێنن، بێگومان حاڵەتی یەکەم وامان لێ دەکات کە بڵێین پەیماننامەکە بمێنێ (بە پێچەوانەی مەبەستی دەوڵەت)، بەڵام وەرگرتن بە چارەی دووەم بێگومان بۆچوونی ترمان پێ دەدات.[١٦٣]

بۆ ئاسانکردنی باسەکە، لەم رووەوە دەبێ لەسەر ئەو رایە بڕۆین کە پەیماننامە — بە گوێرەی کاریگەریی جەنگ لەسەری — بەپێی بابەتەکانی دابەش دەبێت بۆ چەند جۆرێك، هەندێکیان کاریگەر نابن بە جەنگ، هەندێکیان جەنگ کاریگەریی دەوەستێنێ، هەندێکیشیان کۆتایی بە جەنگ دێنێ.[١٦٤]

- سەبارەت بە پەیماننامەی دوو قۆڵی، ئەوا بە هەڵگیرسانی شەڕ کۆتایی پێدێت یان دەوەستێت، ئەگەر بۆ رێکخستنی پەیوەندییەکان بەسترابێت لە کاتی ئاشتیدا لەنێوان دوو دەوڵەتە بە شەڕهاتووەکە، وەك پەیماننامەکانی تایبەت بە بازرگانی و پەیوەندیی ئابووری و کۆمەڵایەتی یان ئەوانەی سیمایەکی سیاسییان هەیە یان پەیماننامەی هاریکاری، ئەگەر نیەتی دوو لایەنەکەو خواستیان مەبەستێکی پێچەوانەی نەبێت. بەڵام کە بۆ رێکخستنی پەیوەندیی لە کاتی جەنگدا رێکخرابێت، ئەوا بە بەرپابوونی جەنگ کۆتایی پێ نایەت وەك پەیماننامەی تایبەت بە مامەڵەکردن لەگەڵ دیل و بریندارو پاراستنی خەڵکی سیڤیل و...هتد. هەروەها بەرپابوونی جەنگ کارناکاتە سەر ئەو پێگە بابەتییەی کە پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی یان دوو قۆڵی دروستی کردووە، وەك دیاریکردنی سنوور، وازهێنان لە هەرێمێك یان ئەو پەیماننامانەی

---

١٦٢. شارل روسو، المصدر السابق، ص٧٥.

١٦٣. د.احمد ابو الوفاء، الوسيط...، ص١٨٧.

١٦٤. د. محمد طلعت الغنيمي، قانون السلام، ص٤٧٩ وما بعدها، و د. محمد سامي عبدالحميد و د. مصطفى سلامة حسين، ص٩٩ وما بعدها.

که بۆ مافی یاوەری (هاوشانێتی — حقوق الأرتفاق)ە، بە مەرجێك ئـەو پەیماننامەیـە هـەموو ئەرك و مەرجەكانی دروست بن و لەژێر كاریگەریی بـە تـۆپزی و پێچـەوانەی ڕێسـای یاسـای نێودەوڵەتی نەبەسترابن.

- هەرچی پەیماننامەی چەند لایەنەیە، ئەوا جێبەجێكردنی دەوەسـتێت سـەبارەت ئـەو دەوڵەتانەی لە جەنگدان ئەگەر پەیوەندیی بە ڕێكخستنی پەیوەندیی لایەنەكان نەبێت لە كـاتی جەنگدا (بێگومان جەنگ كاریگەریی نابێ لەسەر پەیماننامەكە بەنسبەت ئەو دەوڵەتانـەی كـە لە جەنگدا نین یان پەیوەندیی ئەمان لەگەڵ هەریەكە لە دەوڵەتە بەشەڕهاتووەكان)، بـەڵام ئـەو پەیماننامانەی كە پەیوەندیی لایەنەكان ڕێكدەخەن لـەكاتی جەنگـدا، وەك ڕێككەوتننامـەكانی یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی و ڕێككەوتننامەكانی ساڵی ١٩٤٩ ژنـێڤ، ئـەوا دەمێننـەوەو لـە جێبەجێكردندا بەردەوام دەبن، چونكە لە بنەڕەتدا بۆ ڕێكخستنی ئەم بارە هاتۆنەتەئاراوە.

**دەیەم:** هاتنە ئارای ڕێسایەكی بەرفەرمانی نوێ لە ڕێساكانی یاسای نێودەوڵەتی

وەك پێشتر باسمانكرد، ڕێسای بەرفەرمان، ئەو ڕێسایەیە كە ناكرێ بە پێچـەوانەی ئـەوەوە ڕێككەوتن بكرێ ئەگەر بە ڕەزامەندی كۆمەڵی نێودەوڵەتی نەبێت بەگشتی. بۆیە لـە مـاددەی (٦٤)ی ڕێككەوتننامەی ڤییەننادا هاتووە، ئەگەر ڕێسایەكی بەركاری نوێ لە ڕێساكانی یاسـای گشتیی نێودەوڵەتی دەركەوت، ئەوا هەر پەیماننامەیـەك كـە دژی ئـەم ڕێسـایە بێـت، پوچـەڵ دەبێتەوەو چیدیكە كاری پێ ناكرێ.

**ب-** لە كاروەستانی (وقف) جێبەجێكردنی پەیماننامەی نێودەوڵەتی.

گرنگترین هۆیـەكانی وەسـتانی پەیماننامەیـەك لـە جێبەجێكردنـدا، هـەمان ئـەو هۆیانـە دەگرێتەوە كە بۆ نەهێشتن و بەسەرچوونی پەیماننامە پێشتر باسكران، بۆیە دەكـرێ پەیماننامـە لەم حاڵەتانەدا لەكاركردن بوەستێ [١٦٥]:

- بە ڕەزامەندیی لایەنەكان یان بەگوێرەی دەقێكی پەیماننامە.
- بە بەستنی پەیماننامەیەكی دواتر.

---

١٦٥. شارل روسو، ص٧٢ وما بعدها ود. غـازي حسـن صـباريني، ص٦٧ ومـا بعـدها، و د.أحمـد أبوالوفـا، ص١٨٩ وما بعدها.

- به هۆی پێشێلکردنی پەیماننامە.
- به هۆی گۆڕانێکی گرنگی بارودۆخ.
- به هۆی مەحاڵبوونی جێبەجێکردن.
- به هۆی پچڕانی پەیوەندیی دیپلۆماسی و قونسوڵی.
- به هۆی جەنگ.

ج- جێکەوتەکانی بەکۆتاهاتنی پەیماننامە یان کارپێ نەکردن

له ماددەی (٧٠) ی ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٦٩ و ١٩٨٨ ی ڤیێننا دا هاتووە کە:

- لایەنەکان ئازاد دەبن ودەبورێن له پابەندبوونی بەردەوام به جێبەجێکردنی پەیماننامەکە.
- هیچ ماف یان پابەندبوون یان بارێکی یاسایی زیانی پێ ناگات بەهۆی جێبەجێکردنی پەیماننامە پێش نەمانی پەیماننامە.
- هەروەها وەستانی پەیماننامە ئەم کاریگەرییانەی دەبێ:
- لایەنەکان دەبورێنێ له پابەندبوون به جێبەجێکردن لەو ماوەیەدا.
- هیچ کاریگەرییەکی نابێ لەسەر پەیوەندیی یاسایی ئاسایی نێوان لایەنەکان بەگوێرەی پەیماننامە.
- لایەنەکان نابێ هیچ کارێك بکەن لەکاتی وەستانی پەیماننامە کە گرفت بۆ دەستپێکردنەوەی کارکردن به پەیماننامەکە دروست بکا.

د- ئەو ڕێوشوێنانەی کە پێویستە بگیرێنەبەر بۆ چارەسەری ئەو ناکۆکییەی کە لە بەکۆتاهاتن یان وەستانی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی دێتە ئاراوە.

بێگومان واژۆکردن و بەستنی پەیماننامە، هەنگاوی سەرەتایین لە ژیانی هەر پەیماننامەیەکدا.دوای ئەوەی گرفتەکانی تایبەت بەتەفسیرکردن و جێبەجێکردن دێننە پێشەوە، ئەگەر لایەنەکان لەسەر ئەمە ڕێکنەکەون ئەوا هیچ یەکێکیان مافی ئەوەی نییە کە لەسەر ڕاست و دروستی خۆی له تەفسیر و جێبەجێکردنی پەیماننامە سوور بێت، لێرەوە گرنگە کە دەقێك بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو ناکۆکییانە هەبێ کە له پەیماننامەی نێودەوڵەتی دێتە ئاراوە.

ڕێککەوتننامەی١٩٦٩ و ١٩٨٦ ی ڤیەننا به دوو قۆناغ چارەیان بۆ ئەو ناکۆکییانە داناوە کە له ئەنجامی پووچەڵبوونەوە یان بەکۆتاهاتن یان وەستان و لە کارخستنی جێبەجێکردنی پەیماننامە دێتە ئاراوە.

• به گوێرەی ماددەی (٦٥) ئەو لایەنەی کە باس لە پووچەڵبوونەوە یان بـەکۆتاهاتن یـان وەستانی پەیماننامە دەکات دەبێ لایەنەکەی تر ئاگادار بکاتـەوەو هۆیـەکانی گرتنەبـەری ئـەو هەڵوێستەی خۆی دیاری بکات و ماوەیەك ڕێزی لێ بگرێ (سێ مانگ)، پەنا بباتەبەر ئامرازی چارەسەری ئاشتییانە کە لـە مـاددە ٣٣ بەڵێننامـەی نەتـەوە یەکگرتووەکانـدا هـاتووە، وەك (ناویژیوانی و،کاری پیاوچاکان و....... هتد).

• لە ماددەی (٦٦) تەواوکەری گەرەنتی ئەمانە هاتووە کـە ناکۆکییـەکانی تایبـەت بـە ڕێسـای بەرفـەرمان بداتــە دادگـای دادی نێودەوڵـەتی، ئەگـەر لایەنـەکان لەسـەر ناوبـژیوان ڕێککەوتن. بەلاّم سەبارەت بەهۆیەکانی تر، ئەوا دەکرێ چارەسەر بکرێ بە ناردنی داواکاری بۆ سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان.

کەواتە ماددەی (٦٦) دوو چارەسەری بۆ داناوە:

• چارەیەکی یاسایی کە دەیەوێ بگاتە چارەسـەرێکی کۆتـایی و بابـەتی بـۆ نـاکۆکیی تایبەت بە ڕێسای بەرفەرمان، بـە بڕیـاری دادگـای دادی نێودەوڵـەتی یـان دادگـای تـەحکیم (ناوبژیوانی).

• چارەیەکی سیاسی سەبارەت بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی سازانکاری — گونجانـدن - بـۆ هۆیەکانی تری کۆتاییهێنان یان وەستانی جێبەجێکردنی پەیماننامە، بەبێ گەیشتن بە چارەیەکی کۆتایی، چونکە لیژنەی تەوفیق ڕاپۆرت پێشکەش دەکات کە لایەنەکان ئیلتزام ناکەن ئەگەرچی چارەسەری دۆستانە پێشکەش دەکات.

ه- پووچەڵ بوون یان کشانەوە یان وەستانی بەشێك لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی.

مـــاددەی (٤٤) لـــە ڕێککەوتننامـــەکانی ١٩٦٩ و ١٩٨٦ دا نووســـیویەتی کـــە داوای پووچەڵکردنەوەی یان وستان یان کشانەوە لە پەیماننامە- وەك ڕێسا- بۆ هەموو پەیماننامەیـەك دەبێ، ئەگەر دەقێکی پێچەوانە نەبێ یان لایەنەکان لەسەر ئەوە ڕێکنەکەون. لەگـەڵ ئەوەشـدا بـەگوێرەی ئـەم ماددەیـە دەکـرێ، دەقـەکانی پەیماننامەکەیـەك لەیـەك جیابکرێنـەوە، واتـە هەڵوەشاندنەوە یا کشانەوە یان لەکاروەستانی پەیماننامەیەك چەند دەقێك بگرێتەوە بەمەرجێك:

• بتوانرێ دەقەکان لەبواری جێبەجێکردندا لەکۆی پەیماننامەکە، لە یەکتر جیا بکرێنەوە،.

• ئەگەر لە ڕێگەی پەیماننامەکە خۆیەوە، یان بەهەر ڕێگایەکی تر ئـەوە سـەلمێنرا کـە قبوڵکردنی ئەو بەندانە (دەق)، بۆ ڕەزامەندی لایەن یـان لایەنـەکانی تـر بنـەمای پاپەنـدبوون نەبووە بە پەیماننامەکە.

• پێویستە ئەوە لەبەرچاوبگیرێ کە جێبەجێکردنی ئەوەی کە ماوە لە پەیماننامەکە نادادپەروەری نەهێنێتە ئاراوە.

• ئەو خالانەی سەرەوە بەسەر ئەو بارانەدا جێبەجێ نابێت کە تۆبزی کردووە بەرامبەر بە نوێنەری دەوڵەت یان رێکخراوێك، یان دەوڵەت خۆی (رێکخراو)، یان تایبەت بە پەیماننامەیەك کە پێچەوانەی رێسایەکی بەرکار بێت لە رێساکانی یاسای نێودەوڵەتی.

و- لەدەستدان (نەمانی) مافی داواکردن بۆ پووچەڵکردنەوە یان کۆتاییهێنان یان راوەستان یان کشانەوە لە پەیماننامە. بەگوێرەی ماددەی ٤٥، لە دوو حاڵەتدا ناتوانرێ دەست بگرێ بە هۆکانی پووچەڵکردنەوە یان کشانەوە یان لەکاروەستانی پەیماننامەیەك کە ئەوانیش بریتین لە:

• ئەگەر بەراشکاوانە رازی بوو لەسەر ئەوەی کە پەیماننامەکە دروستە یان دەبێ بەردەوام بێت لە بەدیهێنانی.

• یان کە بە شاراوەیی ئەوەی نیشاندا، لە رەفتاری دەرکەوت کە رازی بووە یان وازی هێناوە لە مافی خۆی.

## ٦- جێ بەجێکردنی پەیماننامە

رێسای یاسای گشتیی چەسپاو ئەوەیە کە لایەنەکانی گرێبەست دەبێ پابەندبن بە رێزگرتن و جێبەجێکردنی ئەو ئیلتیزاماتانەی کە خۆیان لەو پەیماننامەیەی کردوویانە، دێتەئاراوە. ئەمەش لە یاساو کاری نێودەوڵەتی و ماددەی (٢٦) لە رێککەوتننامەی ١٩٦٩ی ڤیەننا دا هاتووە کە دەبێ بە نیەتپاکییەوە پەیماننامە جێبەجێ بێت، ئەمەش سێ لایەن دەگرێتەوە: یەکەمیان بنەمای یاسایی هێزی پابەندبوونە بە پەیماننامە، دووەمیان پەیوەندیی بە کاریگەریی هێزی پابەندبوونەوە هەیە بەرامبەر بەلایەنەکان، سێیەمیان ئەو گەرەنتیانەیە کە دەستەبەری جێبەجێکردنی پەیماننامە دەکەن.

### یەکەم: بنەمای یاسایی هێزی ئیلزامی بۆ پەیماننامە

خاسیەتی ئیلزامیی پەیماننامەکان، دەگەرێتەوە بۆ چەند رێسایەکی عورفی کە پابەندبوون دەخەنە ئەستۆی لایەنەکانەوە، چونکە ئامانجی ئەم رێسایە ئەوەیە رێز لە پەیماننامە بگیرێ، ئەمەش یەکێکە لە رێسا گرنگەکانی یاسای نیودەوڵەتیی هاوچەرخ کە جەخت دەکاتەوە لەسەر جێبەجێکردنی راستگۆیانە بۆ بەجێهێنان و پابەندبوون بە پابەندبوونەکانی پەیماننامەو

سەرچاوەکانی تری یاسای نێودەوڵەتی وەك (ماددەی ٢، برگەی ٢) لە بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاماژەی بۆ دەکات.

لەم ناوەدا هەندێك پێیانوایە کە پرینسیپی هێزی ئیلزامیی پەیماننامە، لەسەر بنەمای ترس لە دەرئەنجامەکانی و دەرچوون لە پەیماننامە وەستاوە، بە تایبەت مەترسی بە شوێنکەوتن (الملاحقە)و بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی و ئەو قەرەبووکردنەوەیەی کە بە هۆیەوە دێتە ئاراوە. هەندێکی تر پێیانوایە کە رێزگرتنی پەیماننامە پێویستە بۆ دەستەبەرکردنی چاکەو خێری گشتیی کۆمەڵی نێودەوڵەتی بە تایبەت ئارامی و ئەمانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و بە هێزکردن و پشتگیری هەموو لایەنەکانی هاریکاریکردنی نێودەوڵەتی (التعاون الدولی). ئەمەی دواییش یەکێکە لە پرینسیپەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و رێسای عورفی نێودەوڵەتی.

بە گشتیی بنەمای هێزی ئیلزامی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان لە چەند رێساو پرینسیپێکدا خۆی دەبینێتەوە بریتین لە[١٦٦]:

١. رێسای پیرۆزیی رێککەوتننامەکانی نێوان دەوڵەتان (قاعدة قدسیة الأتفاقات بین الدول)، واتە دەبێ رێز لە ئەحکامەکانی پەیماننامە بگیرێ و جێبەجێ بکرێ و پێیەوە پابەندبن تا بە یەکێك لە رێبازەکانی نەمانی پەیماننامە کۆتایی پێدێت.

٢. گرێبەست یاسایە بۆ لایەنەکانی رێککەوتن (العقد شریعة المتعاقدین- الأتفاق قانون المتعاقدین - مبدا الوفاء بالعهد- المتعاقد عند تعاقده – المتعاهد عبد تعاقده- pacta sunt servanda) ئەم پرینسیپە لە یاسای شارستانیدا هەیە کە ئەویش هێزی پابەندبوونی گرێبەستە (القوة الملزمة للعقد). واتە نابێ گرێبەست بە خواستی تاکلایەنە هەڵبوەشێنرێتەوە، ئەمەش وەکو رێسایەکی بنەڕەتیی وایە لە هەموو سیستەمە یاساییەکاندا کە تیایدا رێزگرتن لە پەیماننامە لە یاسای نێودەوڵەتیدا لەسەرووی خواستی دەوڵەتانی گرێبەستەکەیە. هەربۆیە هیچ سیستەمێکی یاسایی بە بێ ئەم سیستەمە نییە. لە روی پراکتیکیشەوە گومانێك لەم پرینسیپە نییە، راست و دروستیشی لە لایەن دادگای نێودەوڵەتی و نیشتیمانییەوە سەلمێنراوە، هەر بۆیە بۆ هیچ دەوڵەتێك نییە بە بیانووی بارگرانیی پەیماننامە یان بە تۆپزی سەپاو لەژێر کاریگەریی بارێکی تایبەتدا لە جێبەجێکردنی پاشگەز بێتەوە، چونکە دەوڵەت دەبێتە کۆیلەی گرێبەستەکەی بۆ ئەوەی ئاژاوەو ململانێ و جەنگ دروست نەبێ.

---

١٦٦. د. حامد سلطان، ص١٨٠، د. علي صادق ابو هیف، القانون الدولي العام، ص٥٥٦وما بعدها.

٣. پرینسیپی ڕەزامەندیی بەکۆت و بەند یان پابەندکار (مبدأ الرضا مقید او ملزم)، بەگوێرەی ئەم پرینسیپە ڕەزامەندی یان ڕێککەوتن ئیلتیزامی نێودەوڵەتی دروست دەکات.

٤. پرینسیپی نیەتپاکی (مبدأ حسن النية – bons fieds) پرینسیپێکی چەسپاوە لە یاسای ناوخۆو نێودەوڵەتیدا، واتە دەبێ بە دڵسۆزی جێبەجێ بکرێت.

**دووەم: جێکەوت و کاریگەریی هێزی ئیلزامی پەیماننامەکان**

لەم باسەدا کاریگەریی پەیماننامە لەسەر ئاستی لایەنەکانی پەیماننامەکە و کەسانی تر (پرینسیپی ڕێژەیی پەیماننامەکان) باس دەکەین.

**أ- سەبارەت بە لایەنەکانی پەیماننامە**

هەروەك باسکرا پەیماننامە لە ڕووی سروشتی یاساییەوە ئیلزامیەتی هەیە، وەك لە ماددەی ٢٦ی ڕێککەوتننامەی ڤیەننادا هاتووە، لە ڕووی پرینسیپی جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی پەیماننامە دەبێ لایەنەکان بەنیەتپاکی جێبەجێی بکەن وەك لە ماددەی (٢٦) و بڕگەی دووەم لە ماددەی (٢) بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە، لە ڕووی مەدای جێبەجێکردنی ئەحکامەکانیشەوە، نابێ هیچ لایەنێك بەبیانووی دەستگرتن بە یاسای ناوخۆوە پەیماننامە جێبەجێ نەکات، وەك لە ماددەی (٢٧)ی ڕێککەوتننامەی ڤیەننادا هاتووە، دادگای دادی نێودەوڵەتی-یش ئەوەی دووپات کردۆتەوە. لە ڕووی چۆنیەتی جێبەجێکردنی پەیماننامە لەناوخۆی دەوڵەتدا، چەند ڕێبازێك هەن، لەوانە[١٦٧]:

١- تیۆریی دوانەیی یاسا: دەڵێ دەبێ دوای پەیماننامە، یاسایەکی ناوخۆ دەربچێت، حوکمەکانی پەیماننامەکەی تێدا بن بۆ ئەوەی لەناوخۆی وڵاتدا جێبەجێ ببێت.

٢- ڕێبازی یەکانە یاسا: دەڵێ پێویست نییە یاسا دەربچێ، چونکە تەنیا بە بەستنی پەیماننامە دەبێتە یاسایەکی ناوخۆ و دەبێ جێبەجێ ببێت. چونکە سەروەرێتیی زیاتری دەوڵەتێك بڕیاری لەسەر داوە.

٣- بۆ چوونی زانا (برتان)، وەك ڕێبازێکی میانڕەوی ناوەند لە نێوان دوو ڕێبازەکەی پێشوودا، دەڵێ پەیماننامە لەناوخۆی دەوڵەتدا ئەگەر پەسند نەکرێت، جێبەجێ نابێت، کە لەلایەن پەرلەمانی ئەو وڵاتەوە، وەك یاسای ناوخۆی لێ دێت.

---

١٦٧. د. حامد سلطان، ص١٨٠و دواتر، ود.أبراهيم محمد العناني، ص١٠٤.

بۆیە ئەم هۆیانەی خوارەوە ناکرێ بوروژێنرێن بەهۆی ئەوەی کـە لەگـەڵ پەیماننامـەدا هاوڕێك نیین[١٦٨].

• گۆڕانی سیستەمی دەوڵەت، یان سەرۆکایەتی یـان حکوومـەت، ئەگـەر ڕێکخـراوی نێودەوڵەتی لایەنێك بوو لە پەیماننامەکە، ئەوا گۆڕان لە پێکهاتەیدا بەکشانەوە یـان دەرکـردن یان پاڵدان، یان گۆڕان لە سەرۆك و دەزگاکانیدا. هەموو ئەوانە بە لەبەرچاوگرتنی ئـەوەی کـە پرینسیپی بەردەوامی دەوڵەت یان ڕێکخراوەکە دەبێ هەبێت.

• خستنەڕوو و دۆزینەوەی ئەوەی کە پەیماننامەکە هاوڕێك نییە لەگـەڵ دەسـتوور یـان ڕێسای یاسایی لەناو دەوڵەتدا، مەگەر جیاوازییەکـە زۆر ڕوون بێـت و ئەمـەش پابەندییـە بـە پرینسیپی بالآدەستیی یاسای نێودەوڵەتی بەسەر یاسای ناوخۆدا.

• بەرچاوکەوتنی ئەوەی کە لایەنێك دەڵێ پەیماننامەکە ناکۆکە لەگەڵ پەیماننامەیـەکی تردا کە لەگـەڵ کەسـێکی تـردا بەسـتوویەتی، ئەمـەش پابەندبوونـە بـە پرینسـیپی ڕێـژەیی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان. هەروەها سەبارەت بـە چوارچـێوەی هـەموو دەوڵـەت و سـنووری هەرێمییەوە، ئەوا بەسەر هەموو هەرێمەکەدا جێبەجێ دەبێت، مەگەر نیەتی پێچـەوانە لـەناو پەیماننامەکەدا هەبێت، یان بەشێوازی تر بسەلمێنرێت. لەڕووی کات و زەمەنەوە کە تایبەتە بـە ئـەوەی کـە کـەی جێبـەجێ دەبێـت، مـاوەی چـەندە، جێبـەجێبوونی بەشـێوەیەکی کـاتی، نەگەڕانەوەی ئەحکامەکانی بۆ دواوە (تەنیا لە کاتێکدا کە نیـەتیان وابێـت، مـاددەی ٢٨ لـە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا).

### ب- کاریگەریی پەیماننامە سەبارەت بە کەسی تر (پرینسیپی ڕێژەیی) پەیماننامەکان

ناوەڕۆکی ئەم پرینسیپە ئەوەیە کە پەیماننامەی نێودەوڵەتی لـە ڕووی پرینسـیپەوە، تـەنیا ماف و ئەرك لەنێوان لایەنەکانیدا بەرجەستە دەکات، ئەمەش پرینسیپێکی بنەڕەتییە لەیاسای پەیماننامەکاندا، چونکە پەیماننامە وەك ڕێسایەکی بنەڕەتی دەرهەق بە هەمووان بەڵگە نییـە- ليس لها حجية تجاه الكافـة-، کە ئەمەش بۆ سێ بنـەمای سـەرەکی دەگەڕێتـەوە کـە ئـەویش پرینسیپی بالآدەستیی خواستە (مبدأ سـلطان الأرادة) واتـە پابەنـدبوون بـە خواسـتی خۆتـە، پرینسیپی ڕەزامەندی (مبدأ التراضی) واتە تەنیا ئەوانەی گرێبەستیان کردووەو پێی رازیبـوون

---

١٦٨. د.احمد أبوالوفا، الوسيط....، ص١٤٧.

پابەند دەبن، پرینسیپی یەکسانی لە سەروەرێتیدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ حاڵەتی ڕیزپەڕ هەن کە لەوانەیە کاریگەرییان بۆ سەر بەرژەوەندی یان دژبە بەرژەوەندیی کەسانی تر هەبێت.[169]

**١- مەرجدانان بۆ بەرژەوەندیی کەسێکی تر (الاشتراط لمصلحة الغیر)**

تەبای یاسای ناوخۆ، لە بواری نێودەوڵەتیشدا ئەگەر لایەنەکان نیازیان وا بووبێت کە ماف بدەنە کەسێکی ترو ئەم کەسەش قبوڵی بکات، ئەوا هیچ ڕێگرێك نییە، وەك لە ماددەی ٣٦ داهاتووە، بەلاّم بەگوێرەی ماددەی ٣٦ لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا نابێ لایەنەکان بەبێ ڕەزامەندی ئەو کەسەی کە مافەکەی بۆ داندراوە ئەو مافە هەڵبوەشێننەوە، یان بیگۆڕن.

**٢- مەرجی پێشوەخت بۆ لەبەرچاوگرتنی دەوڵەت (الشرط الأکثر رعایة)**

هەندێ پەیماننامەی ئابووری و بازرگانی و کەشتیوانی و قونسوڵی و گومرگی، نیشەنیی بێگانان و ڕێککەوتننامەکانی کار دەنووسن کە لەسەر بنەمای مامەڵەکردنی وەکیەك لەگەڵ یەکتردا، دوو دەوڵەت پەیمان بەیەکتری دەدەن کە لە ئایندە هەر پەیماننامەیەك لەگەڵ لایەنی سێیەمدا ببەستێ و هەر جیاوکێك بە دەوڵەتی سێیەم بدا، ئەوا یەکێ لەو دووانەی یەکەم کە لایەن نییە لە ڕێککەوتنەکە لەگەڵ کەسی سێیەمدا هەمان جیاووك و مافی دەبێت و سوود لە لایەنەکانی ئەو ڕێککەوتننامە دەبینێ کە لایەن نییە تێیدا بەبێ ئەوەی بچێتە ناو ئەو ڕێکەوتننامەیەوە.

**٣- ئەو پەیماننامەی کە دواتر دەوڵەت دەچێتە ناویەوە (الانضمام اللاحق)**

لەم حاڵەتەدا پەیماننامەی داخراو هەیە کە دەقێکی وای تێدا نییە ڕێگە بە دەوڵەتی تر بدات و بەئەندام قبوڵی بکات، بۆیە لەگەڵ لایەنەکاندا بۆ قبوڵبوون پێویستی بە دانوستان هەیە. هەرچی پەیماننامەی کراوەیە ئەوا دەقێکی وای تێدایە و ڕێگە بە کەسی تر دەدات کە پاشان ببێتە ئەندام تێیدا، هەروا مافی هەموو دەوڵەتانە ببنە ئەندام لە پەیماننامەیەکی وای بەکۆمەڵدا مەگەر دەقێکی پێچەوانەی ئەمە لە پەیماننامەکەدا هەبێت.

**٤- ئەو پەیماننامانەی کە بارێکی هەمیشەیی ڕێکدەخەن**

هەموو دەوڵەتان دەبێ ڕێز لەو پرینسیپانە بگرن کە بۆ ڕێکخستنی بارێکی بەردەوام و هەمیشەیی هاتۆتە ئاراوە، لە پەیماننامە یاسادارێژەکاندا کە جێی بایەخی کۆمەڵی

---

١٦٩. د. حامد سلطان، المصدر السابق، ص١٨٣ ومابعدها، او د. عصام العطیة، المصدر السابق، ص١٧٣ وما یعدها.

نێودەوڵەتیین، ئەو دەوڵەتەی لە دانانیدا بەشداربووە یان نا بەهایەك وەردەگرێ. وەك ئەو سیستەمە یاساییانەی کە تایبەتن بە بێ لایەنی هەمیشەیی یان هەرێمێك کە سیفەتی بەردەوامی هەیە. لەڕاستیدا بنەمای ئیلتیزامکردنەکەش لەم حاڵەتەدا تەنیا پەیماننامەکە نییە، بەڵکو ڕێسایەکی عورفی گشتیی ئەبستراکتە کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی دەبێ ڕێز لە بارودۆخی ئارامبەخشی نێودەوڵەتی بگرن.

**٥- ئەو پەیماننامانەی کە ئەرك دەخەنە ئەستۆی کەسانی ترەوە**

ئەم ڕێسایە بەو مانایە نییە کە ناکرێ پەیماننامە سەرچاوەی زیان گەیاندن بێ بەوانی تر. چونکە سروشتی ژیانی نێودەوڵەتی وایە کە ئەو پەیوەندییانەی لەنێوان یەکە کۆمەڵایەتییەکاندا دروست دەبن، دەکرێ زیان بە بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی تر بگەیەنن، تەبای پەیوەندییانەی کە لەنێوان تاکەکاندا دروست دەبن.[١٧٠] بەڵام ڕێسای گشتی ئەوەیە کە ئیلتیزام دروستکردن لەسەر ئەستۆی ئەوانی تر، دەبێ بە ڕەزامەندی خۆیان بێت، هەروەك لە ماددەی ٣٥ی ڕێکەوتننامەی ڤیەننادا هاتووە کە ئەوکاتە ئیلتیزام دەکەوێتە سەر ئەستۆی کەسێکی ترکە لایەنەکان نیازێکی وایان هەبووبێ و ئەو دەوڵەتەی تریش بە ئاشکرا قبوڵی کردبێت و پێی ڕازی بووبێت.

**سێیەم: گەرەنتییەکانی جێبەجێکردنی پەیماننامە**

جێبەجێ نەکردنی پەیماننامە لە لایەن هەر لایەنێکەوە بێ بە کارێکی ناڕەوایە و بەرپرسیارێتیی یاسایی دەکەوێتە ئەستۆو دەبێ قەرەبووی ئەو زیانە بکاتەوە کە لەمیانەی سەرپێچیکردن کەوتۆتەوە و زۆر جار لە پەیماننامە دەنووسرێت کە ناکۆکی نێوان لایەنەکان سەبارەت بە جێبەجێکردنی پەیماننامە بە ڕێگای ناوبژیوانی (تحكيم) یەکلادەکرێتەوە، یان بەیەکلاکردنەوەی دادوەری بۆ دیاریکردنی بەرپرسیارو بوارەکانی بەرپرسیاری و چۆنیەتی قەرەبووکردنەوە.

بیری گەرەنتی لە سەردەمی فیرعەونەکانەوە هەبووە. لە ئێستادا بەشێوەیەکی هاوچەرخ کۆمەڵە گەرەنتییەك هەن کە دەستەبەری جێبەجێکردنی ئیلتیزاماتی پەیمانە نێودەوڵەتییەکان دەکەن.[١٧١] بۆ نموونە دەوڵەتێك یان کۆمەڵە دەوڵەتێك کە لایەن نین لە پەیماننامەیەکدا گەرەنتی

---

١٧٠. د.حامد سلطان، المصدر السابق، ص١٨٥.

١٧١. د.محمد المجذوب، المصدر السابق، ص ص٥٥٦-٥٥٧.

بدەن کە دەسەلاّت و هێزی خۆیان بەکاردەهێنن، بۆ ناچارکردنی دەوڵەتێك کە ئیلیتزامەتەکانی خۆی جێبەجێ بکات.

١. داگیرکردنی بەشێك لە هەرێمی دەوڵەتێك بۆ ئەوەی بەڵێنی خۆی بەجێ بهێنێ، ئەمە زیاتر لە پەیماننامەی ئاشتەواییدا هەیە.

٢. دیاریکردنی داهاتی دەوڵەت بۆ وەفاداربوون بە قەرز.

٣. بوونی دەقێك لە پەیماننامە کە لەژێر سەرپەرشتی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیدا جێبەجێ بێت.

٤.لە چوارچێوەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا چەند ئامرازێکی گرنگ هەن بۆ گەرەنتی جێبەجێکردنی پەیماننامە، بۆ نموونە، بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەسەلاّتی وەرگرتنی ڕێوشوێنی پێویست دەداتە دەزگاکانی وەکو دەستەبەرێك بۆ جێبەجێکردنی دەقەکانی خۆی.

## ٧- شیکردنەوەی پەیماننامە

بێ گومان حوکمەکانی پەیماننامە لەلایەن لایەنەکانەوە بۆچوونی جیاواز وەردەگرن لەمەڕ دروستی مانای دەقەکانی یان دیاریکردنی مەدلولەکانی یان دیاریکردنی مەبەستە هاوبەشەکانی کە لایەنەکانی ڕێککەتننامە دەیانەوێ لەکاتی بەستنی پەیماننامەدا بەرجەستەیان بکەن، ئەو بۆچوونە جیاوازانە لە بواری نێودەوڵەتیدا بە ئامرازەکانی یەکلاکردنەوەی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان جێبەجێ دەبن، لایەنەکان لەوانەیە پەنا بۆ چەند ئاراستەیەك ببەن وەکو دەستەی ناوبژیوان، دەستەی دادوەری بۆ لێکدانەوەی ئەحکامەکان بەگوێرەی پرینسیپەکانی لێکدانەوە. لەوانەیە لایەنەکان خۆیان دەقەکان لێکبدەنەوە. لەم حاڵەتە دا سەربەستیی ڕەهایان هەیە کە [١٧٢]:

- دەکرێ لێکدانەوەکە لەگەڵ پرینسیپە گشتییەکانی شرۆڤەکاریدا بگونجێ یان نا.
- یان لەسەر تەفسیرێکی جیا ڕێکبکەون و بگەنە ڕێکەوتنێکی نارەسمی و ئەو تەفسیرەی کە لەسەری ڕێککەوتوون، جێبەجێ بکەن.
- یان ئەو دەقەی کە لەسەری ناکۆکن، بەهۆی ڕاگەیاندنێکەوە یان پرۆتۆکۆلێکی پاشکۆوە، لێکبدەنەوە.
- یان لەسەر تەفسیر و تۆمارکردنی ڕێکەوتنەکە لە پەیماننامەیەکی دواتر ڕێکبکەون کە بەهەمان ئامرازی ڕێککەوتنە ئەسڵییەکە لە دایك دەبێت و پێی دەوترێت تەفسیری رەسمی.

---

١٧٢. د. مأمون مصطفى، المصدر السابق، ص ص٧٨-٧٩.

ڕێککەوتننامەی ڤیەننا لە ماددەکانی ٣١ و ٣٢ و ٣٣ دا باس لە ڕێسا ئەسڵی وتەواوکارێتییەکانی لێکدانەوەی پەیماننامە دەکا کە پرینسیپە سەرەکییەکانی لێکدانەوەی پەیماننامە بریتین لە:

١. کە پەیماننامە بە نیەتپاکی و بەگوێرەی دەقی ئاسایی لە دەستەواژەکانی پەیماننامە لە چوارچێوەی تایبەتی خۆیدا، لەژێر ڕۆشنایی بابەت و مەبەستەکانیدا، لێکبدرێتەوە.

٢. پەیماننامە لە چوارچێوەی تایبەت بە پەیماننامە لێکبدرێتەوە، وێڕای دەقی پەیماننامەکەو دیباچەو کورتکراوەکانی ئەمانەش دەگرێتەوە:

- هەر ڕێککەوتنێکی تر کە بۆ تەفسیر یان جێبەجێکردنی ئەحکامەکان کردوویانە.
- هەر ڕێڕەوێکی ترکە لایەنەکان بۆ جێبەجێکردنی پەیماننامە بۆ تەفسیرکردنی پێی لەگەڵە.
- هەر ڕێسایەکی نێودەوڵەتی کە پەیوەندیی بە بابەتەکەوە هەیە و دەکرێ لە پەیوەندیی لایەنەکاندا جێبەجێ بکرێت.

هەروەها بۆ لێکدانەوەی دادوەری-یش چەند ڕێسایەك هەن کە دادگای نێودەوڵەتی کاریان لەسەردەکات، لەو ڕێسایانەش:

- پێویستە لێکدانەوە، نیەتپاکی تێدابێت.
- دەقە ڕوونەکان شرۆڤەو لێکدانەوەکردنیان پێ ناوێت.
- زاراوەی ئاسایی، ئەو مانایەیەی هەیە کە باوە، مادام ئەوە نەسەلمێندرێت کە لایەنەکان نیەتێکی تریان هەبووە.
- کارپێکردنی دەق باشترە لە پشتگوێخستن.
- ئەو دەقانەی کە کۆت و بەند لەسەر سەروەێتیی دەوڵەت دادەنێن، دەبێ بە بەرتەسکی لێکدانەوەیان بۆ بکرێ.
- تەفسیری پەیماننامە لە چوارچێوەی ئەو ئامانجەدا دەبێ کە لایەنەکان ویستوویانە بیهێننەدی.
- دەکرێ کاروباری لیژنەی ئامادەکاری وەك ئامرازێك لە ئامرازەکان، بۆ دیاریکردنی ناوەڕۆکی خواستی لایەنەکان، بەکاربهێنرێت.

## ٨- هەموارکردن و گۆڕانی پەیماننامە

هەمیشە لە بەستنی پەیماننامەدا ئەوە دەخوێندرێتەوە کە پێویستییەکی هەنووکەیی هەیە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی یان بارێکی دیاریکراو کە لایەنەکان دەیانەوێت بیهێننەدی، مادام

ژیان پێویستی بە بزاو وجوولەی بەردەوامە، کەواتە بۆ ئەوەی پەیماننامە باشترین سوودی بۆ لایەنەکان هەبێ، کارێکی گونجاوە کە پەیماننامە هەموار بکرێ.

یاساناسانی نێودەوڵەتی چەند زاراوەیەکیان بەکارهێناوە، لەوانە کرداری پاککردنەوەی پەیماننامە، یان چاو پێداخشاندنەوە، بەلام رێککەوتننامەی ڤیەننا هەمواری بۆ بەکارهێناوە. لایەنەکانی پەیماننامە دەتوانن هەموو یان بەشێکی هەموار بکەن، ئەوەش کاتێ کە گۆڕانێك لەو بارودۆخەدا دێتەدی کە پەیماننامەکەی تێدا بەستراوە، بەهۆی گۆڕانی هاوسەنگیی هێزی سیاسی و ئابووری و سەربازیی نێوان لایەنەکان، ئەوکاتەش دەقەکانی پەیماننامە لە گەڵ باری نوێدا ناگونجێن، ئیدی پێویستە هەموار بکرێن، دیارە گرفتیش دێتە پێش بە تایبەت بۆ ئەو پەیماننامانەی کە کاتێکی دیاریکراویان بۆ دانەنراوە.[173] هەروەك رێساکانی هەمواركردن لە ماددەی ٣٩و ٤٠ و رێساکانی گۆڕان لە ماددەی ٤١ ی رێککەوتننامەی ناوبراودا ڕوونکراونەتەوە.

## ٢-دابی نێودەوڵەتی

داب لە یاسای ناوخۆدا لە ڕووی زمانەوانییەوە بەڕاهاتنی خەڵك لەسەر رەوشتێك دەوترێ و دووپاتکردنەوەی ئەو ڕەوشتە بۆ ماوەیەکی زۆر بە جۆرێ کە بڕوایەکی گشتیی ئەوتۆ دروست بکات کە ئەو ڕەوشتە شایانی پەیڕەویکردنە.[174] لە یاسازانیشدا، داب بەو کۆمەڵە ڕێبازە دەگوترێت کە بەهۆی دووپاتکردنەوەیان ئەو جۆرە ڕەوشتەی سەرەوە دێتەکایەوە و دروست دەبێ و بڕوایەکی گشتی بە خەڵك دەسەلمێنێ کە ئەو ڕێبازە سەپاوەیەو پەیڕەو لێ کراوە.[175]

عورفی نێودەوڵەتی، سەرچاوەی راستەوخۆی دووەمی دروستکردنی ڕێسای یاسای نێودەوڵەتییە، هەندێ یاساناسان بە گرنگترین سەرچاوەی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی دادەنێن، چونکە زۆربەی ڕێسا نێودەوڵەتییەکان لە عورفەوە هاتوون، هەروەها ئەو ڕێسایانەی کە لە پەیماننامەیەکدا جێ دەگرن، زۆربەی جار گوزارشتە یان داڕشتنی ئەوەیە کە لە عورفەوە جێیان گرتووە پێش بەستنی پەیماننامە، هەروەها عورف چونکە ڕێساکانی گشتگیرن، بۆ هەموو دەوڵەتان پابەندکارن، بۆیە دەکەوێتە سەرووی پەیماننامەوە، لەکاتێکدا هێزی ئیلزامی

١٧٣. د. السيد مصطفى احمد ابو الخير، المصدر السابق، ص٦٢.

١٧٤. د. سعدی بەرزنجی، تیۆری گشتی ی یاسا، ١٩٨٩، ل.١٦١

١٧٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

پەیماننامە تەنیا بۆ ئەو دەوڵەتانەیە کە بەستوویانە، لە ئێستاشدا یاسای گشتیی نێودەوڵەتی پشتیوانی ئەم ئاڕاستەیە دەکات، زۆربەی ئەو ڕێساو ئەحکامانەی کە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان ڕێکدەخەن لەکاتی ئاشتی و جەنگ و بێ لایەنیدا لەسەر ئەو عورفە راهاتوون کە لەنێوان دەوڵەتاندا جێی خۆیان گرتووە.[176]

داب لە یاسای نێودەوڵەتیدا رەفتارێکی نێودەوڵەتییە کە لە ڕاهاتن و دووپاتکردنەوەی هەڵسوکەوتێك خۆی دەنوێنێ کە لەسەر ڕێبازێکی دیاریکراو و بەشێوەی ئەنجامدانی کارێك یان نەکردنی و هەستکردن بەپابەندبوون بەو ڕەفتارە، دێتە ئاراوە. واتە وەك ماف و ئەرکێك دێتەپێش کە یاسا دەستەبەر و پارێزگاری لێ دەکات و بەرپرسیارێتیی یاسایی-یش دەسەپێنێ بەسەر لادەردا. لەمەوە مەرجە کە بۆ دروستبوونی داب دوو ڕایەڵی سەرەکی هەبێت:[177]

١. **ڕایەڵی ماددیی (الركن المادي)**: بریتییە لەو کۆمەڵە ئەحکامە یاساییەی کە بەهۆی دووپاتبوونەوەیان، ئیلتیزامی دەوڵەتانییان لەسەر دروست دەبێ، لە سۆنگەی ئەمەوە ڕێساکان لە بیروڕای زۆربەی دەوڵەتاندا خاسیەتی ئیلزامییان وەرگرتووە. ڕاهاتن لەسەر نەریتێك کە لە هەڵسوکەوتی دەوڵەتان دووپات بێتەوە. ئەم ڕەفتارەی کە عورفەکە پێکدێنێت پێویستە گشتی بێت، واتە زۆربەی دەوڵەتان لەسەری بڕۆن و راهاتبن، لێرەدا گشتی بەمانای تێکڕای دەوڵەتان نییە، چونکە دەکرێ دابێکی نێودەوڵەتی تایبەت بێت، وەك ئەو دابەی پەیوەندیی نێوان چەند دەوڵەتێکی دیاریکراو رێکدەخات کە لە ڕووی شارستانییەوە لێکنزیکن یان هاوڕەگەزن و لە چوارچێوەی دامەزراوەیەکی هەرێمیدا بن. هەروەها دەبێ داب چەندپاتکراوە بێت و پێشینەی هەبێ و ماناکەی دەقی گرتبێت. لەڕووی کاتەوە لەوانەیە بە سەدە یان بە چەند ساڵێك بێتەدی، یان لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا کە پەیوەندییەکان زۆر و خێران تۆخمی کات گرنگی کەم بووەتەوەو لەوانەیە بەکاتێکی کەم بێتەدی.

٢. **ڕایەڵی مەعنەوی (الركن المعنوي)**: لێرەدا دەوڵەتان بڕوایان وایە کە ئەو رەوتارەی پێڕەوی لێدەکەن یان جێبەجێی دەکەن، دەقاودەق پەیڕەوی لێکردنی یاسایە. ئەم ڕایەڵی مەعنەوییە لەڕووی کاتەوە لە پێش ڕایەڵی ماددیەوە دێ و بۆ دروستبوونی عورف زۆر گرنگە

١٧٦. د. حسن الجيلي، المصدر السايق، ص٥٥.

١٧٧. د. محمد طلعت الغنيمي، المصدر السابق، ص٣٦٥ وما بعدها، د.محسن افكيرين، المصدر السابق، ص ١٣٨ ومابعدها.

کە لە نەریت (العادە) و موجامەلەی نێودەوڵەتی جیای دەکاتەوە. دەکرێ ڕێسا عورفییەکان لە بواری نێودەوڵەتیدا بەچەند ئامرازێك بسەلمێنین کە مانای بەردەوامی دەوڵەتان بەگوێرەی ڕێسای یاسایی بگەیەنێ، لەوانە ئەو هەڵسوکەوتانەی کە لە دەسەلاتەکانی ناوخۆی دەوڵەت سەرچاوە دەگرن و دابی نێودەوڵەتییان لێ دروست دەبێت، وەکو ئەو نێردراوە دیپلۆماسی و ڕێنماییە فەرمییانەی کە لە دەوڵەتەوە دەردەچن، ئەو ڕێنمایی و فەرمانانەی کە لەکاتی جەنگدا لە دەوڵەتەوە بۆ سەرکردەو لەشکر دەنێردرێن، هەروەها ئەو یاسایانەی کە لە دەسەلاتی یاسادانانی دەوڵەتەوە دەدردەچن، حوکمی دادوەری ناوخۆی تایبەت بەو مەسەلانەی کە پەیوەندیی نێودەوڵەتی دەیانگرێتەوە. هەروەها لە ئاستی دامەزراوە نێودەوڵەتییەکاندا کە بەشداری لە دروستکردنی دابدا دەکەن، دەکرێ نموونە بە بڕیاری دادگا نێودەوڵەتییەکان بهێنرێتەوە بەتایەت ئەوانەی پەیوەندییان بە ڕێساکانی بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی و دانان بە حکوومەت و دەوڵەتان و شیکردنەوەی پەیماننامەو...هتدەوە هەیە، هەروەها پەیماننامە گشتی و تایبەتییە نێودەوڵەتییەکان و ئەو ڕەفتارانەی کە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و....هتد، دەردەچن. داب وەك سەرچاوەیەکی یاسای نێودەوڵەتی لایەنی باشی ئەوەیە کە ڕێساکانی نەرمن و قبوڵی پێشکەوتنی بەردەوام دەکەن کە لەگەڵ پێداویستییەکانی ژیانی یاسایی پراکتیکیدا دەگونجێن، بەلام خەوشەکەی لەوەدایە کە ڕێساکانی سنووریان دیار نییە و جۆرە نادیاری و هێواشییەکیان تێدایە.[١٧٨]

٣. **پرینسیپەکانی یاسای گشتیی:** یاساناسان بۆ دیاریکردنی مانای ڕاستەقینەی پرینسیپە گشتییەکانی یاسا هەوڵێکی زۆریان داوە، بەلام ڕای سەرەکی بۆ دیاریکردنی ئەم مەبەستە ئەوەیە کە پرینسیپە گشتییەکانی یاساو ئەو فەلسەفە گشتییەی کە لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا هەیە، بەیەکەوە گرێ بدات. کەواتە پرینسیپی یاسای گشتیی ئەو ئایدیانەیە کە لە بیری گشتیدا بۆ بوون (وجود) هەیە، یان بۆچوونی گشتیی هەبوونی ژیان، لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا، کە دەبێتە هۆی هەڵێنجانی کۆمەڵێك ڕێسای یاسایی دانراو کە ڕەوتاری کەسەکان لەو کۆمەڵگەیەدا ڕێکدەخەن.[١٧٩] هەربۆیە پرینسیپە گشتییەکانی یاسا، ئەو

---

١٧٨. بۆ زیاتر بڕوانە: د. عبدالحسين القطفي، المصدر السابق، ص١٦٠.

١٧٩. د. سمير عبدالسيد تناغو، النظرية العامة للقانون، منشاة المعارف بالأسكندرية، ١٩٨٦،ص ٢٤٦-٢٤٧.

ڕێسا یاساییانەن کە هەڵگری مانای گشتی و شێوەکی جیهانییان هەیە، کە لە یاساکانی ناوخۆی زۆربەی دەوڵەتانی پێشکەوتوو خودان شارستانی پێشکەوتوودا بوونیان هەیە، هەروەکو لە ماددەی ٣٨ی نیزامی بنەڕەتیی دادگای دادی نێودەوڵەتیدا هاتووە. هەربۆیە دەکرێ ناوەڕۆکی پرینسیپە گشتییەکانی یاسا لە پرینسیپە گشتییەکانی نیزامی یاسایی ناوخۆ، یان لە پرینسیپە گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی وەربگیرێن.[١٨٠] پرینسیپە گشتییەکانی یاسا زۆرو هەمەجۆرن، هەندێکیان نووسراوو هەندێکیان نەنووسراون، هەیانە سیمایەکی سیاسییان هەیە، وەك پرینسیپی سەروەریێتیی گەل، لێکجیاکردنەوەی دەسەلاَتەکان، ڕەوایی ملکەچبوونی دەوڵەت بۆ یاسا، هەشیانە سیمایەکی ئابوورییان هەیە، وەك پرینسیپی پارێزراویی موڵکایەتی تایبەت، یاسا فەرمانە (وەزیفە) کۆمەلاَیەتییەکەی دەپارێزێت، هەیانە سیمای یاسایی وکۆمەلاَیەتییان هەیە، وەك پرینسیپی نابێ کەس پاساو بەنەزانینی یاسا بێنێتەوە، هەیانە سیمای ئاکائاسایان هەیە وەك نابێ یاسا بەخراپی بەکاربێت، هەیانە سیمایەکی شێوە دارشتنیان هەیە، هەیە سیمایەکی هەیە کە پشت بە لۆژیك یان سروشتی شتومەکەکانی یان دادخوازی (العداله) دەبەستێ وەك پرینسیپی کەسێ شتێکی نەبێت ناتوانێ بیدات (فاقد الشي لا يعطيه). ئائاوا پرینسیپە گشتییەکانی یاسا ڕۆڵی گرنگ دەبینن لە ژیانی یاساییدا و[١٨١] پێگەی ڕێسای یاسایی نیشان دەدەن و هاوکاری ڕێکخستنیان دەکات بەگوێرەی بۆچوونی ئاراستەکەری دیاریکراو. جێبەجێکردنی پرینسیپە گشتییەکانی یاسا، وەك سەرچاوەیەکی یاسای نێودەوڵەتی، دەبێ گشتگیربن، واتە دەبێ پرینسیپەکان هاوبەش بن لەنێوان نیزامە جۆربەجۆرەکانی یاساییدا نەك لە دەوڵەتێکدا، مەرج نییە هەموو پرینسیپێکی یاسایی ناوخۆ لە چوارچێوەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا جێبەجێ بێت، بەڵکو دەبێت جیاوازییە هەیکەلییەکەی لەبەرچاوبگیرێت، بۆ نموونە، لە سیستەمی یاسای ناوخۆدا هەموو کەس بۆی هەیە سکالاَ لە دادگا تۆمار بکات بەبێ وەرگرتنی لایەنی دووەمی داوایەکە، بەلاَم لە یاسای نێودەوڵەتیدا دەبێ لایەنەکان ڕازی بن، ئینجا پەنا بۆ دادگای نێودەوڵەتی ببەن، هەروەها وەك سەرچاوەیەك

١٨٠. بۆ زیاتر پێناسە کردنی بڕوانە: د.منذر الشاوي، المدخل لدراسة القانون الوضعي، دار الشؤون الثقافية العامة،ط١،بغداد، ١٩٩٩،ص١٩٦ وما بعدها.

١٨١. بۆ زیاتر بڕوانە: د. عبدالحي الحجازي، المدخل لدراسة العلوم القانونية، الجزء الأول، جامعة الكويت، ١٩٧٢، ص٤٩٣.

له یاسای نێودەوڵەتیدا دوای ڕێسای ڕێککەوتن و عورفی جێبەجێ دەبێت، واتــە هاوکـارە بــۆ ئەوەی ئەو کەموکورییانە پڕ بکاتەوە کە لەوانەیە لە ڕێسای یاسای نێودەوڵەتیدا هــەبێت، کــە لەوانەیە لە مەسەلەیەکدا نە ڕێسای ڕێککەوتن و نــە ڕێســای عورفیمــان هــەبێت لــە یاســای نێودەوڵەتیدا، نموونەی ئەو پرینسیپانە، وەك پرینسیپی خراپ بەکارهێنانی دەسەلاٚت، نیەتپاکی لــە وەفــاداری بــۆ ئیلتیزامــە نێودەوڵەتییــەکان، قەرەبووکردنــەوە بــۆ هــەر پێشــێلکارییەکی نێودەوڵەتی، ....هتد.[182] دەکرێ پرینسیپە گشتییەکانی یاسا لــە بــواری نێودەوڵەتیــدا پــۆلێن بکرێن بــۆ ســێ شــێوە [183]: پرینســیپەکان بــۆ چارەســەر و شــیکردنەوەی جــۆری پەیوەندییــە نێودەوڵەتییەکان وەك پرینسیپی دادپەروەریخوازی و لۆژیك و عەدالەتی سروشتی.

١. ئەو پرینسیپانەی کە لایەنی کەمی دادوەری دەستەبەردەکەن.

٢. پرینسیپە بابەتییەکان کە وەك بەڵگەن لــە یاســاکانی نــاوخۆدا و دەکــرێ لــە بــواری نێودەوڵەتی بەکاربێن.

لەکۆتاییدا پێویستە بگوترێ کە ئەو پرینســیپە گشــتییانەی نەتــەوە شارســتانییەکان دانیان پێداناوە، ئەو پرینسیپە گشتییانە دەگرنەوە کە لە نیزامە یاساییە ســەرەکییەکانی جیهاندا هەن.[184]

## ٢- سەرچاوە نافەرمییەکان

لە نیزامی بنەڕەتیی دادگای دادی نێودەوڵەتیدا هاتووە کە لــە بــاری نــەبوونی سەرچــاوەی سەرەکیدا، ئەوا دادگا دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ حوکمی دادگاکان و ڕێبازی گەورە یاساناســان لــە بواری یاسای گشتیی سەرجەم نەتەوەکان، هەروەها ئەگــەر لایەنــە پێکناکۆکــەکان ڕازیبــوون، دادگا دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ پرینسیپەکانی یەکسانی و ویژدانی.

- **بڕیاری دادگاکان**

بڕیاری دادگا نێودەوڵەتی و نیشــتیمانییەکان بــە سەرچــاوەیەکی بەڵگەهێنانــەوەی یاســای نێودەوڵەتی دادەنرێت، وێڕای ئەوەی کــە بڕیــارو حــوکمی دادگــا نێودەوڵــەتی و ناوخۆییــەکان

١٨٢. د. أحمد أبو الوفا، الوسيط في القانون الدولي العام، ص ص٢٠٦ -٢٠٩.

١٨٣. د. محمد طلعت الغنيمي، المصدر السابق، ص ص٥٠٩- ٥١٠.

١٨٤. د. محمد منصور الصاوي، المصدر السابق، ص٥٠٥.

هۆیەکە بۆ دروستبوونی عورف، ئەوا دادوەر و نەیارەکان (دژەکـان) دەتـوانن بـەو هۆیـەوە بـە ڕێسایەکی یاسایی نێودەوڵەتی بزانن کە لە پەیماننامەو عورفدا نەهاتبێت، یان ڕێساو بنـەمای تریان لێ هەڵێنجن. ئەم بڕیارانە بەشداری لـە دروسـتبوونی یاسـای نەنووسـراودا دەکـەن، تـا ئەودەمەی ئەحکامەکانی یاسای گشتیی نێودەوڵەتی بەتـەواوی دەنووسـرێنەوە، هـەروەها بـۆ شیکردنەوەی ڕێسایەکی یاساییش کەڵکیان لێ وەردەگیرێت.

- **بۆچوونی یاسازانانی نێودەوڵەتی**

ڕۆڵی یاساناسان لە بواری لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو شیکردنەوەی پرینسـیپ و ڕێسـایەکانی یاسای نێودەوڵەتیدا گەورەو بەرچاوە. چـونکە یاساناسـان هاوکـاری سـەلماندن و شـیکردنەوەی ئەحکامەکان و دۆزینەوەی کەموکوڕی و کەلەبەرەکانی ئەو بوارەیان کردووە. لە مێـژووی ئـەم بوارەدا یاسازانی زۆرمان هەن. لەراستیدا یاسای نێودەوڵەتی لەسەر شانی یاساناسان هاتەگۆڕێ و پێشکەوتووە، لەوانە: گرۆسیۆسی هۆڵەندی و بافندرۆفی ئەڵمانی کـە لـە سـەدەی حەڤـدەدا ژیاون، بینکرشۆکی هۆڵەندی و ڤاتیلی سویسری و، لە چـاخی نوێشـدا، تریبـل و شـترۆبی لـە ئەڵمانیا و ئەنزیلۆتی لە ئیتالیا و ئۆپنهایم لە ئینگلتەراو کالفۆ لە ئەرجەنتین.....هتد.

**دەرئەنجام:**

لە کاتێکدا کورتەیەکی پوختی ناساندنی رووکارە سەرەکیەکانی ئەم کتێبـە سـەبارەت بـە یاسای گشتی نێودەوڵەتی دەخەمە روو، جیا لە تەواوی ئەو کتێبانەی لە بەردەستدان پێڕسـتی بۆ کراوە، نەمویست وەك وەرگێڕ مامەڵە لە گەڵ بابەتەکان بکەم، بەڵکو ئەگـەر رەوابێـت وەك دانەر مامەڵەم کردووە، هەربۆیە وێڕای سوپاسمان بۆ هەموو ئەو بەرێزانەی پێداچوونەوەو سەرنج و پێشنیارو تێبینییان پێشکەش کردم، لە هەمان کاتدا بە خۆشحاڵی و پێزانینەوە پێشوازی لە هەر رەخنەو پێشنیازێك دەکەین.

## المصادر والمراجع

١- د. أحمد أبو الوفا، الوسيط في القانون الدولى العام، ص ص٢٧٦ -٢٧٧.

٢- د. ابراهيم احمد خليفة، القانون الدولي الدبلوماسى والقنصلي، دار الجامعة الجديدة، ٢٠٠٧.

٣- د. أبو زيد رضوان، القانون الدولى الجوى وقانون الطيران التجارى، دارالفكر العربي، القاهرة، ص٨.

٤- د. أحمد أبراهيم حسن، مفهوم القانون الطبيعي عند فقهاء الرومان، الدار الجامعة.

٥- د. احمد ابو الوفا، القانون الدولي والعلاقات الدولية، دار النهضة العربية، القاهرة، ٢٠٠٦.

٦- د. احمد ابو الوفا، النظرية العامة للقانون الدولي الأنساني، دار النهضة العربية، ط١، القاهرة، ٢٠٠٦.

٧- د. أحمد أبو الوفا، الوسيط في القانون الدولي العام، دار النهضة العربية، ط٤، ٢٠٠٤.

٨- د. السيد محمد السيد العمران، د. نبيل ابراهيم سعد، محمد يحي مطر، الأصول العامة للقانون، الدار الجامعية، ١٩٩١.

٩- د. السيد مصطفى أحمد أبو الخير، المباديْ العامة في القانون الدولي المعاصر، أيتراك للطباعة والنشر، ط١، ٢٠٠٦.

١٠- د. الشافعى محمد بشير، قانون حقوق الأنسان، منشأة العارف بالأسكندرية، ٢٠٠٤، ط٣.

١١- جواس حسن رسول، طبيعة الأتحاد الأوروبى، رسالة ماجستير، كلية القانون جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٧.

١٢- جيرهارد فان غلان، القانون بين الأمم (١)، دار الآفاق الجديدة، ترجمة عباس العمر.

١٣- جيرهارد فان غلان، القانون بين الأمم (٣)، تعريب ايلي وريل، دار الأفاق الجديدة.

١٤- د. جبار صابر طه، النظرية العامة لحقوق الأنسان، منظمة نشر الثقافة القانونية، ط١، اربيل، ٢٠٠٤

١٥- د. جعفر الفضلي و د. عبد الحسين الفضل، المدخل للعلوم القانونية، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، ط١، ١٩٨٧.

١٦- د. حسان محمد شفيق العانى، نظرية الحريات العامة تحليل ووثائق، جامعة بغداد، ٢٠٠٤.

١٧- د. حسن الجليبي، القانون الدولي العام، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٦٤.

١٨- د. حسين توفيق فيض الله، اتفاقيات ال (WTO/GATT) وعولمة الملكية الفكرية، مطبعة جامعة صلاح الدين/ اربيل ١٩٩٩، ولنفس المؤلف: قانون التجارة الدولية، محاضرات القيت على طلبة الدراسات العليا/ ماجستير، في كلية القانون جامعة صلاح الدين للسنة الدراسية ٢٠٠٤- ٢٠٠٥.

١٩- د. حسين الشيخ محمد طه الباليساني، القضاء الدولي الجنائي، مطبعة الثقافة، اربيل، ٢٠٠٥.

٢٠- د. حميد السعدي، مقدمة في دراسة القانون الدولي الجنائي، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٧١.

٢١- د. رجب عبدالمنعم متولي، الأمم المتحدة بين البقاء والألغاء في ضوء التطورات الراهنة، ٢٠٠٥.

٢٢- د. رشاد السيد، القانون الدولي العام في ثوبه الجديد، ٢٠٠١، عمان- الأردن، ص٢٤.

٢٣- د. سعدى بەرزنجى، تيۆرى گشتى ى ياسا، ١٩٨٩، ل١٦١.

٢٤- د. سليمان بو ذياب، المباديء القانونية، العامة، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشروالتوزيع، بيروت، ط١، ١٩٩٥.

٢٥- د. سمير عبدالسيد تناغو، النظرية العامة للقانون، منشاة المعارف بالأسكندرية، ١٩٨٦.

٢٦- د. سهيل حسين الفتلاوي ود. غالب عواد حوامدة، القانون الدولي العام، الجزء الأول، دار الثقافة للنشر والتوزيع، ط١، ٢٠٠٧.

٢٧- د. سهيل حسين الفتلاوى ود. غالب عواد حوامدة، موسوعة القانون الدولى العام، الجزء الثانى، دارالثقافة للنشر والتوزيع، ط١، ٢٠٠٧.

٢٨- د. سهيل حسين الفتلاوي، التنظيم الدولي، دار الثقافة للنشر والتوزيع، ط١، ٢٠٠٧.

٢٩- د. سهيل حسين الفتلاوى، الدبلوماسية بين النظرية والتطبيق، دار الثقافة عمان، ط ١، ٢٠٠٥.

٣٠- د. ضارى خليل محمود وباسيل يوسف، المحكمة الجنائية الدولية، بيت الحكمة، بغداد، ط ١، ٢٠٠٣.

٣١- د. عبد الباقي البكري وزهير البشير، المدخل لدراسة القانون، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي.

٣٢- د. عبدالحسين القطيفي، القانون الدولي العام (الجزء الأول)، مطبعة العاني، بغداد، ١٩٧٠.

٣٣- د. عبدالحمن رحيم عبدالله، محاضرات في فلسفة القانون، ط١، اربيل، ٢٠٠٠.

٣٤- د. عبدالحي الحجازي، المدخل لدراسة العلوم القانونية، الجزء الأول، جامعة الكويت، ١٩٧٢.

٣٥- د. عبدالكريم علوان خضير، الوسيط فى القانون الدولي العام، الكتاب الثالث، حقوق الانسان، مكتبة الثقافة والنشر والتوزيع، ط١، ١٩٩٧.

٣٦- د. عبدالكريم علوان، الوسيط في القانون الدولي العام، الكتاب الثاني، مكتب دار الثقافة للنشر والتوزيع، ط١، ١٩٩٧.

٣٧- د. عبدالواحد محمد الفار، طبيعة القاعدة الدولية الأقتصادية، في ظل النظام الدولي القائم، دار النهضة العربية، ١٩٨٥.

٣٨- د. على صادق أبو هيف، القانون الدولى العام، ط١١، الأسكندرية، ١٩٧٥ .

٣٩- د. على صادق أبو هيف، دراسة متعمقة فى القانون الدولى العام .

٤٠- د. عمر محمود المخزومي، القانون الدولى الانسانى فى ضوء المحكمة الجنائية الدولية، الثقافة للنشر و لتوزيع، عمان ط، ٢٠٠٨.

٤١- د. عوض احمد الزعيي، المدخل الى علم القانون، دار وائل للنشر، ط١، ٢٠٠١ .

٤٢- د. فخري رشيد المهنا و د. صالح ياسين داود، المنظمات الدولية، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، جامعة الموصل.

٤٣- د. كمال سعدي، حقوق الأنسان في المذاهب الفكرية، مجلة تـترازوو، مجلة اكاديميية، تصدرها نقابة حقوقي كوردستان، العدد ٢٥.

٤٤- د. محسن افكيرين، القانون الدولي العام، دار النهضة العربية، ط١، ٢٠٠٥.

٤٥- د. محمد السعيد الدقاق، حول مبدأ التراث المشترك للأنسانية، المكتنب العربي الحديث، ١٩٨٢.

٤٦- د. محمد المجذوب، الوسيط في القانون الدولي العام، الدار الجامعية للطباعة والنشر، ١٩٩٩.

٤٧- د. محمد حافظ غانم، الأصول الجديدة للقانون الدولي العام، المصدر السابق، ص٥١.

٤٨- د. محمد سامى عبدالحميد و د. محمد سعيد الدقاق، القانون الدولي العام، منشأة المعارف بالأسكندرية، ٢٠٠٤، ص٣٧٦.

٤٩- د. محمد سامي عبدالحميد، اصول القانون الدولي العام، القاعدة الدولية، مؤسسة الشباب الجامعية، ط١، ١٩٧٢.

٥٠- د. محمد سامى عبدالمجيد ود. مصطفى سلامة حسين، القانون الدولى العام، مركز مكتب الثقافية، الدار الجامعية، ١٩٨٨.

٥١- د. محمد سعيد الدقاق، مصادرالقانون الدولي، من كتاب- القانون الدولي العام، د. محمد سامي عبدالمجيد، ود. محمد السعيد الدقاق، أبراهيم أحمد ضيفة، منشأة المعارف بالأسكندرية، ٢٠٠٤.

٥٢- د. محمد شريف أحمد، فكرة القانون الطبيعي عند المسلمين، منشورات وزارة الثقافة والأعلام، ١٩٨٠.

٥٣- د. محمد طلعت الغنيمى، الأحكام العامة في قانون الأمم (قانون السلام)، منشاة المعارف بالأسكندرية.

٥٤- د. محمد منصور الصاوي، أحكام القانون الدولي، دار المطبوعات الجامعة.

٥٥- د. محمد يوسف علوان و د. محمد خليل المرسي، القانون الدولي لحقوق الأنسان، دار الثقافة، ط١، ٢٠٠٥.

٥٦- د. محمود شريف بسيوني، المحكمة الجنائية الدولية، دار الشروق، ط١، ٢٠٠٤.

٥٧- د. منذر الشاوي، المدخل لدراسة القانون الوضعي، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ط١، ١٩٩٨.

٥٨- د. منذر الشاوي، مذاهب القانون، دار الحكمة للطباعة والنشر، بغداد، ط ٣، ١٩٩١.

٥٩- د. مهدي جابر مهدي، السيادة والتدخل الأنساني، منظمة نشر الثقافة القانونية، سلسلة (١٣أ)، ط١، هەولێر، ٢٠٠٤.

٦٠- د.حسن كيرة، المدخل الى القانون، نشاة المعارف بالأسكندرية، ١٩٧٤، ص١٢١.

٦١- د.شيرزاد أحمد النجار، محاضرات (الدستور كقاعدة أساسية للنظام في الدولة) ألقيت على طلبة الدراسات العيا –ماجستر– في كلية القانون، جامعة صلاح الدين (٢٠٠٣-٢٠٠٤).

٦٢- د.عبدالمجيد الحكيم وصاحبيه، الوجيز فى نظرية الألتزام في القانون لمدني العراقي، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، ١٩٨٠.

٦٣- د.عصام العطية، القانون الدولي العام، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، بغداد، ط٦ ، ٢٠٠٦.

٦٤- د.غازى حسن صباريني، الوجيز في مباديء القانون الدولي العام، دار الثقافة للنشر والتوزيع، ط١، ٢٠٠٥.

٦٥- د.منذر الشاوي، المدخل لدراسة القانون الوضعي، دار الشؤون الثقافية العامة،ط١،بغداد، ١٩٩٩.

٦٦- سنگر داود محمد، التنظيم القانوني الدولي لحماية البيئة من التلوث، رسالة ماجستير، مقدمة الى كلية القانون، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٣.

٦٧- شارل روسو، القانون الدولي العام، ترجمة شكر الله خليفة وعبدالمحسن سعد، الأهلية للنشر والتوزيع، بيروت، ١٩٨٢.

٦٨- عبدالفتاح عبدالرزاق محمود، اعلان عن الدولة، اطروحة دكتوراه، مقدمة الى كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٨.

٦٩- عثمان على حسن وەيسى، البعد القانونى لحقوق الأنسان، بحث منشور في مجلة تەرازوو، مجلة قانونية وسياسية أكاديمية فصلية، يصدرها اتحاد حقوقى كوردستان باللغتين الكوردية والعربية، العدد ٢٩ - ٣٠، ٢٠٠٦.

٧٠- عثمان علي حسن، الأرهاب الدولي ومظاهره القانونية والسياسية في ضوء القانون الدولي العام، مطبعة المنارة- هەولێر، ط١،٢٠٠٦.

٧١- عثمان علي حسن، الوضعية القانونية (دراسة تحليلية) بحث منشور بأشراف استاذنا د. شيرزاد أحمد النجار، في مجلة پارێزەر، العدد ٩، اربيل، ٢٠٠٥.

٧٢- هانس كلسن، النظرية المحضة في القانون، ترجمة الدكتور أكرم الوتري، منشورات مركز البحوث القانونية (١١)، بغداد، ١٩٨٦.

٧٣- فالآ فريد ابراهيم، المسؤولية المدنية الدولية عن جريمة الأبادة الجماعية، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠٠٤.

٧٤- فيصل شطناوي، حقوق الأنسان والقانون الدولي الأنساني، دار ومكتبة الحامد للنشر والتوزيع، ط٢، ٢٠٠١.

٧٥- ليون دگی، دروس في القانون العام، ترجمة د.رشدي الخالد، منشورات مركز البحوث القانونية، وزارة العدل، بغداد، ١٩٨١.

٧٦- ڕێککەتننامەی ڤیەننا ساڵی ١٩٦٩.

٧٧- دەقی ڕێکەوتنامەی ژنێڤی ١٩٠٧ و برۆتۆکۆڵی یەکەمی ژنێڤ لە ١٠/حوزەیرانی/١٩٧٧.

٧٨- عوسمان عەلی حەسەن، جیاوازیەکانی نێوان یاسای مرۆڤایەتی نێودەوڵەتی و یاسای نێودەوڵەتی بۆ مافەکانی مرۆڤ، گۆڤاری تەرازوو، گۆڤارێکی ئەکادیمی وەرزییە، بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی، سەندیکای مافناسانی کوردستان، ٢٠٠٨، ژمارە -٣٣- ٣٢.

٧٩- مافەکانی مرۆڤ، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی دیراسات و توێژینەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان، چاپی یەکەم، دیراسەی ژمارە ٢٣، ١٩٩٦، و د. ابراهيم احمد خليفة، الألتزام الدولي باحترام حقوق الأنسان وحرياته الأساسية، دار الجامعة الجديدة، ٢٠٠٧.

## پاشکۆی یەکەم

## بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان

### یەکەم :یاداشتنامەی بەرایی

بەڵننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٢٦/حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٥ لە شاری فرانسیسکۆ لــە کۆتایی کۆنگرەی نەتەوە یەکگرتووەکانی تایبەت بە پەیڕەوی دەستەی نێودەوڵەتی واژۆ کراو لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥کەوتە واری جێبەجێکردنەوەو پــەیڕەوی بنــەڕەتی دادگــای دادی نێودەوڵەتیش بە شێکی تەواوکەری ئەم بەڵێننامەیە.

کۆمەڵەی گشتی نەتــەوە یــەکگرتووەکان لــە ١٧کــانونی یەکــەمی ١٩٦٣ هــەموارەکانی یەکەمی لە سەر ماددەکانی ٢٣و٢٧و٦١ی بەڵێنامەدا ئەنجامداو، لــە ٣١ کــانوونی یەکــەمی ١٩٦٣ خرایــە واری جێبەجێکردنــەوە. هــەروەها لــە ٢٠کــانونی یەکــەمی ١٩٦٥ هــەمواری ماددەی ١٠٩ی کردو لە ١٢ حوزەیرانی ١٩٦٨ جێبەجێبوو.

هەموارکردنی ماددەی ٢٣ بۆ زیادکردنی ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشە لە یازدە ئەندامەوە بۆ پانزە. لە مادەی ٢٧یشدا هاتووە کە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش لــە بابەتــە رێکاریەکان بە هرەزامەندی ٩ ئەندام دەبێت(پێشــتر ٧ بــوو)، لــە هــەموو بابەتــەکانی تــر بــە رەزامەندی ٩ دەنگ دەبێت(پێشتر ٧ بوو) دەبــێ لەناویانــدا دەنگــەکانی پێــنج ئەندامــەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی هەمیشەیی لە گەڵدا بێت.

ماددەی ٦١یش کە لە ٣١ئابی ١٩٦٥دا هاتە واری جێبەجێکردنــەوە، هــەموارکردنی بــۆ زیادکردنی ژمارەی ئەنــدامانی ئەنجوومــەنی ئــابووری و کۆمەڵایــەتی لــە ١٨ ئەندامــەوە بــۆ ٢٧ئەندام. هەمواری دووەمی هەمان ماددە، لە ٢٤ایلولی ١٩٧٣جێبەجێبوو، تایبەت بوو بــە زیادکردنی ئەندامانی ئەنجوومەن لە ٢٧ەوە بۆ ٥٤ئەندام.

هەمواركردنی ماددەی ۱۰۹ی سەبارەت بە بڕگەی یەکەمی هەمان مادده كه ڕێگه دەدات کۆنگرەیەکی گشتی ئەندامانی نەتــەوە یــەکگرتووەکان ببەســترێت بــۆ چاوپێداخشــاندنەوە بــە بەڵێننامە لەو کات و شوێنەی که کۆمەڵەی گشتی به زۆرینەی دوو لەسەر سێ ۲/۳ی ئەندامان و به ڕەزامەندی نۆ لە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش (پێشتر حەوت بوو) دیــاری دەکرێــت و. بڕگەی سێ لە ماددەی ۱۰۹ کە مەسەلەی چــاوگێڕانە بــە توانــای بانگهێشــتکردنی بەســتنی ئەمکۆنگرەیە لە خولی یازدەیەمی کۆمەڵەی گشتی، لە سەر شێوەی بنــەڕەتی خــۆی مایــەوە بەتایبەت ئاماژەکردنی بۆ (ڕەزامەندی حەوت لە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش) کــە پێشــتر کۆمەڵەی گشتی و ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیاری لــەم چەشــنەیان بــۆ ئــەم بڕگەیــە لــە دەورەی یازدەیەم لە ساڵی ۱۹۵۵وەرگرتبوو.

## دیباجه

ئێمە گەلانی نەتەوە یەکگرتووەکان

گرتوومانەتە ئەستۆی خۆمان

نەوەکانی ئایینده لە نەهامەتی جەنگ ئازاد بکەین کە لە میانەی یــەك نــەوەدا دوو جــار دڵگرانی کە ئەستەمە وەسف بکرێت بەسەر مرۆڤایەتی داهات،

هەروەها سەرلەنوێ باوەڕیمــان بــە مافــە بنەڕەتیــەکانی مــرۆڤ و بــە شــکۆمەندی تــاك و چارەنووسی دووپات دەکەینەوە لە گەڵ ئــەوەش کــە پیــاوان و ئافرەتــان و نەتــەوەکان گــەورەو بچووکیان مافی یەکسانیان هەیە،

هەروەها ئەو بارودۆخە روون بکەینەوە کە دەکرێ لە سایەیدا دادوەری بەرجەستە بکــەین و ڕێز بگرین لەو پابەندیانەی کە لە پەیماننامەکان و سەرچاوەکانی تری یاســای نێودەوڵــەتی پەیدا دەبێ .

هەروەها خۆشنوودی کۆمەڵایەتی بەرەوپێش ببەین، ئاســتی ژیــان لــە کــەش و هەوایــەکی ئازادی لەباردا بەرزبکەینەوە.

لە پێناو ئەم ئامانجانەشدا وە خۆمان گرتووە کە:

بە گیان لێبووردەبین و، لە ئاشتی و دراوسێ باشیدا بەیەکەوە بژین،

بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی هێزەکانمان یەکبخەین،

دەستەبەری ڕەزامەندیمان بۆ پرینسیپی دیاریکراوو پلانی پێویستی بــۆ بکــەین کــە هێــزی سەربازی تەنها دەبێ بۆ بەرژەوەندی هاوبەش بەکاربهێنین،

ئامرازە نێودەوڵەتیەکان بۆ خۆشنوودی کاروباری ئابووری و کۆمەڵایەتی هەموو گەلان بە کاربهێنین،

بڕیارماندا کۆششەکانمان یەکبخەین بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە،

هەر بۆیە حوکومەتە جیاجیاکانمان لە سەر دەستی نوێنەرەکانیان کە لە شاری فرانسیسکۆ بەڵگەی ڕێگەپێدراوی مەرج ڕێکییان پێشکەشکردووە کۆبوونەوەو، بۆ ئەم بەڵێننامەیەی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕەزامەندییان نواند و، بە هۆیەوە دامەزراوەیەکی نێودەوڵەتییان بە ناوی نەتەوە یەکگرتوەکان دامەزراند.

## بەشی یەکەم: مەبەست و پرینسیپەکانی

### م١

مەبەستەکانی(ئامانجەکانی) نەتەوە یەکگرتووەکان بریتین لە:

١- پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی، بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستەش دەستەی ڕێوشوێنی هاوبەشی کارا دەگرێتە بەر بۆ گەگرتن لەو هۆکارانەی مەترسین بۆ سەر ئاشتی، هەروەها سەرکووتکردنی کارە دوژمنکاریەکان و هەر شێوەیەکی تری تێکدانی ئاشتی، پەنادەباتە بەر ئامرازی ئاشتیانە، بەگوێرەی پرینسیپەکانی داد و یاسای نێودەوڵەتی، بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیە نێودەوڵەتیەکان کە دەبێتە هۆی تێکدانی ئاشتی یان یەکلاکردنەوەی ناکۆکیەکان.

٢- گەشەپێدانی پەیوەندی دۆستانە لە نێوان نەتەوەکان لە سەر بنەمای ڕێزگرتن لەو پرینسیپەی کە دەیەوێ بە یەکلاکردنەوەی مافەکانی نێوان گەلان بەوەبێ کە هەموان مافی چارەنووسی خۆیان هەیە، هەروەها گرتنە بەری ئەو ڕێوشوێنانەی کە بۆ تۆکمەکردنی ئاشتی گشتی گونجاون.

٣- بەدیهێنانی هاریکاری نێودەوڵەتی بۆ چارەسەری ئەو مەسەلە نێودەوڵەتیانەی کە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و مرۆڤایەتییان هەیە، هەروەها بۆ بەهێزکردنی ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتیەکانی خەڵك بە گشتی و هاندان لە سەر ئەمە بە ڕەهایی بە بێ جیاوازی ڕەگەز یا زمان یا ئایین و بێ جیاوازی نێوان پیاوان و ئافرەتان.

٤- بەکالاهێنانی ئەم دەستەیە وەك سەرداچاوە بۆ هەماهەنگی و ئاراستەکردنی کاروباری نەتەوەکان بۆ بەرەو دەرککردن بە ئامانجە هاوبەشەکان.

## م٢

دەستەو ئەندامانی کاردەکەن بۆ بە دیهێنانی ئەم ئامانجانەی لە ماددەی یەکداباسکران بە گوێرەی ئەم پرینسیپانەی خوارەوە:

١- ئەم دامەزراوەیە لە سەر پرینسیپی یەکسانی سەروەرێتی هەموو ئەندامانی بنیات نراوە.

٢- بۆ ئەوەی هەموو ئەندامان دەستەبەری ماف و باشیەکانی ئەندامێتی بکەن بە نیەت پاکییەوە پابەندبوونەکانی سەر شانیان بە پێی ئەم بە لێننامەیە جێبەجێدەکەن.

٣- هەمووئەندامان بە ئامرازی ئاشتییانە کێشەکانیان یەکلادەکەنەوە بە شێوەیەك کە ئاشتی و تەنایی و دادی نێودەوڵەتی رووبەڕووی مەترسی نەبێتەوە.

٤- نابێ هیچ ئەندامێك لە پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکانیان هەڕەشە بە بەکارهێنانی هێز بکەن یان دژ بە ساغڵەمی خاك و سەربەخۆیی سیاسی هەر دەوڵەتێك یان پەنا بۆ هەر شێوەیەك ببەن  کە لە گەڵ ئامانجەکانی (نەتەوە یەکگرتووەکان) نەگونجێن.

٥- هەموو ئەندامان چی لە توانایاندا بێت هاریکاری پێشکەشی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن لە هەر کارێك کە بە گوێرەی ئەم بە لێننامەیە ئەنجامی بدات، هەروەها نابێ یارمەتی هیچ دەوڵەتێك بدەن کە نەتەوە یەکگرتووەکان رێوشوێنی رێگرتن و سەکوتکردنی بەرامبەر وەردەگرێت.

٦- دەستەکار دەکات بۆ ئەوەی دەوڵەتانی نائەندام بە ئەندازەی ئەوەی کە پێویستی پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتییە بەم پرینسیپانە پابەند بن.

٧- لەم بەلێننامەیەدا شتێك نییە کە رێگە بداتە (نەتەوە یەکگرتووەکان) کە دەست بخاتە ئەوکاروبارانەی کە تایبەتی دەسەلاتی ناوخۆیی دەوڵەتانن، هەروەها شتێك نییە کە ببێتە ئەوەی ئەندامان ئەم مەسەلانە بخەنە روو بۆ ئەوەی بە حوکمی ئەم یاسایە چارەسەر ببێت، ناشبێت ئەم پرنسیپە رێگە بگرێت لە جێبەجێکردنی ئەو رێوشوێنە سەرکوتکاریانەی کە لە بەشی  حەوتەمدا هاتووە.

## بەشی دووەم: ئەندامێتی

**م٣**

ئەندامانی بنەڕەتی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەو دوڵەتانەن کە بەشداری کۆنگرەی نەتەوە یەکگرتووەکانیان کرد بۆ دانانی پەیڕەوی دەستەی نێودەوڵەتی لە سان فرانسیسکۆ، کە واژوو راستانی ئەم بەڵگەنامەیان کردووە بە گوێرەی ماددەی ١١٠، هەروەها ئەو دەوڵەتانەی کە لە پێش لێدوانی نەتەوە یەکگرتووەکانیان لە ١ی کانونی دووەمی ١٩٤٢ئیمزا کرد، کە ئەم بەڵێننامەیەیان ئیمزاو راستان کردووە.

**م٤**

١- ئەندامێتی لە نەتەوە یەکگرتووەکان یۆ هەموو ئەو دەوڵەتانەیە کە ئارەزووی ئاشتییان هەیەو، بەم بەڵێننامەیەش پابەند دەبن، کە دەستە وای دەبینێت توانـاو ئارەزوویان هەیە ئەم پابەندبوونانە جێبەجێبکات.

٢- رەزامەندی لە سەر هەر دەوڵەتێك بۆ ئەندامێتی لە نەتەوە یەکگرتووەکان بە بڕیاری کۆمەڵەی گشتی لە سەر راسپاردەی ئەنجوومەنی ئاسایش دەبێت.

**م٥**

بۆ کۆمەڵەی گشتی هەیە کە ئەندامێتی هەر دەوڵەتێ بوەستێنێ کە ئەنجوومەنی ئاسایش کارێکی نەهێشتن و سەرکوتکردنی لە بەمبەر وەرگرتووە، لە پیادەکردنە مافەکانی ئەندامێتی و باشیەکانی، ئەمەش لەسەر راسپاردەی ئەنجوومەنی ئاساییش، هەروەها ئەنجوومەنی ئاسایش دەتوانێپیادەکردنی ئەو ماف و باشیانە بۆ ئەو ئەندامە بگەڕێنێتەوە.

**م٦**

ئەگەر ئەندامێکلە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان پرینسیپێکی لە بەڵێننامە پێشێلکرد ئەنجوومەنی گشتی لە سەر راسپاردەی ئەنجوومەنی ئاسایش دەتوانێ دەری بکات.

## بەشی سێیەم: لقەکانی دەستە

**م٧**

١- ئەم دەستانەی خوارەوە لقە سەرەکیەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان پێك دێنن:
کۆمەڵەی گشتی،
ئەنجوومەنی ئاسایش،
ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی،
ئەنجوومەنی راسپاردن،
دادگای دادی نێودەوڵەتی،
سکرتاریەت.

٢- بە گوێرەی حوکمەکانی ئەم بەڵێننامەیە دەکرێت هەر لقێکی تری ناسەرەکی دابمەزرێنرێت.

**م٨**

نەتەوە یەکگرتووەکان هیچ کۆتێك دانانێت بۆ سنوور داركردن دەستنیشانکردنی پیاو و ئافرەت بۆ بەشداریبوون بە هەر خاسیەتێك بێت بە شێوەیەکی یەکسان لە لقە سەرەکی و ناسەرەکیەکانی.

## بەشی چوارەم: کۆمەڵەی گشتی

## پێکهێنانی

**م٩**

١- کۆمەڵەی گشتی لە هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان پێك دێت.
٢- نابێت هیچ ئەندامێك لە کۆمەڵەی گشتی لە پێنج نوێنەری زیاتر هەبێت.

وەزیفەکانی کۆمەڵەو دەسەڵاتەکانی

**م١٠**

بۆ کۆمەڵەی گشتی هەیە گفتوگۆ لە سەر هەر مەسەلەیەك یان بارێك لە چوارچێوەی بەڵێننامەدا یان تایبەت بە دەسەڵاتەکانی لقێك لە لقەکان یان وەزیفەکانی کە تیایدا هاتووە بکات. هەروەها بۆی هەیە کە جگە لەوەی لە ماددەی ١٢دا هاتووە ئەندامانی دەستە یان ئەنجوومەنی ئاسایش یان هەردوووکیان راسپێرن کە لەم بابەت و مەسەلانەدا دەیبینن.

**م١١**

١- بۆ کۆمەڵەی گشتی هەیە کە بنۆڕێتە پرینسیپەکانی گشتی هاریکاری لە پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی لەمیانەیاندا ئەو پرینسیپانەی کە پەیوەستن بە چەك داماڵین و رێکخستنی پڕچەکی، هەروەها بۆی هەیە رسپاردەکانی سەبارەت بەم پرینسیپانە بۆ ئەندامان و یان ئەنجومەنی ئاسایش یان هەردووکیان پێشکەش بکات.

٢- بۆ کۆمەڵەی گشتی هەیە گفتووگۆی هەرمەسەلەیەك بکات کە پەیوەندییەکی لە گەڵ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی هەیە کە لە لایەن هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە یان ئەنجوومەنی ئاسایش یان دەوڵەتێك کە ئەندام نییە بە گوێرەی بڕگەی دوو لە ماددەی ٣٥ بۆی هاتبێت، هەروەها — بۆی هەیە جگە لەوەی لە ماددەی دوازدەدا هاتووە — راسپاردەکانی تایبەت بەو مەسەلانەی کە پەیوەستە بە دەوڵەتەکە یان دەوڵەتی خاوەن مەبەست یان بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش یان بۆ هەردووکیان پێشکەش بکات. هەموو ئەو مەسەلانەی کە پێشتر باسکران کە پێویستە بۆیان کارێك ئەنجام بدرێت، دەبێت کۆمەڵەی گشتی پێش یان دوای باسکردنی رەوانەی ئەنجومەنی ئاسایشی بکات.

٣- بۆکۆمەڵەی گشتی هەیە کە ئاوڕی ئەنجوومەنی ئاسایش لەو بارانەی کە ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی دەخەنە مەوترسیەوە لە ئاڕاستە بکات .

٤- دەسەڵاتەكانی كۆمەڵەی گشتی كە لەم ماددەدا هاتوون لە سەراپای ماددەی دە سنووردار ناكات.

**م١٢**

١- كاتێك ئەنجوومەنی ئاسایش، هەڵدەستێت بەو ئەركانەی تایبەتە بە كێشەیەك یان هەڵوێستێككە لەم بەڵێننامەیەدا هاتووە، ئەوا بۆ كۆمەڵەی گشتی نییە هیچ راسپاردەیەكی تیبەت بەم كێشەیە پێشكەش بكات تەنها ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایش داوای لێبكات.

٢- سكرتێری گشتی — بە رەزامەندی ئەنجوومەنی ئاسایش — كۆمەڵەی گشتی لە هەموو خولێك لە خوولەكانی بەستنی ئاگاداردەكاتەوە بە هەموو ئەو مەسەلانەی كە پەیوەستە بە پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی كە جێی بایەخی ئەنجوومەنی ئاسایشە، هەروەها ئاگاداری دەكاتەوە یان ئاگاداری ئەندامانی(نەتەوە یەكگرتووەكان) دەكاتەوە كاتێ كۆمەڵەی گشتی لە خوولی بەستنیدا نەبێت، بە هۆی ئەنجوومەنی ئاسایش بە بۆچوونی ئەو مەسەلانە هەر لە گەڵ بە كۆتاییپێهێنانی.

**م ١٣**

١- كۆمەڵەی گشتی توێژینەوە ئامادە دەكات و بە راسپاردە دەردەچێت بە مەبەستی:

أ- گەشەپێدانی هاریكاری نێودەوڵەتی لە گۆڕەپانی سیاسی و هاندانی پێشكەوتنی راستەوخۆی یاسای نێودەوڵەتی وتۆماركردنی،

ب- گەشەپێدانی هاریكاری نێودەوڵەتی لە بوارەكانی ئابووری و كۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و زانستی و تەندروستی، هەروەها یارمەتی دان بۆ بەدیهێنانی مافەكانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتیەكانی بۆ هەموو خەڵك بە بێ جیاوازی لە نێوانیاندا بە هۆی رەگەز و زمان و ئایین و بێ جیاوازی لە نێوان پیاوان و ئافرەتان.

٢- كارەكانی تری كۆمەڵەی گشتی و وەزیفەكانی و دەسەڵاتەكانی تری تایبەت بەو مەسەلانەی لە برگەی پێشوو(ب)دا هاتوون لە بەشەكانی نۆو دەی ئەم بەڵێننامەیەدا هاتوون.

**م١٤**

٣- لە گەڵ وە بەرچاوگرتنی حوكمەكانی ماددەی دوازدەدا، بۆ كۆمەڵەی گشتی هەیە كە هەر رێوشوێنێك بۆ یەكلاكردنەوەی هەر هەڵوێستێك بگرێتە بەر، هاتنە ئارای هەر چۆنێك بێت، یەكلاكردنەوەیەكی دروست هەر كاتێ بینی كە ئەم هەڵوێستە زیان بە خۆشگوزەرانی گشتی دەگەیێنێت یان ریزی پەیوەندی دۆستانەی نێوان نەتەوەكان تێك دەدات، لە ناو

ئەمانەدا ئەو هەڵوێستانە دەگرێتەوە کە پەیدابوون لە میانەی پێشێلکردنی حوکمەکانی ئەم بەڵێننامەیە کە روونکەرەوەی ئامانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و پرینسیپەکانیەتی.

**م١٥**

١- کۆمەڵەی گشتی راپۆرتی ساڵانە و هی تری تایبەت لە ئەنجومەنی ئاسایش وەردەگرێت و لێیان دەڕوانێ ، ئەم راپۆرتە بەیانێك لە سەر ئەو رێوشوێنانەی کە ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی بڕیاری لێداون یان گرتوونیە بەر دەگرێتە خۆی.

٢- کۆمەڵەی گشتی راپۆرت لە لقەکانی تری نەتەوە یەکگرتووەکان وەردەگرێت و لێیان دەڕوانێ.

**م١٦**

کۆمەڵەی گشتی ئەو ئەرکانە دەست بەکاردەبێ کە بە گوێرەی بەشەکانی دوازدەو سێزدەی تایبەت بە سیستەمی راسپاردەی نێودەوڵەتی بۆی دانراوە، لە ناو ئەمانەش راستاندن لە سەر رێککەوتننامەکانی راسپاردن بۆ ئەو شوێنانەی کە بە پێگەی ستراتیژی دادەنرێن.

**م١٧**

١- کۆمەڵەی گشتی لە میزانیەی دەستە دەڕوانێ و راستاندنی لە سەر دەکات.

٢- ئەندامان تێچوونی دەستەکە وەخۆ دەگرن بە گوێرەی ئەو رێژەیەی کە کۆمەڵەی گشتی بڕیاری لێدەدات.

٣- کۆمەڵەی گشتی لە هەر بارێکی دارایی یان پەیوەست بە بودجە لە گەڵ ئاژانسەکانی تایبەتمەند کە لە ماددەی ٥٧ ئاماژەیان پێکراوە دەڕوانێ. راستاندنی لە سەر دەکات و بودجەی بەڕێوەبردنە ئەو ئاژانسانە دیراسە دەکات بۆ ئەوەی راسپاردەکانی پێشکەش بکات.

## دەنگدان

**م١٨**

١- هەموو ئەندامێك لە (نەتەوە یەکگرتووەکان) یەك دەنگی لە کۆمەڵەی گشتی دەبێت.

٢- کۆمەڵەی گشتی لە بابەتە گشتییەکاندا بڕیارەکانی بە زۆرینەی ٣/٢ی ئەندامانی ئامادەبووی کە لە دەنگدان بەشدارن دەردەکات. ئەم بابەتانە دەگرێتە خۆ: راسپاردەکانی تایبەت بە پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی، هەڵبژاردنی ئەندامە ناهەمیشەییەکانی

ئەنجوومەنی ئاسایش ، هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی، هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی راسپاردن بە گوێرەی بڕگەی یەکەم(ج) لە ماددەی ٨٦ و، رەزامەندی لە سەر ئەندامانی نوێ لە (نەتەوە یەکگرتووەکان) وەستانی ئاندامێك لە پیادەکردنی مافەکانی ئەندامێتی و سوود وەرگرتن لە باشیەکانی، دەرکردنی ئەندامان، ئەو بابەتانەی تایبەتە بە رێ رۆیشتنی سیستەمی راسپاردن و، بابەتەکانی تایبەت بە بودجە.

٣- بڕیارەکان لە بابەتەکانی تر — لە ناو ئەمەش دیاریکردنی ئەو بابەتە زیادانەی تر کە بۆ بڕیار لەسەردانی پێویستی بە زۆرینەی ٣/٢ هەیە — بە زۆرینەی ئەندامانی ئامادەبوو بەشدار لە دەنگدان دەردەچێت.

**م ١٩**

ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە دانی پشکی هاوبەشی دارایی لە دەستە دواکەوێت مافی دەنگدانی لە کۆمەڵەی گشتی نامێنێت ئەگەر بڕە دواکەوتنەکە یەکسان بێت بە بەهای ئەو بەشداریەی کە لە دووساڵی پێشوو یان زیاتر لە سەریەتی، لە گەڵ ئەوەشدا کۆمەڵەی گشتی بۆی هەیە رێگە بەو ئەندامە بدات بۆ دەنگدان ئەگەر قەناعەتی بەوە هێنا کە نەدانی ئەو پارەیە هۆکارێکە کە لای ئەندامەکە ش قبوڵ نییە.

## رێکارەکان

**م٢٠**

کۆمەڵەی گشتی لە خولی ئاسایی و ساڵانەی تایبەتدا بە گوێرەی پێویستی کۆدەبێتەوە. سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکانیش لە سەر داوای ئەنجوومەنی ئاسایش یان زۆرینەی ئەندامانی (نەتەوە یەکگرتووەکان) بانگهێشتی کۆبوونەوەی تایبەت دەکرێت.

**م٢١**

کۆمەڵەی گشتی گەلاڵە نامەی رێکاری خۆی دادەنێ و، بۆ هەر دەورەیەکی بەستن سەرۆکێك هەڵدەبژێرێت.

**م٢٢**

بۆکۆمەڵەی گشتی هەیە لەو لقە ناسەرەکیانە دابمەزرێنێت کە بە پێویستی دەزانێ بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانی.

# بەشی پێنجەم: ئەنجوومەنی ئاسایش

## پێکهێنانی

### م٢٣

١- ئەنجوومەنی ئاسایش لە پانزە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان پێك دێت، کۆماری چین و، فەرەنساو، یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستەکانی سۆڤیەت(روسیا) و، شانشینی یەکگرتووی بەریتانیای گەورەو ئێرلەندای سەروو، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەندانی هەمیشەیین تێیدا. کۆمەڵەی گشتی دە ئەندامی تر لە نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵدەبژێرێت کە ئەندامی ناهەمیشەیی دەبن لە ئەنجوومەندا. لە مەشدا بە شێوەیەکی تایبەت و لە پێش هەموو شتێکدا رەچاوی بەشداری ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی و ئامانجەکانی تری دەستەدا دەکرێت، هەروەها رەچاوی دابەشبوونی جوگرافی یەکسان دەمرێت.

٢- ئەندامانی ناهەمیشەیی بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵدەبژێررێن، بەلاّم لە یەکەم هەڵبژاردنی ئەندامانی ناهەمیشەیی دوای زیادکردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش لە یازدە ئەندامەوە بۆ پازدە، دوو لە چوار زیادکراوەکە بۆ ماوەی یەك ساڵ هەڵدەبژێردرێن و، ئەو ئەندامەی کە ماوەی تەواو دەبێت ناکرێ یەکسەر دووبارە هەڵبژێررێتەوە.

٣- هەموو ئەندامێك لە ئەنجوومەنی ئاسایش یەك نوێنەری دەبێت.

## وەزیفە و دەسەلاّتەکانی

### م٢٤

١- بۆ ئەوەی کارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان خێراو کارابێت، ئەندامانی ئەم دەستەیە کاری سەرەکی پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی دەخەنە پاڵ ئەنجوومەنی ئاسایش و رەزامەندن بە وەی کە ئەم ئەنجوومەنە بە نوێنەرایەتی ئەوان بە ئەرکەکانی هەڵدەستێت کە ئەم پێدانە لە سەری دەچەسپێنێت.

٢- ئەنجوومەنی ئاسایش، بۆ هێنانە دی ئەم ئەرکە بە گوێرەی ئامانجەکان و پرینسیپەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و دەسەلاّتە پێدراوەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش کاردەکات بۆ ئەوەی بتوانێ بەو ئەرکانە هەستێت کە لە بەشەکانی شەش و حەوت و هەشت و دوازدەدا هەیە.

٣- ئەنجوومەنی ئاسایش راپۆرتی سالاّنە بەرزدەکاتەوە، هی تایبەتیش، ئەگەر بارەکە پێویستی کرد بۆ کۆمەڵەی گشتی بۆ ئەوەی لێی بڕوانێت.

**م٢٥**

ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان پەیمان دەدەن بە وەرگرتنی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش و بە گوێرەی ئەم بەڵێننامەیە جێبەجێی دەکەن.

**م٢٦**

بۆ ئەوەی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی بێتەدی و پتەو بن، بە کەمترین تێچوونی سامانی مرۆڤایەتی و ئابووری بۆ خۆپڕچەککردن پتەو بن، ئەنجوومەنی ئاسایش بە هاوکاریکردنی لیژنەی ئەرکانی جەنگی کە لە ماددەی ٤٧دا ئاماژەی بۆ کراوە بەرپرسە لە دانانی پلانەکان بۆ ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەخرێتە روو بۆ ئەوەی پەیڕەوێك بۆ رێکخستنی پڕ چەککردن دابنێت.

## دەنگدان

**م٢٧**

١- هەموو ئەندامێکی ئەنجوومەنی ئاسایش یەك دەنگی دەبێت.

٢- بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش لە مەسەلە رێکاریەکان بە رەزامەندی نۆ لە ئەندامەکانی دەرئەچن.

٣- بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش لە مەسەلەکانی تر بە گشتی بە رەزامەندی نۆ دەنگ لە ئەندامەکانی دەردەچێت کە دەبێ ئەندامە هەمیشەییەکانی بە یەکگرتوویی لە گەڵدابێت، بەو مەرجەی کە لە وەرگرتنی بڕیار بە گوێرەی حوکمەکانی بەشی شەشەم و بڕگەی ٣ لە ماددەی ٥٢ ئەو ئەندامەی کە لایەنێکە لە کێشەکە نابێ دەنگ بدات.

## رێکارەکان

**م٢٨**

١- ئەنجوومەنی ئاسایش بە شێوەیەك رێك دەخرێت بتوانرێت بە بەردەوامی کاری لە گەڵدا بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی نوێنەری هەمیشەیی لە بارەگای دەستەدا.

٢- ئەنجوومەنی ئاسایش کۆبوونەوەی دەوری سازدەکات کە هەرئەندامێك لە ئەندامەکانی — ئەگەر ویستی — بە یەکێك لە پیاوانی حکومەت یان بە نوێنەرێکی تر کە تایبەتە بۆ ئەم مەبەستە نوێنەرایەتی دەکات.

٣- ئەنجوومەنی ئاسایش دەتوانێ کۆبوونەوەکانی لە دەرەوەی بارەگای دەستە ببەستێت ئەگەر پێی وابوو ئەمە کارەکانی ئاسان دەکات.

**م ٢٩**

ئەنجوومەنی ئاسایش دەتوانێ بە گوێرەی پێویستی ئەرك و وەزیفەکانی لقی ناسەرەکی بۆ خۆی دابنێ.

**م٣٠**

ئەنجوومەنی ئاسایش گەلاَلەنامەی رێکاریەکانی خۆی دادەنێ و رێگای هەلَبژاردنی سەرۆکی دیاری دەکات.

**م٣١**

هەموو ئەندامێکی نەتەوە یەکگرتووەکان کە ئەندام نین لە ئەنجوومەنی ئاسایشدا دەتوانێ بە بێ دەنگ دان بەشداری بکات لە گفتوگۆ لە هەر مەسەلەیەك ئەگەر ئەنجوومەن وای بینی کە بەرژەوەندی ئەو ئەندامە بە شێوەیەکی تاتیبەتی پێی کاریگەر دەبێت.

**م٣٢**

هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە ئەنجوومەنی ئاسایشدا ئەندام نییە، هەر دەولَەتێکیش کە لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا ئەندام نییە هەر یەکێکیان کە لایەن بوون لە کێشەیەك بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش بۆباسکردن خراوەتە روو داوا دەکات کە بۆ بەشداری لە گفتوگۆکانی تایبەت بەم کێشەیە بە بێ ئەوەی مافی دەنگدانی هەبێت، ئەنجوومەنی ئاسایش ئەو مەرجانە دادونێت کە پێی وایە رەوایە بۆ بەشدارییپێکردنی هەر دەولَەتێك کە ئەندام نییە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

## بەشی شەشەم: چارەسەری کێشەکان بە ئاشتیانە

### م٣٣

١- لە سەر لایەنەکانی هەر کێشەیەك کە رەنگە بەردەوامبوونی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی بخاتە مەترسیەوە پێویستە هەرچی زووتر داوای چارەسەری بە رێگەی دانوستان و لێکۆڵینەوەو ناوبژیوانی و لێك نزیککردن و دادوەریکردن و یەکلاکردنەوەی دادگایی بکەن، یان پەنا ببەنە بەر ئاژانس و ریکخستنی هەرێمی یان هەر ئامرازێکی دروستی تر کە هەڵی دەبژێرن.

٢- ئەنجوومەنی ئاسایش داوا لە لایەنەکانی کیشەکە دەکات کە ئەگەر پێویستی کرد بەو رێگایانە کێشەکانیان یەکلابکەنەوە.

### م٣٤

ئەنجوومەنی ئاسایش بۆی هەیە هەر کێشەو هەڵوێستێك بپشکنن کە دەبێتە هۆی لێك خشاندنی نێودەوڵەتی یان وروژاندنی کێشەیەك بۆ ئەوەی بڕیار بدرێت کە ئایا بەردەوامی ئەم کێشەیە یان هەڵوێستە کە لەوانەیە ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی بخاتە مەترسیەوە.

### م٣٥

١- هەموو ئەندامێکی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆی هەیە ئاگاداری ئەنجوومەنی ئاسایش یان کۆمەڵەی گشتی بکاتەوە بە هەر کێشە یان هەڵوێستێك لەو جۆرەی کە لە ماددەی ٣٤دا ئاماژەی پێدراوە.

٢-بۆ هەموو دەوڵەتێکی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان هەیە ئەنجوومەنی ئاسایش یان کۆمەڵەی گشتی بە هەر کێشەیەك ئاگادار بکاتەوە کە خۆی تێدا لایەنە بە مەرجێك لە سەرەتاوە تایبەت بەو کێشەیە پابەندیەکانی چارەسەری ئاشتیانە کەلەم بەڵێننامە یەدا هاتووە قبوڵ بکات .

٣- حوکمی ماددەکانی١١و١٢ رێکار دەبێت بە سەر ئەو رێگەیەی کە کۆمەڵەی گشتی چارەسەری ئەو مەسەلانەی پێ دەکات کە بە گوێرەی ئەو ماددەیە لێیەوە ئاگادار کراوەتەوە.

## م ٣٦

١-لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی کێشە بەو جۆرەی کە لە ماددەی ٣٣ ئاماژەی بۆ کراوە یان لە هەڵوێستێکی لەو شێوەیەدا بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش هەیە کە بەو شێوەیەی بە گونجاوی دەزانێت لە رێکاری و رێبازی یەکلاکردنەوە راسپاردە بکات.

٢-لە سەر ئەنجوومەنی ئاسایشە ئەو پێشینە رێکاریە پێش وەختانە رەچاو بکات کە پێك ناکۆکەکان بۆ چارەسەری ناکۆکی نێوانیان وەریان گرتووە.

٣- لە سەر ئەنجوومەنی ئاسایشە کە بە گوێرەی ئەم ماددەیە راسپاردەکانی پێشکەش دەکات دەبێت رەچاوی ئەوە بکات کە لایەنە پێك ناکۆکەکان دەبێ کێشە یاساییەکان — بە شێوەیەکی گشتی — بخەنە بەردەم دادگای دادی نێودەوڵەتی بە گوێرەی رێساکانی پەیرەوی بنەڕەتی ئەم دادگایە.

## م ٣٧

١-ئەگەر ئەو دەوڵەتانەی کە کێشەیان لە نێواندا هەیە لەو شێوەیەی کە لە ماددەی ٣٣ ئاماژەی بۆ کراوە نەیانتوانی چارەسەری بکەن بەو ئامرازانەی کە لەو ماددەیەدا هاتووە پێویستە لە سەری بیخاتە بەردەم ئەنجوومەنی ئاسایش.

٢-ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایش وای مەزەندە کرد کە بەردەوامبوونی ئەم کێشەیە لەوانەیە لە سەر ئەرزی واقیع، ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی بخاتە مەترسیەوە بڕیار دەدات بە وەی کە بە گویرەی ماددەی ٣٦ کار بکات یان ئەو مەرجانەی بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە بە پەسندی دەزانێت رادەسپێرێت.

## م ٣٨

بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش هەیە — ئەگەر لایەنەپێك ناکۆکەکان داوایان کرد — راسپاردەیان بە مەبەستی چارەسەری ئاشتیانەی ئەو کێشانە پێشکەش بکات ، ئەمەش بە بێ پشێلکاری لە حوکمی ماددەکانی ٣٣تا ٣٧.

## بەشی حەوتەم: وەرگرتنی کاروبار لە حاڵەتەکاندا

هەڕەشەکردن لە ئاشتی و پێشێلکردنی و کاری دوژمنکارانە

**م٣٩**

ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیار دەدات لە وەی کە هەڕەشە لە ئاشتی کراوە یان پێشێل کراوە یان ئەوەی کە بە کردەیی هەیە کارێکی دوژمنکارانەیە ، لە مەش راسپاردە پێشکەش دەکات یان بڕیار لەو رێو شوێنانە دەدات کە پێویستە بە گوێرەی حوکمی ماددەکانی ٤١و٤٢ بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی بگیرێتە بەر یان بخرێتەوە شوێنی خۆی.

**م ٤٠**

بۆ رێگرتن لە تەشەنەکردنی رەوشەکە، ئەنجوومەنی ئاسایش، پێش ئەوەی راسپاردەکانی پێشکەش بکات یان هەر رێووێنێك بگرێتە بەر کە لە مددەی **٣٩** دا هاتووە، بۆی هەیە داوا لە لایەنە پێك ناکۆکەکان بکات کە ئەوەی بە پێویستی بان بە باشی دەزانێ بۆ گرتنە بەری رێوشوێنی کاتی، ئەم رێوشوێنانە لە مافەکانی لایەنە ناکۆکەکان و داواکاری و سەنتەریان کەم ناکاتەوە، هەروەها لە سەر ئەنجوومەنی ئاسایشە کە حیسابێك بۆ وەرنەگرتنی لایەنە ناکۆکەکان بەم رێوشوێنە کاتیانە بکات.

**م٤٠**

بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش هەیە بڕیار بدات لە وەی کە دەبێ چ رێوشوێنێك کە پێویستێتی جگە لە بە کارهێنانی هێزی سەربازی بۆ جێبە جێکردنی بڕیارەکانی بگرێتە بە، هەروەها دەتوانێ لە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان داوا بکات کە ئەم رێوشوێنانە جێبەجێبکەن، دەکرێ لە نێونیاندا وەستانی پەیوەندی ئابووری و گەیاندنی ئاسنین و دەریایی و هەوایی و پۆستەیی و بەرقی و بێتەلی و جۆرەکانی تری گەیاندن بێت وەستانی بەشێك یان گشتی و پچرانی پەیوەندیە دیبلۆماسیەکان.

**م ٤٢**

ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایش مەزەندەی کرد کە ئەو رێوشوێنانەی لە ماددەی٤١ دا هاتووە مەبەست ناپێکێ یان سەلمێنرا کە مەبەست تەواوکار نییە، دەتوانێ هەر کارێك بە رێگای هێزی ئاسمانی و دەریایی و ووشکایی بگرێتە بەر بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی یان

بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، دەکرێ ئەم کردەوانە خۆپیشاندان و گەمارۆدان و ئۆپەراسیۆنەکانی تر بە ڕێگەی هێزی هەوایی و دەریاییو ووشکایی تایبەت بە نەتەوە یەککگرتووەکان بن.

**م ٤٣**

١- هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بۆ بەشداری لە  پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی بە لێن دەدەن، کە هێزی سەربازی و هاریکاری و ئاسانکاری پێویست بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی و لە وانەش مافی بە ئاودا ڕۆیشتن  بخەنە ژێر ڕکێفی ئەنجوومەنی ئاسایش  لە سەر داوای خۆی یان بە ڕێککەوتن یان ڕێککەوتنەکانی تایبەت.

٢-دەبێ ئەو ڕێککەوتن یان ڕێککەوتنانە ژمارەو جێگای  ئەم هێزانە و جۆرەکانی و رادەی ئامادەیی و توانای گشتی و جۆری ئاسانکاری و ئەو یارمەتیانەی کەپێشکەش دەکرێت دیاری بکات.

٣-دانوستنەکانی بەو ڕێککەوتن یان ڕێککەوتنەکانی باسکران لە سەر داوای ئەنجزمەنی ئاسایش بە خێراترین شێوە بە ڕێوە دەچن، هەروەها لە نێوان ئەنجوومەنی ئاسایش و ئەندامانی نەتەوە یەککگرتووەکان یان لە نێوان ئەمان و گروپەکانی تر لە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەبەسترێن، هەروەها دەوڵەتان کە ئیمزایانکردووە بە گوێرەی باری دەستووریيان  راستاندنیا لە سەر دەکەن.

**م ٤٤**

ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیاری بەکارهێنانی هێزیدا، ئەوا پێش ئەوەی داو لە ئەندامێك بکات کە نوێنەری نییە هێزی سەربازی بنێرێ وەك وەفاداری بە پابەندبوونەکانی کە لە ماددەی ٤٣دا هاتووە, وا پێویست دەکات کە ئەو ئەندامە داوابکات  ئەگەر ویستی بەشداری بکات لەو بڕیارانەی کە دەری دەکات کە تایبەتە بە بەکارهێنانی یەکە سەربازیەکانی چەکداری ئەو ئەندامە.

**م ٤٥**

بۆ هێنانەدی ئارەزووی نەتەوە یەکگرتووەکان لە گرتنە بەری ڕێوشوێنی سەربازی کت و پڕ ئەوا لای ئەندامان یەکەی ئاسمانی ئەهلی دەبن کە دەکرێ بە خێرایی  بۆ کاری سەرکوتکردنی نێودەوڵەتی هاوبەش بە کاریهێنرێن. ئەنجوومەنی ئاسایش هێزی ئەم یەکانەو بواری ئامادەباشی و نەخشەی کاری هاوبەش دیاری دەکات، ئەمەش بە یارمەتی لیژنەی ئەرکانی جەنگ و لەو سنورەی کە لە ڕێککەوتن و ڕێککەوتننامەکانی تایبەت لە ماددەی ٤٣ دا ئاماژەی پێکراوە.

## م٤٦

پلانی پێویستی بەکارهێنانی هێزی سەربازی ئەنجوومــەنی ئاســایش بــە هاوکــاری لیژنــەی ئەرکانی جەنگ دایدەنێت.

## م٤٧

١- لیژنەیەك لە ئەرکانی جەنگ پێك دێت کە ئەرکی مەشۆرەت و یارمــەتی دانــی ئەنجوومەنی ئاسایش دەبێت و لە هەموو مەسەلەکانی تری تایبەت بەوەی کە پێداویســتی جەنگی پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتیە و لە بەکارهێنانی ئەو هێزە سەربازیەی کە لە ژێر رکێف و سەرکردایەتی و رێکخستنی چەك و داماڵینی چەك بە گوێرەی توانا هەیە هاوکاری دەبێت.

٢- لیژنەی ئەرکانی سەربازی پێك دێت لە سەرۆکی ئەرکانەکانی جەنگ کە ئەنــدامانی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایش

بان ئەوانەی لە جێگایاندان، لە سەر لیژنەکەیە کە هەر ئەندامێك لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئەندامانی کە نوێنەری بەردەوام نین بۆ بەشداری لە کارەکانی ئەگەر بە دیارکــەوت لیژنەکــە بە باشی بە بەرپرسیارێتی خۆی هەستا ئەوا ئەو ئەندامە بەشداری کارەکانی بکات.

٣- لیژنەی ئەرکانی سوپا لە ژێر چاودێری ئەنجوومــەنی ئاســایش بەرپرســە لــە ئارِســتە کردنی ئیستراتیژی هەریەکە لەو هێزە چەکدارانەی کە لە ژێــر هــەڵس و کــەوتی ئەنجوومەنــدا دانراوە، بەلام مەسەلەی تایبەت بە سەرکردایەتی کردنی ئەم هێزانە ئەوا دواتر باس دەکرێت.

٤- لیژنەی ئەرکانی جەنگ دەتوانێ لیژنە فەرعیەکانی هەرێمی دابنێت ئەگەر لە لایــەن ئەنجوومەنی ئاسایش رێگەی پێدرا ئەمەش دوای را گۆڕینەوە لە گــەڵ ئاژانســەکانی هــەرێمی پەیوەندیدار.

## م٤٨

١- کارە پێویستیەکانی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاســایش بــۆ پاراســتنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان یان هەندێك لە وانە پێــی هەڵدەستن بە گوێرەی بڕیارلێدانی ئەنجوومەون.

٢- ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵدەستن بە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی کە ڕاستەوخۆ بۆیان هاتووە و بەو شێوە کارەی کە لە ئاژانسەکانی نێودەوڵەتی تایبەتمەندا هەیە کە ئەندامن تێیدا.

## م ٤٩

ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان هاوکردەیی دەنوێنن لە سەر پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ جێبەجێکردنی ئەو ڕێوشوێنانەی کە ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیاری لێداوە.

## م ٥٠

ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی دژی هەر دەوڵەتێك ڕێوشوێنی قەدەغەکردن و سەرکوتکردنی بەکارهێنا ئەوا هەر دەوڵەتێکی تر بۆی هەیە — کە لە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان بن یان نا— لە میانەی جێبە جێکردنی ئەم ڕێوشوێنانە ڕووبەڕووی گرفتی ئابووری بۆوە، بۆی هەیە سەبارەت بە چارەسەری ئەم کێشانە لە گەڵ ئەنجوومەنی ئاسایش هاوبیری بکات.

## م٥١

لەم بەڵێننامەیەدا نییە کە مافی سروشتی دەوڵەتان بە تاك و بە کۆ کەم بکات یان لاواز بکات، لە وەی بەرگری لە خۆیان بکەن ئەگەر هێزێکی چەکدار دەستدرێژی کردە سەر یەکێك لە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان تا ئەنجوومەنی ئاسایش ڕێوشوێنی پێویست بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی وەردەگرێ، هەروەها ئەو ڕێوشوێنانەی کە ئەندامەکان بۆ مافی بەرگری لە خۆ کردن دەیگرنە بەر یەکسەر دەبێ ئەنجوومەنی لێ ئاگادار بکرێت، ئەو ڕێوشوێنانە بە هیچ شێوەیەك ڕێگە لەوە ناگرن کە ئەنجومەن — بە گوێرەی دەسەڵات و بەرپرسیارێتی کە لە حوکمەکانی ئەم بە لێننامەیەدا وەری گرتووە — مافی هەیە لە هەر کاتێك بە پێویستی بزانێت بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی یان گەڕانەوەی بۆ شوێنی خۆی هەر کارێك ئەنجام بدات.

## بەشی هەشتەم: ریکخستنە هەرێمییەکان

**م٥٢**

١- لەم بەڵێننامەیەدا نییە کە رێگە لە رێکخراوو ئاژانسە هەرێمیەکان بگرێت چارەسەری هەر کارێك بکات پەیوەندی بە پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی هەبێت کاتێ ئەو کارە هەرێمیە باش و گونجاوبێت ئەگەر ئەو رێکخستنە یان ئاژانسە هەرێمیە و چالاکیەکانی لە گەڵ مەبەست و پرینسیپەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا گونجاوە.

٢- ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لەو رێکخستنانەدا هەن یان ئەو ئاژانسانە پێك دێنن کۆشش بکەن بۆ گرتنە بەری چارەسەری ئاشتیانەی کێشە ناوچەییەکان لە رێگەی ئەو رێکخستنە هەرێمیانە یان بە هۆی ئەو ئاژانسانە ئەمە پێش ئەوی بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش بخرێتە روو.

٣- لە سەر ئەنجوومەنی ئاسایشە کە چارەسەری ئاشتیانەی ئەم کێشە ناوچەییانە هانبدات بە رێگەی ئەو رێکخستنە هەرێمیانە یان بە هۆی ئەو ئاژانسە هەرێمیانە لە رێگەی داواکاری دەوڵەتێك کە بە مەسەلەکە پەیوەندە یان بە بەرێکردنی لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایشەوە.

٤- ئەم ماددەیە بە هیچ شێوەیەك جێبەجێکردنی ماددەکانی ٣٤و٣٥ پەك ناخات.

**م٥٣**

١- ئەنجوومەنی ئاسایش ئەو رێکخستن و ئاژانسە هەرێمیانە بۆ کارە سەکوتکارەکان بە کاردەهێنێت، هەرکاتێ ئەمەی بە گونجاو زانی، ئەوکاتیش پرۆسەکانیان لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی خۆیدا دەبێت. بەڵام رێکخستن و ئاژانسەکان نابێ لەرێگەیانەوە یان بۆخۆیان بەبێ رووخسەتی ئەنجوومەن بە هیچ کارێکی سەرکوتکاری هەڵبستن، لەوەی باسکرا گرتنە بەری ئەو رێکاریە جیادەکرێتەوە کە دژی هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتانی دوژمن کە لە برگەی ٢ لەم ماددەیەدا ناسراوە دەگیرێتە بەر هەروەك لە ماددەی ١٠٧دا هاتووە یان ئەو رێوشوێنانەی کە مەبەست لێی لە رێکخستنە هەرێمیەکاندا رێگرتنە لە نوێبوونەوە سیاسەتی دوژمنکاری لە لایەن یەکێ لە دەوڵەتەکان، ئەمەش تا ئەو کاتەی کە ئەگەر بدرێتە دەستە، لە سەر داوای حکومەتەکانی پەیوەنددار و، بە بەرپرسیارێتی رێگەگرتن لە هەر کارێکی دوژمنکاری لە لایەن هەریەکە لەو دەوڵەتانە.

٢- دەستەواژەی دەوڵەتی دوژمنکاری کە لە بڕگەی ١ی ئەم ماددەیەدا باسکرا لە سەر هەر دەوڵەتێك ئەگەیێنێت کە لە جەنگی دووەمی جیهانیدا دژی ئەو دەوڵەتانی بووە کـە واژۆی ئـەم بەڵێننامەیان کردووە.

م٥٤

دەبێ ئەنجوومەنی ئاسایش ئاگاداری تەواوی ئەو کارانە بێـت کـە بـۆ پاراسـتنی ئاشـتی و تەنایی نێودەوڵەتی لە ڕێگەی ڕێکخستنەکان یان بە هـۆی ئاژانسـە هەرێمیەکانـەوە یـان ئـەو ڕێوشوێنەی کە لێیانەوە وەبەر دەگیرێ.

## بەشی نۆیەم: هاریکاریی ئابووری و کۆمەڵایەتیی نێودەوڵەتی

م٥٥

بە ئارەزووکردن بۆ ڕەخساندنی داواو پێویستیەکانی ئارامی و خۆشگوزەرانی کە پێویستن بۆ بیناکردنی پەیوەندی دۆستانەی دروست نێوان نەتەوەکان کە لە سەر ڕێزگـرتن لـە پرینسـیپی یەکسانی لـە مافـەکانی گـەلان و بـەوەی کـە هەریەکـەیان مـافی چارەنووسـی خـۆی هەیـە بنەماکراوە، نەتەوە یەکگرتووەکان کاردەکات لە سەر:

أ- بە دیهێنانی ئاستێکی باڵا بۆ زیندەگی و دەستەبەرکردنی هۆیەکانی بەدەستخسـتنی بۆ هەموو تاکێك و رابوون بە فاکتەرەکانی گەشەسەندن و پێشخستنی ئابووری و کۆمەڵایەتی،

ب- ئاسانکردنی چارەسەری کێشە نێودەوڵەتیە ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و تەندروسـتی و ئەوەی پەیوەندی پێیانەوە هەیە، هەروەها بـەهێزکردنی هاریکـاری نێودەوڵـەتی لـە کاروبـاری ڕۆشنبیری و زانستی،

ج- بڵاوکردنەوەی ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئاوادیە بنەرەتیەکانی لە جیهاندا بۆ هەموان و بە بێ جیاوازی هۆکانی ڕەگەز یان زمان یان ئایین و، بێ جیاوازی نێوان پیـاوان و ئافرەتـان، هەروەها بەهەند وەرگرتنی ئەو ماف و ئازادیانە بە کردەیی.

## م٥٦

هەموو ئەندامان بە تاك و بە یەکەوە، پەیمان دەدەن کە بە راپەڕاندنی ئەرکی خۆیان هەڵبستن بە هاریکاری لە گەڵ دەستە بۆ دەرککردن بەو ئامانجانەی کە لە ماددەی ٥٥ دا هاتووە.

## م٥٧

١- ئاژانسە جۆربەجۆرەکان کە بە رێککەوتنی نێوان حکومەتەکان دادەمەزرێن و بە گوێرەی پەیڕەوی بنەڕەتییان بە کار و ئیشی نێودەوڵەتی فراوان لە ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و فێرکردن و تەندروستی و لایەنەکانی ئەم بوارانە دەگەیێنن بە گوێرەی رێساکانی ماددەی ٦٣ پەیوەندی ئەوان و نەتەوە یەکگرتوەکان دەبێت.

٢- ئەو اژانسانەی کە ئەم بە یەکگەیاندنە لە گەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان دروست دەکەن لەم حوکمانەی خوارەوە پێیان دەگوترێت ئاژانسە تایبەتمەندەکان.

## م٥٨

بە مەبەستی رێکخستنی سیاسەتەکانی ئاژانسە تایبەتمەندەکان و رۆواڵەتی چالاکیەکانیان دەستە راسپاردە پێشکە دەکات.

## م٥٩

لە بۆنەی گونجاودا دەستە داوادەکات دان و ستان بکرێت لە نێوان دەوڵەتانی پەیوەنددار بە مەبەستی دامەزراندنی هەر ئاژانسێکی تایبەتمەندی نوێ کە ئامانجەکانی هاتوو لە ماددەی ٥٥ بە دی بێنێت.

## م٦٠

بەرپرسیارێتی بەدیهێنان ئامانجە هاتووەکانی دەستە لەم بەشەدا دەکەوێتە سەر شانی کۆمەڵەی گشتی و هەروەها ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی بە سەرپەرشتی کۆمەڵەی گشتی، لە پێناو ئەمەشدا ئەنجومەن دەسەڵاتەکانی بەشی دەیەمی هەیە.

# بەشی دەیەم: ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی

پێکهاتە

١- ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە پەنجاو چوارئەندامە نەتەوە یەکگرتووەکان پێك دێت کە کۆمەڵەی گشتی هەڵیان دەبژێرێت.

٢- لە گەڵ رەچاوکردنی حوکمی برگەی ٣، هەموو ساڵێك بۆ ماوەی سێ ساڵ هەژدە ئەندام لە ئەندامەکانی ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەڵدەبژێررێن و دەکرێت یوکسەر ئەو ئەندامەی ماوەکەی تەواوبووە هەڵبژێررێتەوە.

٣- لە هەڵبژاردنی یەکەمدا دوای زیادکردنی ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە بیست و حەوتەوە بۆ پەنجاو چوار ئەندام، بیست و حەوت ئەندامی تر هەڵدەبژێررێن سەرەڕای ئەندمە هەڵبژێرراوەکان لە جێگای نۆ ئەندام کە ماوەی ئەندامێتیان لە کۆتایی ئەو ساڵەدا تەواو دەبێت، ئەندامێتی نۆ لە بیست و حەوت ئەندامە زیادەکە دوای تێپەڕبوونی ساڵێك تەوا دەبێت ، ئەندامێتی نۆی تریش دوای دوو ساڵ تەواو دەبێت، ئەمەش بە گوێرەی ئەو پەیڕەوەی کو کۆمەڵەی گشتی دایدەنێ پیادە دەکرێت.

٤- هەریەکە لە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی یەك نوێنەریان دەبێت.

## وەزیفە و دەسەڵاتەکان

### م٦٢

١- بۆ ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە هەستێ بە توێژینەوەودانانی راپۆرتەکان لە سەر مەسەلە نێودەوڵتیەکان لە کاروبارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و فێرکردن و تەندروستی و ئەوانەی پێوەیان پەیوەستن بەم لایەنانە، هەروەها بۆی هەیە ئاڕاستە بۆ ئەم چەشنە توێژینەوانەو دانانی ئەم جۆرە راپۆرتانە بکات، بۆشی هەیە راسپاردەکانی لە هەر مەسەلەیەك لەم مەسەلانە پێشکەشی کۆمەڵەی گشتی و ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسە پەیوەندداره تایبەتمەندەکان بکات.

٢-بۆی هەیە کە راسپاردەی تایبەت بە بلاوکردنەوەی رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادیە بنەڕەتیەکانی و رەچاوکردنیان پێشکەش بکات.

٣-بۆی هەیە پرۆژەی رێککەوتننامە لەو مەسەلانەی لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەودان ئامادە بکات و بۆ کۆمەڵەی گشتی بخاتە روو.

٤- بۆی هەیە داوای بەستنی کۆنگرەی نێودەوڵەتی بکات بۆدیراسەتکردنی ئەو بابەتانەی کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەودان ، بە گوێرەی ئەو رێسایانەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان دایدەنێت.

## م ٦٣

١- بۆ ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە کە رێککەوتن لە گەڵ هەر ئاژانسێك کە لە ماددەی ٥٧ دا ئاماژەی بۆ کراوە ببەستێت بە دیاریکردنی ئەو مەرجانەی کە بە گوێرەیەوە پەیوەندی ئەمان و نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات و ئەو رێککەوتننامانەش بۆ رەزامەندی وەرگرتن دەخرێنە بەردەم کۆمەڵەی گشتی.

٢- هەروەها بۆی هەیە روویەکانی هەماهەنگی چالاکی ئاژانسە تایبەتمەندەکان بکات بە رێگەی راگۆڕینەوە و پێشکەشکردنی راسپاردە بۆ ئەمان و بۆ کۆمەڵەی گشتی و ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان.

## م ٦٤

١- بۆ ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە کە هەنگاوی گونجاو بنێت بۆ دەستخستنی راپۆرتی ئاژانسە تایبەتمەندەکان بە رێك و پێکی هەروەها بۆی هەیە لە گەڵ ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسە تایبەتمەندەکان یوشوێن دابنێ تا راپۆرتی بدەنێ لەو هەنگاوانەی کە وەریان گرتووە بۆ جێبەجێکردنی راسپاردەکانی یان بۆ جێبەجێکردنی راسپاردەکانی کۆمەڵەی گشتی سەبارەت بەو مەسەلانەی کە دەکەوێتە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی.

٢- بۆشی هەیە کۆمەڵەی گشتی لەو تێبینیانەی هەیەتی لە سەر راپۆرتەکان ئاگادار بکاتەوە.

## م٦٥

بۆ ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە کە چ زانیارییەك پێویست بێت بیداتە ئەنجوومەنی ئاسایش و هەروەها لە سەریەتی کە هەرکاتێ داوی کرد هاوکاری بکات .

## م٦٦

١- ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی راسپاردەکانی کۆمەڵەی گشتی سەبارەت بەو وەزیفانە کە لە دەسەڵاتی خۆیدایە.

٢-دواى وەرگرتنى ڕەزامەندى كۆمەڵەى گشتى بۆى هەيە كە هەركاتىَ داواى لێكرا بە خزمەتى پێويست هەستێت بۆ ئەندامانى نەتەوە يەكگرتووەكان يان ئاژانسە تايبەتمەندەكان.
٣-ئەنجوومەن بە ئەركەكانى ترى هاتوو لە بەڵێننامەدا جگە لەوانەى لێرەدا ديارى كراون و بە وانەش كە لە ڕێگەى كۆمەڵەى گشتى بۆى ديارىكراون هەڵدەستێت.

## دەنگدان

### م٦٧

١- هەموو ئەندامێك لە ئەندامانى ئەنجوومەنى ئابوورى و كۆمەڵايەتى يەك دەنگيان دەبێت.
٢- بڕيارەكانى ئەنجوومەنى ئابوورى و كۆمەڵايەتى بە زۆرينەى دەنگى ئەندامانى ئامادەبوو ئەوانەى بەشدارن دەردەچێت.

## ڕێكاريەكان

### م٦٨

ئەنجوومەنى ئابوورى و كۆمەڵايەتى ليژنەكانى كاروبارى ئابوورى و كۆمەڵايەتى و گەشەپێدانى مافەكانى مرۆڤ دادەنێت، هەروەها هەر ليژنەيەكى تر بۆ بەدبهاتنى وەزيفەكانى پێويستيەتى.

### م٦٩

ئەنجوومەنى ئابوورى و كۆمەڵايەتى هەر ئەندامێكى نەتەوە يەكگرتووەكان بانگهێشت دەكات بۆ بەشدارى لە تاوتوێكردن لە هەر مەسەلەيەك كە تايبەت جێبايەخى ئەم ئەندامەيەبێت بە مەرجىَ مافى دەگدانى نەبێت.

### م٧٠

بۆ ئەنجوومەنى ئابوورى و كۆمەڵايەتى هەيە كار بكات بۆ بەشدارىپێكردنى نوێنەرانى ئاژانسە تايبەتمەندەكان بۆ تاوتۆكردنەكانى يان تاوتۆى ليژنەكانى دايان دەمەزرێنێت بە بىَ ئەوەى كە مافى دەنگدانيان هەبێت، هەروەها بۆى هەيە كاربكات بۆ بەشدارى تاوتۆكردنەكان ئاژانسە پسپۆڕيەكان.

**م٧١**

بۆ ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە کە ڕێی گونجاو بگرێتە بەر بۆ ڕاگۆڕین لە گەڵ دەستە ناحکومیەکان کە بایەخ بەو مەسەلانە دەدەن کە لە ناو دەسەڵاتیەکانیەتی. ئەم ڕێوشوێنانە ڕەنگە ئەنجوومەن لە گەڵ دەستە نێودەوڵەتیەکان ڕێکی بخات، هەروەها لە گەڵ دەستەی ناحکومیەکان و دوای وتوێژ لە گەڵ ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووە پەیوەندارەکان ڕێکخیان دەخات.

**م ٧٢**

١- ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی گەڵاڵە نامەی ڕێکاریەکانی دادەنێت لە نێویان چۆنیەتی هەڵبژاردنی سەرۆکەکەی دیاری دەکات.

٢- ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەرکاتێ‌پێویست بوو بە گوێرەی ئەو گەڵاڵە نامەیەی دایناوە کۆدەبێتەوە. وە پێویستە ئەو گەڵاڵەنامەیە ناوەڕۆکی بانگهێشتنەکە بۆ کۆبوونەوە لە سەر داوای زۆرینەی ئەندامەکانی تێدا بێت.

## بەشی یازدەیەم : لێدوان سەبارەت بەو هەرێمانەی کە حوکمی زاتییان وەرنەگرتووە

**م٧٣**

ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاردەدەن — ئەوانەی ئێستا یان لە ئایندە هەرێمێك بەڕێوەدەبەن کە گەلەکەی بەشێکی تەواوی لە حوکمی زاتی‌دەست نەکەوتووە — پرینسیپەکە دەڵێ کە بەرچەوەندی خەڵکی ئەم هەرێمە لە پێش هەموو شتێك دێت، هەروەها ڕازیبن کە ئەمانەتێکی پیرۆز لە ئەستۆیاندایەو پێویستە کاربکرێت بۆ گەشەپێدانی خۆشگوزەرانی خەڵکی ئەو هەرێمانە تا ئەوپەڕی توانا لە چوارچێوەی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی کە ئەم بەڵێننامەیە وێنەی کێشاوە، بۆ ئەم مەبەستەش:

أ- دەستەبەری پێشکەوتنی ئەم گەلاتە دەکەن لە کاروباری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فێرکردندا، هەروەها دەستەبەری مامەڵەیەکی ویژدانی و پاراستنی دەکەن لە هەر کارێکی خراپکاری — ئەمەش لە گەڵ ڕەچاوکردنی ئەرکی ڕێزگرتنی ڕۆشنبیری ئەم گەلانە،

ب- حوكمی زاتی پەرەپێدەدەن، رێز لە ئاواتەكانی رامیاری ئەم گەلانە دەگـرن، هاوكاریـان دەكرێت یۆ گەشەكردنی بە بڕشتی سیستەمە رامیاریە ئازادەكانیـان، بـە گـوێرەی بـارودۆخی تایبەتی هەر هەرێم و گەلەكەی، وە قۆناغە جۆربەجۆرەكانی پێشكەوتنی.

ج- ئاشتی و تەنایی نێودەولەتی بە هێز دەكەن،

د- رێوشوێنی مرۆڤایەتی بۆ گەشەو پێشكەوتن دەگرنە بەر، هـانی توێژینـەوە دەدەن، لـە نێوان خۆیاندا هاوكاری دەكەن بـۆ وەدیهێنـانی دروسـتی ئامانجـە كۆمەڵایـەتی و ئـابووری و فێركاریەكان كە لەم ماددەیەدا هاتووە، هەروەها بۆ ئـەم مەبەسـتەهاوكاری دەكـەن لـە گـەڵ دامەزراوە نێودەولەتیە تایبەتمەندیەكان هەركاتێ كە بە گونجاویان زانی،

ه- بە رێك و پێكی بەیانی سەرژمێری و بەیانی تری هونەری بۆ كە تایبەتە بـە كاروبـاری ئابووری و كۆمەڵایەتی و فێركاری لەو هەرێمەی كە لێی بەرپرسن بۆ سكرتێری گشتی دەنێرن، جگە لەو هەرێمانەی كە حوكمی بەشەكانی دوازدەو سێزدەی لـەم بەڵێننامـە یـەدا بـە سـەردا جێبەجێ دەبێت.

هەموو ئەمانەو لە گـەڵ رەچـاوكردنی ئـەو كۆتانـەی كـە لایـەنی ئـەمنی و دەسـتووری دەیهێننە پێش.

## م٧٤

ئەندامانی نەتەوە یەكگرتووەكان رەزامەند دەبن لە سەر ئەوەی كە سیاسەتیان لە بەرامبەر ئەو هەرێمانەی كە ئەم بەشەی بەسەردا جێبەدێ دەبێت — وەكو سیاسەتیانە لە وولاتی خۆیاندا — پێویستە لە سەر بنەمای دراوسێ چاكی بێت، رەچاوی بەرژەوەندی بەشەكانی تری جیهـان و خۆشگوزەرانیان لە كاروباری كۆمەڵایەتی و ئابووری و بازرگانی.

## بەشی دوازدەیەم: سیستەمی – راسپاردنی – وەسایە – نێودەوڵەتی

### م٧٥

نەتەوە یەکگرتووەکان لـە ژێـر چـاودێری خۆیـدا سیسـتـەمێکی نێودەوڵـەتی بـۆ وەسـایە دادەنێت، بۆ بەڕێوەبردنی ئەو هەرێمانەی کە لە وانەیە مل کەچی ئەم سیستەمە بن بە گوێرەی ڕێککەوتنە تاك لایەنانەی دواترو سەرپرشتی کردنیان، لەمەو دواش بەم هەرێمانـە دەگوترێـت ئەو هەرێمانەی کە وەسایە دەیانگرێتەوە.

### م٧٦

ئامانجە بنەرەتیەکانی سیستەمی وەسایە بە گوێرەی ئامانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە ماددەی یەکەمی بەڵێننامەدا هاتوون بریتین لە:

أ- پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی،

ب- کارکدن بۆ بەرزکردنەوەی خەڵکی ئەو شوێنانەی کە وەسایە دەیانگرێتەوە لە کاروبـاری سیاسی و کۆمەڵایەتیو ئابووری و فێرکاری، وە هاوکاری پێشخستنی بەرەو حوکمە زاتـی یـان سەربەخۆیی بە گوێرەی گونجانی بارودۆخی تایبەتی هەر هەرێمێك و گەلەکەی، گونجاویش بێـت لە گەڵ ئارەزووەکانی ئـەو گەلانـە کـە بـەو پـەڕی ئـازادی کـاری داوائەکـەن و بـە گـوێرەی مەرجەکانی هەر ڕێککەوتنێك لە ڕێککەوتنەکانی وەسایە،

ج- هاندانی ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادیە بنەرەتیەکانی هەموان بە بێ جیاوازی لە رەگەز و زمان و ئایین، بێ جیاوازی لە نێوان پیاوان و ئافرەتان، هەروەها هانـدانی ئـەوەی کـە پێویستە گەلانی جیهان بە یەکەوە ببەسترێنەوە،

د- دەستەبەرکردنی یەکسانی لـە مامەڵـەکردن لـە کاروبـاری کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و بازرگانی بۆ هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان و دانیشتوانیان و یەکسانی لە نێوان ئـەو خەڵکەدا سەبارەت بـە دادگـەری، لـە گـەڵ پشـت گـوێ نەخسـتنی وەدیهێنـانی هۆیـەکانی پێشکەوتن و ڕەچاوکردنی ماددەی ٨٠.

### م٧٧

١- سیستەمی وەسایە لە سەر ئەو هەرێمانەی دەکەونە ناو ئەو حاڵەتانەی خوارەوە کە بە پێی ڕێککەوتنەکانی وەسایە دەکەونە ژێر دەسەڵاتیان:

أ- ئەو هەرێمانەی کە ئیستا ماندێتن(لە ژێر ئینتیدابن)،

ب- ئەو هەرێمانەی کە رەنگە لە دەرئەنجامی جەنگی دووەمی جیهانیەو دابڕاون ،

ج- ئەو هەرێمانەی کە بە خواستی خۆیان دەوڵەتێکی هەڵدەبژێرن بۆ وەرگرتنی بەرپرسیاریەتی بەڕێوەبردنیان.

٢- بەڵام دیاریکردنی هەر هەرێمێك لە وانەی لە پێشەوە باسمانکردن کە لە ژێر سیستەمی وەسایە دابنرێت و بە چ مەرجێك بێت، ئەوا پەیوەندی بە بەستنی رێککەوتننامەی ترەوە هەیە.

## م٧٨

سیستەمی وەسایە بە سەر ئەو هەرێمانەدا جێبەجێنابێت کە بوونەتە ئەندام لە دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان چونکە پەیوەندی ئەندامانی ئەم دەستەیە لە سەر بنەمای پرینسیپی یەکسانی لە سەروەرێتیدا بێت.

## م٧٩

مەرجەکانی وەسایەی هەر هەرێمێك لە ژێر سایەی ئەو سیستەمە دادەنرێن، هەر هەموارکردن و گۆڕانێك کە دواتر بە سەریدا دێت، هەموو ئەوانە بە رێککەوتن دەبێ بە رەزامەندی ئەو دەوڵەتانەی کە ئەم بارە جێی بایەخیەتی و لە وانە دەوڵەتە ماندێتەکان لە سەر هەرێمێك کە ماندێتی یەکێ لە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەیگرێتەوە. ئەمەو لە گەڵ رەچاوکردنی حوکمی ماددەکانی ٨٣و٨٥ی سەبارەت بە راستاندن لە سەر ئەو مەرجانەو هەموارکردنەکانیان.

## م٨٠

١- جگە لە وەی رێککەوتننامەی وەسایەی تاك لایەنە کە بە گەیرەی حوکمی ماددەکانی ٧٧ و ٧و٨١ لە سەری رێك دەکەون دەبەسترێت و بە هۆیەوە هەرێمەکە لە ژێر وەسایە دادەنرێ، هەتا رێککەوتنێکی لەو چەشنە دەبەسترێ نابێ خوێندنەوە بۆ دەقی هیچ حوکمێك لە حوکمەکانی ئەم بەشە بکرێت وە نابێ بەڵێننامە یۆ خوێندنەوە دەربهێنرێت یان خوێندنەوەیەك کە لەوانەبێ بە رێگەیەك مافەکانی دەوڵەتێك یان گەلێك بگۆڕێت، یان

مەرجەکان ئەو ڕێککەوتنە نێودەوڵەتیانەی کە هەن بیانگۆڕێت کە لە وانەیە ئەندامێکی نەتەوە یەکگرتووەکان لایەنێك بێت تێیدا.

٢- نابێت بڕگەی ١ ی ئەم ماددەیە وا بخوێنرێتەوە کە هۆیەك ئامادەبکات بۆ دواکەوتن یان دواخستنی دان و ستان لە ڕێککەوتننامەکان ئامادە دەکات کە دەیەوێت ئەو هەرێمانەی کە ماندێت دەیانگرێتەوە بکات یان هەرێمەکانی تر لە سیستەمی وەسایە بە گوێرەی م ٧٧ یان دواکەوتن یان دواخستنی بەستنی ئەوە ڕێککەوتننامانە.

## م٨١

ڕێککەوتننامەی وەسایە لە هەموو بارێکدا ئەو مەرجانە دەگرێتەوە کە بە هۆیەوە ئەو هەرێمەی کەوەسایە دەیگرێتەوە بە ڕێوە دەبررێت، وە ئەو دەسەڵاتە دیاری دەکات کە بەڕێوەبردنی ئەو هەرێمە دەکات، دەکرێ ئەو دەسەڵاتە کە لەمەو دوا لە ناوحوکمەکاندا بە (دەسەڵاتی بەرێوەبردن) دێت دەوڵەتێك یان زیاتر یان دەستەی (نەتەوە یەکگرتووەکان) خۆی بێت.

## م٨٢

لە هەر ڕێککەوتننامەیەك لە ڕێککەوتننامەکانی وەسایە دەکرێ شوێنێکی ئیستراتیژی کە هەرمێك بەشێکی یان هەمووی کە سیستەمی وەسایەی لە سەر جێبەجێ دەبێت دیاری بکرێت، بێ شکاندنی هەر ریککەوتننامەیەك بان ڕێککەوتننامەکانی تایبەت کە بە گوێرەی ماددەی ٤٣ بەستراون.

## م٨٣

١- ئەنجوومەنی ئاسایش هەموو وەزیفەکانی (نەتەوە یەکگرتووەکان) کە پەیوەستە بە پێگەی ئیستراتیژیەوە بەر دەست دەخات، هەروەها ڕەزامەندیکردن لە مەرجی ڕێککەوتننامەکانی وەسایە و گۆڕان و هەموارکردنیان.

٢- هەموو ئەو ئامانجە بنچینەییانەی کە لە ماددەی ٧٦ دا هاتوون ڕەچاو دەکرێت بە نسبەت گەلی هەر پێگەیەکی ئیستراتیژی.

٣- ئەنجوومەنی ئاسایش لە ئەنجوومەنی وەسایە هاریکاری وەردەگرێ — لە گەڵ ڕەچاوکردنی ڕێککەوتننامەکانی وەسایەو بێ لێخستنی ئەو بارانەی کە تایبەتە بە ئاسایشەوە - لە وەکارکەوتنی ئەوەی کە وەزیفەکانی (نەتەوە یەکگرتووەکان) لە نیزامی وەسایەی تایبەت بە کاروباری سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و فێرکاری پێگە ئیستراتیژیەکان.

**م ٨٤**

ئەرکی دەسەلاتی بەڕێوەبردنە کە دەستەبەری پشکی ئەو هەرێمەی کە وەسایە دەیگرێتــەوە لە پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتیدا بکات. بۆ بــەدیهێنانی ئــەم مەبەســتەش دەکــرێ دەسەڵاتی بەڕێوەبردن هێزی خۆبەخش بە کاربێنێ و ئاسانکاری و یارمەتی بدات بەو هەرێمەی کە لە ژێر وەسایەدایە بۆ ئەوەی بەو پابەندبوونانە هەڵبستێت کە ئەو دەسەڵاتە بە ئەنجوومەنی ئاسایشی لەم بارەوە داوە، هەروەها بۆ هەستان بە بەرگری و چەسپاندنی یاساو سیستەم لە نــاو ئەو هەرێمەی کە وەسایە دەیگرێتەوە.

**م٨٥**

١- کۆمەڵەی گشتی وەزیفەکانی نەتەوە یــەکگرتووەکان کــە تاتیبەتــە بــە رێککــەوتنی وەسایە وەدەست دەخات لە سەر هەموو ئەو رووبەرانەی کە نەنوسراوە رووبەری ئیستراتیژین لە نــاو ئەمانەشــدا بەرقــەرارکردنی مەرجــەکانی رێککەوتننامــەکانی وەســایەو گــۆڕان و هەموارکردنیان.

کۆمەڵەی گشتی یارمەتی لــە ئەنجوومــەنی وەســایە وەردەگــرێ بــۆ ئــەوەی بــەم ئەرکانــە هەڵبستێت و لە ژێر چاودێریدا کاربکات.

## بەشی سێزدەیەم: ئە نجوومەنی وەسایە

پێکهاتن

١-ئەنجوومەنی وەسایە لە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان پێك دێت کــە لــە خــوارەوە باس کراون:

أ- ئەو ئەندامانەی کە دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی هەرێمە وەسادارەکەیان وە خۆ گرتووە،

ب- ئەو ئەندامانــەی کــە لــە مــاددەی ٢٣ دا ناویــان هــاتووە کــە بــەڕێوەبردنی هەرێمــە وەسادارەکەیان وە خۆنە گرتوون،

ج- ژمارەی ئەو ئەندامانەی کە یۆ وەدەستدان پێویستن کە ژمارەی ئەندامی ئەنجوومــەنی وەسایە دەبــن بــە دوو گروپــی یەکســان، یەکــەمیان ئــەو ئەندامانــەی بــەڕێوەبردنی هەرێمــە

وەسادارەکەیان وە خۆ گرتووە، ئەویتریان ئەوانەن کە وازیان لە بەڕێوەبردنە هێناوە، ئەم ئەندامانە لە لایەن کۆمەڵەی گشتی بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێررێن.

٢- هەریەکە لە ئەندامانی ئەنجوومەنی وەسایە ئەو کەسەی کە بە شیاوی دەزانێ بۆ نوێنەرایەتی ئەم ئەنجوومەنە دیاری دەکات.

## وەزیفە و دەسەڵاتەکان

### م٨٧

بۆ هەریەکە لە کۆمەڵەی گشتی و ئەنجوومەنی وەسایە کە بە سەرپەرشتییان کار دەکرێت، ئەوانیش بە بەجێهێنانی ئەرکەکانی خۆیان هەڵدەستن:

أ-لەو راپۆرتانە بڕوانن کە دەسەڵاتی بەڕێوەبردن بۆیان دەنێرێت،

ب- نامەکان وەربگرێت و بە مشۆرەت لە گەڵ دەسەڵاتی بەرێوەبردن بیپشکنێ،

ج- سەردانی رەسمی بۆ ئەو هەرێمانەی کە وەسایە دەیانگرێتەوە رێك بخات لەو کاتانەی کە لە گەڵ دەسەڵاتی بەرێوەبردن رێك دەکەون،

د-ئەم رێوشوێنانەو ئەوانی تریش بە دی دەکات کە بە گوێرەی ئەو مەرجانەی لە رێككەوتنەكانی وەسایەدا دیاری کراون.

### م٨٨

ئەنجوومەنی وەسایە کۆمەڵێك پرسیار لە سەر پێشکەوتنی دانیشتوانی هەر هەرێمکی ژێروەسایە لە کاروباری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فێرکاری دادەنێ. دەسەڵاتی بەڕێوەبردن لە هەر هەرێمێکی وەسایەدار لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی کۆمەڵەی گشتی راپۆرتی ساڵانە لە سەر ئەم بنەمای ئەم پرسیارانە دەداتە کۆمەڵەی گشتی.

## دەنگدان

### م٨٩

١- هەر ئەندامێکی ئەنجوومەنی وەسایە یەك دەنگی هەیە.

٢- بڕیارەکانی ئەنجوومەنی وەسایە بە دەنگی زۆرینەی ئەندامانی ئامادەبووی بەشدار لە دەنگدان دەردەچێت.

## ڕێکاریەکان

**م٩٠**

١- ئەنجوومەنی وەسایە گەڵاڵەنامەی ڕێکاریەکان و لە وانەش ڕێگەی هەڵبژاردنی سەرۆك دادەنێ.

٢- ئەنجوومەنی وەسایە هەرکاتێ پێویستی کرد بە گوێرەی ئەو گەڵاڵنامەیەی کە دایڕشتووە کۆدەبێتەوە. پێویستە لەو گەڵاڵەنامەیەدا دەقی بانگهێشتی کۆبوونەوە لە خۆبگرێت لە سەر داوای زۆرینەی ئەندامەکان.

**م٩١**

ئەنجوومەنی وەسایە هەرکاتێ پێویستو گونجاو بوو داوا لە ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەلایەتی و ئاژانسە پسپۆڕیەکان

هەریەکە لە چوارچێوەی کاری خۆیدا یارمەتییان بکات.

## بەشی چواردەیەم: دادگای دادی نێودەوڵەتی

**م٩٢**

دادگای دادی نێودەولەتی ئامرازی سەرەکی دادوەری نەتەوە یەکگرتووەکانە، بە گوێرەی پەیڕەوی بنەڕەتی خۆی کە هاوپێچە لە پاشکۆی ئەم بەڵێننامە کاردەکات و لەسەر پەیڕەوی بنەڕەتی دادگای هەمیشەیی دادی نێودەولەتی دانراوە کە بەشێکی جیانەکراوەیە لە بەڵێننامە.

**م٩٣**

١-هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەحوکمی ئەندامبوونیان لایەنن لە پەیڕەوی بنەڕەتی دادگای دادی نێودەولەتی.

٢-دەولەتێك کە لە ناو نەتەوە یەکگرتووەکاندا نییە دەکرێ بێتە ناو پەیڕەوی بنەڕەتی دادگای دادی نێودەولەتی بەو مەرجانەی کە بۆ هەر حالەتێك کۆمەلەی گشتی لە سەر پێشنیاری ئەنجوومەنی ئاسایش دیاری دەکات.

## م٩٤

١-هەر ئەندامێك لە ئەندامەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان بەڵێن دەدات كە دەبێ گوێڕایەڵی حوكمی دادگای دادی نێودەوڵەتی بێت لە هەر مەسەلەیەكدا كە خۆی لایەن بێت تێدا.

٢-ئەگەر یەكێك لە لایەنە دادبینیەكان لە هەر مەسەلەیەكدا رێگر بوو لە هەستان بەو حوكمەی كە دادگا لە سەری دەچەسپێنێت، بۆ لایەنەكەی تر هەیە كە پەنا بباتە بەر ئەنجوومەنی ئاسایش، ئەنجوومەنیش ئەگەر بە پێویستی زانی ئەوا راسپاردە پێشكەش دەكات یان بڕیار بۆ ئەو رێوشوێنانەی كە پێویستە بگیرێتە بەر بۆ جێبەجێكردنی ئەو حوكمە دەردەكات.

## م٩٥

هیچ رێگریەك لەم بەڵێننامەیەدا نییە كە ئەندامانی نەتەوە یەكگرتووەكان چارەسەری كێشەو جیاوازیەكانیان بدەنە دادگایەكی تر بە گوێرەی ئەو رێككەوتننامەیەی لە مەوپێش هەن یان لەداهاتوودا دەیبەستن.

## م٩٦

١-بۆ هەریەكە لە كۆمەڵەی گشتی یان ئەنجوومەنی ئاسایش هەیە داوا لە دادگای دادی نێودەوڵەتی بكات كە لە هەر مەسەلەیەكی یاسایی رەئی بدات.

بۆ سەرجەم لقەكانی دەستە و ئاژانسە تایبەتمەندەكان سەر بەئەوان هەیە ئەوانەی ئەكرین كۆمەڵەی گشتی روخسەتیان پێ بدات لە هەر كاتێكدا، لە دادگا داوا بكات رەئی لە هەر مەسەلەیەكی یاسایی بدات كە دەكەوێتە چوارچێوەی كارەكانیەوە.

## بەشی پازدەیەم: سکرتاریەت

**م ٩٧**

دەستە سکرتاریەتێکی دەبێت کە سکرتێری گشتی و ئەو فەرمانبەرانەی کە پێویستن دەگرێتەوە. کۆمەڵەی گشتی سکرتێری گشتی دادەنێت لە سە راسپاردەی ئەنجوومەنی ئاسایش، سکرتێری گشتی گەورەترین فەرمانبەری بەرێوەبردنە لە دەستەدا.

**م٩٨**

سکرتێری گشتی سەرپەرشتی کارەکان دەکات لە هەموو کۆبوونەوەکانی کۆمەڵەی گشتی و، ئەنجوومەنی ئاسایش و، ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و، ئەنجوومەنی وەسایە، هەروەها بە ئەرکی تر هەڵدەستێت کە ئەم لقانە بۆی رەوانە دەکەن، هەروەها سکرتێری گشتی ساڵانە راپۆرتێك لە سەر کارەکانی بۆکۆمەڵەی گشتی ئامادە دەکات.

**م ٩٩**

سکرتێری گشتی دەتوانێ ئەنجوومەنی ئاسایش لە هەر مەسەلەیك ئاگادار بکاتەوە کە پێی وایە هەڕەشەیە لە سەر پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی.

**م١٠٠**

١-بۆ سکرتێری گشتی و فەرمانبەرەکانی نییە بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەرکەکانیان داوا یان وەرگرتنی رێنمایی لە هیچ حکومەتێك یان دەسەلاتێکی دەرەوەی دەستە وەرگرێت. پێویستە بە هیچ کارێك هەڵنەستن کە پێگەیان لە کەدار بکات بەو سیفەتەی کە فەرمانبەری نێودەوڵەتین و تەنها لە بەرامبەر دەستەدا لێپرساون.

٢-هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەڵێن دەدەن کە رێز لە سیفەتی نێودەوڵەتی بەرپرسیارێتی سکرتێری گشتی و فەرمانبەرەکانی بگرن و هەوڵ نەدەن لە کاتی هەستانیان بە بەرپرسیارێتی کاریگەرییان لە سەر دابنێن.

**م١٠١**

١-سکرتێری گشتی فەرمانبەرانی سکرتاریەت دادەنێ بە گوێرەی ئەو گەڵاڵەنامەیەی کە کۆمەڵەی گشتی دایدەنێ.

٢-بۆ ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەنجوومەنی وەسایە بە شێوەیەکی بەردەوام فەرمانبەر بۆ لقەکانی تری نەتەوە یەکگرتووەکان کە پێویستی پێیان هەیە دابمەزرێنێت، سەرجەم ئەو فەرمانبەرانەش بەشێکن لە سکرتاریەت.

٣-پێویستە لە دانان و بەکارخستنی فەرمانبەران و دیاری کردنی مەرجی خزمەتیان بە پلەی یەکەم رەچاوی بە دەست هاوردنی بەرزترین ئاستی توانـاو لێهاتوویی و پاکی بکرێت. گرینگیشە لە دەست نیشانکردنی بە گوێرەی باشترین دەرفەت رەچاوی لایەنی دابەشکردنی جوگرافی بکرێت.

## بەشی شازدە: حوکمە جۆراوجۆرەکان

### م١٠٢

١-هەر پەیماننامەو رێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی لە لایەن هەر ئەندامێکە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەبەسترێت دوای کارکردن بەم بەڵێننامەیە دەبێ لە سکرتاریەتی دەستە تۆمار بکرێت و بە خێرایی هەستێ بە بڵاوکردنەوەی.

٢-هەر لایەنێك لە پەیماننامە یان رێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی کە بە گوێرەی بڕگەی یەکەمی ئەم ماددەیە تۆمار نەکرابێت بۆی نییە لە بەردەم هەر لقێکی نەتەوە یەکگرتووەکان دەست بەو پەیماننامە یان رێککەوتننامەیەوە بگرێت.

### م١٠٣

ئەگەر تێکگیران هەبوو لەو پابەندبوونەی کە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان بە گوێرەی بەڵێننامە پێیەوە پابەندن لە گەڵ هەر پابەندبوونێکی تر کە پێیەوە پەیوەستن ئەوا پابەندجبوونیان بە گوێرەی ئەم بەڵێننامەیە بە هەند وەردەگیرێ.

### م ١٠٤

دەستە لە وولاتی هەر ئەندامێکیدا شیاوی یاسایی پێویستی هەیە بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکان بە دیهێنانی ئامانجەکانی.

م١٠٥

١-دەستە لە خاكی هەر ئەندامێكیدا لە باشیەكان و بە خشراوەكانی كە بە دیهێنانی مەبەستەكانی دەیخوازێت بە هرە مەند دەبێت.

٢-هەروەها نوێنەرانی ئەندامانی نەتەوە یەكگرتووەكان و فەرمانبەرەكانی ئەم دەستەیە لە باشی و بەخشراوەكانی پێویست بۆ سەربەخۆیی هەستانیان بەكاری وەزیفەیی پەیوەنداربە دەستە بەهرەمەند دەبن.

٣-بۆ كۆمەڵەی گشتی هەیە بە مەبەستی دیاری كردنی باسە درێژەكانی تایبەت بە جێبەجێكردنی برگەكانی ١و٢ی ئەم ماددەیە، راسپاردە پێشكەش بكات، بۆشی هەیە پێشنیاری بەستنی ریككەوتننامە بۆ ئەم مەبەستە پێشكەشی ئەندامانی بكات.

## بەشی حەڤدەیەم: رێوشوێنی پاراستنی ئاشتی لە قۆناغی گواستنەوە

م١٠٦

تا ئەو كاتەی كار بە رێككەوتننامەكانی تایبەت دەكرێت كە لە ماددەی ٤٣دا ئاماژەی پێدراوە لە سەر ئەو شێوەیەی كە ئەنجومەنی ئاسایش دەبینێ كە دەتوانێ بە گوێرەی ماددەی ٤٢ بە بەرپرسیارێتی هەڵبستێت، ئەو دەوڵەتانەی كە بەشداری لێدوانی چوار دەوڵەتەكەیان لە مۆسكۆ لە ٣٠ تشرینی یەكەمی ١٩٤٣كرد ئەوو فەرەنسا بە گوێرەی حوكمی برگە ٥ لەو لێدوانە، هەروەها پێنج دەوڵەتەكە لە گەڵ ئەندامەكانی تری نەتەوە یەكگرتووەكان گەر پێویستی كردگفتوگۆ دەكەن، بۆ ئەوەی لە جیاتی دەستە بە كاری هاوبەش هەڵبستن كە بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی پێویستە.

م١٠٧

هیچ شتێك لەم بەڵێننامەیەدا نییە كە هەر كارێك بەتاڵ بكاتەوە یان رێگە بگرێت لێی بەرامبەر دەوڵەتێك كە لە كاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا دژایەتی یەكێ لە دەوڵەتانی ۆاژۆكەر بووە لە سەر ئەم بەڵێننامەیە ئەگەر ئەو كارە وەرگیرابێ یان رێگەی پێدرابێت لە ئەنجامی ئەم جەنگەوە لە حكومەتانی بەرپرس لە هەستانیان بەم كارەوە.

# بەشی هەژدەیەم: هەمواركردنی بەڵێننامە

## م١٠٨

ئەو هەمواركردنانە كە بە سەر ئەم بەڵێننامەیە دادێت بە سەر سەرجەم ئەندامانی نەتەوە یەكگرتووەكان دەسەپێت ئەگەر بە ڕەزامەندی ٣/٢ی ئەندامانی كۆمەڵەی گشتی كرابێ و ٣/٢ی ئەندامانی نەتەوە یەكگرتووەكان راستانی لە سەر كردبێت لە ناویاندا هەموو ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایش، بە گوێرەی باری دەستووری لە هەر دەوڵەتێك.

## م١٠٩

١- دەكرێ كۆنگرەیەكی گشتی ئەندامانی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ چاوخشاندنەوە بەم بەڵێننامەیەدا ببەسترێت لەو كات و شوێنەی كە كۆمەڵەی گشتی بە زۆرینەی ٣/٢ی ئەندامەكانی و بە ڕەزامەندی نۆ لە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش ، هەر ئەندامەش یەك دەنگی لە كۆنگرە دەبێت.

٢- هەر گۆڕانێك لەم بەڵێننامەیەدا كە كۆنگرە بە زۆرینەی ٣/٢ی ئەندامانی رایبسپێرێ جێ بەجێ دەبێت ئەگەر ٣\٢ی ئەندامانی نەتەوە یەكگرتووەكان راستانیان لە سەر كرد لە ناویاندا ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایش بە گوێرەی باری دەستوورییان.

٣- ئەگەرئەم كۆنگرەیە پێش دەورەی ئاسایی دەیەمی كۆمەڵەی گشت نەبەسترێت، دوای كاركردن بەم بەڵێننامەیە، دەبێ بە نەخشەی كاری ئەو دەورەیەوە پێشنیارێك بۆ بەستنی دابنرێت، ئەو كۆنگرەیەش دەبەسترێت ئەگەر زۆرینەی ئەندامانی كۆمەڵەی گشتی و حەوت لە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیاریان لێ دا.

## بەشی نۆزدەیەم: راستان و ئیمزاکردن

### م١١٠

١- دەوڵەتان کە واژۆیان کردووە لە سەر ئەم بەڵێننامەیە بە گوێرەی باری دەستوریان راستان دەکەن.

٢- راستانەکان دەدرێنە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە ئەو دەوڵەتانەی واژۆیان کردووە بەهەر (پێسیاردنێك) ئاگادار دەکاتەوە، هەروەها سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دوای دامەزراندنی ئاگادار دەکاتەوە.

٣- کار بەم بەڵێننامەیە دەکرێت هەرکاتێ راستانەکانی کۆماری چین و فەرەنساو یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستەکانی سۆڤیەت و پادشایەتی بەریتانیای گەورەو ئێرلەندای سەروو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە گەڵ زۆرینەی دەوڵەتانی واژۆکەرگەیشت هەروەها حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بروتۆکۆڵێکی تایبەت بۆ راستانە گەیشتووەکان ئامادە دەکات و وێنەیەکی دەگەێنێتە دەوڵەتانی واژۆکەر لە سەر بەڵێننامەکە.

٤- دەوڵەتانی واژۆکەر لە سەر ئەم بەڵێننامەیە کە دوای کارپێکردنی راستان دەکەن، لە رۆژی گەیشتنی راستانەکانیان بە ئەندامانی ئەسڵی نەتەوە یەکگرتووەکان لە قەڵەم دەدرێن.

### م١١١

ئەم بەڵێننامەیە بە پێنج زمانی چینی و فەڕەنسی و روسی و ئینگلیزی و ئیسپانی دانراوە، بە یەکسانی زمانی سەرەکین، بەڵێننامەکە لە ناو پارێزراوەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەبێت، ئەم حکومەتەش حکومەتەکانی تر واژۆکەر لە وێنەی دانپێنراو ئاگادار دەکاتەوە.

بۆ راستی ئەمەش نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر ئەم بەڵێننامەیە واژۆیان کرد.
لە شاری سان فرانسیسکۆ لە رۆژی ٢٦ی حوزەیرانی ١٩٤٥دا دەرچوو.

❖ لە لایەن دانەرەوە لە عەرەبیەوە وەرگێڕراوە.

## پاشکۆی دووەم

## یاداشتنامەی مستەفا بارزانی

### سەرکردەی شۆرش و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان
### بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان

ئەم یاداشتنامەیە لەگەڵ پاشبەندەکانی لە ناوەڕاستی تشرینی یەکەمی ١٩٦٩ بۆ دەستەی نەتەوەیەکگرتووەکان بەرزکراوەتەوە و پێش ئەوە سەرکردایەتیی شۆرش لە ساڵی ١٩٦٦دا یاداشتنامەیەکی تریشی بۆ نەتەوەیەکگرتووەکان بەرزکردبووەوە کە بە دوور و درێژی پوختەی بارودۆخە مەینەتبارو کارەساتبارەکەی کوردستانی تێدا بوو.

- گەورەی بەرێز یوپانت- سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان.
- گەورەی بەرێز خاتوونی سەرۆکی خولی بیست و چوارەمی دەستەی گشتی.
- دەستەی نەتەوەیەکگرتووەکان.
- کۆمەڵەی مافی مرۆڤ.
- ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەلآیەتی.
- لیژنەی پاکتاوکردنی کۆلۆنیالیزم.
- ڕێکخراوی فێرکردن و زانست و ڕۆشنبیریی سەر بە دەستەی نەتەوەیەکگرتووەکان (یۆنسکۆ)
- لیژنەی فریاکەوتنی نێودەوڵەتیی پەنابەران.
- شاندەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

شەڕەفی ئەوەم پێ دەبڕێ ئەم یاداشتنامەیە لە بارەی بارودۆخی خەفەتباری کوردستانی عێراقەوە پێشکێش بە بەرێزتان بکەم.

لە مێژووی نەتەوەیەکگرتووەکاندا کە مەبەستی (( ڕزگارکردنی نەوە یەك لە دوا یەکەکانی مرۆڤایەتییە لە نەفرەتی شەڕ)) ڕووی نەداوە ئاوها شەڕێك بە تەواوەتی بخاتە پشت گوێ کە هەشت ساڵ دەوامی کردووە، ئەویش ئەو شەڕە ڕەگەزپەرستییەیە کە فەرمانڕەواکانی عێراق دژی گەلی کورد دەیکەن، بە چاوپۆشی لە داواکاریی چەند جارەی ئێمە بۆ گەورەترین ڕێکخراو لە جیهاندا. ئەو شەڕە دوژمنکارییە لە یازدەی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ دژی گەلی کوردستانی بێ پشتیوان دەستی پێ کردووە و، لەو کاتەوە پێنج حکومەتی دیکتاتۆری هاتوونەتە سەر کار و، هەریەکەشیان لەو شەڕە سەرتاسەرییەدا هەر بەردەوام بووە.

ئەو زەمانەی کە ئەم شەڕە درێژەی تێدا کێشا، لە درێژەکێشانی هەردوو شەڕی یەکەم ودووەمی جیهانی تێکڕا کەمێك کەمترە. ئەو چەك و هۆی وێرانکارییانەش کە سوپای عێراق بەکاری هێنان لە تازەترین جۆری و لەوانەش ناپاڵم و گوللەی ژەهراوی و هەموو جۆرە بۆمبایەکی سووتێنەك.

ئەوەی شایانی تێبینی کردنیش بێت ئەوەیە کە ئەو هۆیە وێرانکەرانە دەوڵەتێك بە کاریان دێنێت، لە هەموو دەوڵەتێك دڕندەتر و دڵڕەقتر و لە هەمووشیان کەمتر هەست بە بەرپرسیارەتی دەکات، نەك هەر تەنیا بۆ خەڵك کوشتن و لە ناوبردن و نەك هەر تەنیا بۆ وێرانکردنی ماڵەکانیان، بگرە بە سووتاندنی کێڵگە و کشتوکاڵیان و کوشتنی مەڕ و ماڵاتیشیان، ئەمەش ئامانجی ئەوەیە بە دەستی ئەنقەست و بە عەمدی گەلی کورد لەبرسان بکوژێ. لەبەر ئەوە زەحمەت نییە لای ئەو کەسانەی گیرۆدەییی ناخۆشیی شەڕی جیهانییان دیبێ، ئەو مەینەتییە وێنا بکەن و بیهێننە بەرچاو کە گەلەکەی ئێمە پێیدا تێ دەپەڕێت.

جا لەوەتی فەرمانڕەوا بەعسییەکان لە عێراق بۆیان ڕوون بووەتەوە کە ناتوانن شۆڕەشی کورد لە ناو ببەن، وردە وردە زیاتر پەنایان بۆ ئەو ڕێگایانە بردووە کە دەبنە هۆی دوابڕینی گەلی کورد و قڕکردنی. ئەوان ئێستە هەوڵی ئەوە دەدەن کە بە تەواوەتی وەکو گەلێك مەحفی کەنەوە. ئەمەش ئەوەمان بۆ لێك دەداتەوە کە سوپای عێراق بۆچی

ئەو هەموو ژمارە زۆرە کـارە قڕکـەرە ڕەگەزپەرسـتییانە ئـەنجام دەدات و هـەر ئەمـەش مەبەستیان لە پیادەکردنی سیاسەتی خاك سووتاندن. ئەو شێوازەش کە بەردەوام پێـڕەوی دەکەن دەتوانین بڵێین بەردەوام بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

سوپا ناوچەیەك بە تەواوەتی دەورە دەدات و دوای ئـەوەی ئـاگری تانـك و تۆپخانـە و باڵەفڕ ئاراستەی ئەو ناوچەیە دەکات و هەر کەسێکیش لە خـەڵکی ناوچـەکە ئەگـەر لـە ماڵەوە نەکوژرابێت، ئەوا لە کاتێکدا کە هەڵدێن بە گوللە دەیانکوژن، ئینجا پیادە تەکان دەدەن بەرەو قوربانییەکانیان و، دوای ئەوەی ڕێیەکە بە تەواوی ڕادەماڵن ماڵ بە ماڵ ئاگر لە خانووەکان بەردەدەن , ئیدی بەم ڕێگەیە سەدان هاوڵاتی لە سەنگەسەر کوژران کە پێنج سەد وچل خانوو لە مانگی ئایاری ڕابردوودا ئاگریان تێ بەردرا و دەیـان گونـد و گـەلێك ڕووبەری بەرفراوانی مەزرا و کشتوکاڵ لە دەشتی هـەولێر بـە هـەمان شـێوە لـە مـاوەی تەمووزی ڕابردوودا سووتێنران.

لە نۆزدەی مانگی ئاب بیست و نۆ ژن و سی و حەوت منداڵی کوڕ و کـچ و پیـاوێکی پیر لە گوندی دەکان کە کەوتووەتە باکووری ڕۆژهەلاتی موسڵ سـوتێنران. کاتێـك سـوپا هێرشی بردە سەر دێی ئەو کلۆلانە. هەلاتن بۆ ئەشکەوتێکی ئەو ناوە، لەوێ سوپا پێیـان ڕاگەیشتن و دەستیان بە سەر دەروازەی ئەشـکەوتەکەدا گـرت و ئینجـا چـیلکە و داریـان کۆکردەوە و لە نێو ئەشـکەوتەکەدا کەڵەکـەیان کـرد و نـەوتیان پیـاداکرد و دەسـتبەجێ ناشیرینترین تاوان ئەنجام درا بە سوتاندنی ئەوانـە بەزینـدوویی، لـە نێـو قوربانییەکانـدا منداڵێك دەبینی ناوی بەشار ڕەمەزان تەمەنی لە مانگێك کـەمترە و، هـویری عیسـاش دەبینی کە تەمەنی لە هەشتا ساڵ زیاترە.

لە ڕۆژی ١٦ی ئەیلوول نەوەد وحەوت هاوڵاتی کە دانیشتووی گوندی سـۆریای نێزیـك زاخۆ بوون لەسەر خاور بە کوشتن و بریندارکردن لە نێوبران و، سەربازەکان منداڵەکانیان لە نێولانکەکانیان هەڵدەدایە ئاوەوە و لە زێیەکـەدا دەخنکـان و دەمـردن و حـەننا قاشـای قەشەی کلدانیش لە نێو کوژراوەکاندا بوو و، تەنیا تاقە ژنێـك تـوانی لـەو کوشـتارگەیە ڕزگار بێت.

هەر لەم کاتەی ئێستەشدا هەزاران کوردی بێ تاوان لە زیندانەکانی عێراقدان بە دەست ئەشکەنجەدانیان لە لایەن بەعسییەکانەوە دەناڵێنن و گەلێکیش لە وانە لە ئەنجامی ئەشکەنجەداندا مردوون وەك ئیبراهیم حاجی عومەر و عەبدورەحمان سادق.

پتر لەسەد هەزار مرۆڤیش ناچار کراون شوێنی دانیشتنی خۆیان لە شار و گوندەکان لە دەوری دامەزراوەکانی نەوت و خاکە بە پیتەکان، بەجێ بهێڵن و بەزۆر بۆ ناوچە شاخاوییەکان دەرکراون دوای ئەوەی موڵك ومالّیان دەستی بەسەر داگیراوە.

فەرمانڕەوایانی عێراق هەڵسوکەوتێکی دڵڕەقانەیان بە تایبەتی بۆ مەسیحییەکان لە کوردستان بەکارهێناوە چونکە لە ڕووی رەگەز و ئاینەوە لەو فەرمانڕەوایانە جیان. ئەو فەرمانڕەوایانە چەندان دێرو کلێسایان وێران کرد و ژمارەیەك ڕەبەن و کاهینیان، لە کاتی هەڵکوتانە سەر پەرستگاکانیان کوشت و بریندار کرد.

هۆی ئەو شەڕە دڕندانەیە دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە گەلەکەمان دەیەوێ پارێزگاریی زمان و ڕۆشنبیری و بنەما نەتەوەییەکانی خۆی بکات و دژی ئەو پرۆسە زۆرەکییە دەوەستێت کە دەیەوێت پاکتاوی نەتەوایەتی بکات.

ئەو کوشتار و ژن و منداڵ و پیر سوتاندنە بەزیندوویی و گەلێك ئەو کارە دڕندانە و دزێوە وەحشییانەی فەرمانڕەوا بەعسییەکان ئەنجامی دەدەن پێشێل کردنێکی ئابڕوچوانەیە بۆ میساقی نەتەوەیەکگرتووەکان.

کوردی عێراق هیچ ڕۆژێك وەك هاولاتی پلە دوو بەولاوە مامەڵەیان لەگەڵ نەکراوە و بگرە لەوە کەمتریش، لە بارودۆخی ئێستەشدا کورد لە هەموو مافێکی مرۆیی بێ بەشە، وێڕای ئەوەی کە بوونیشی هەڕەشەی لە نێوچوونی لێ دەکرێت.

فەرمانڕەواییی عێراق و ئیستیغلالکردنی کوردستان لە لایەنیەوە دزێوترین شێوازی ئیستیغلالە و ڕاستی ئەوەی کە پێستی فەرمانڕەوایانی عێراق ئەسمەرە بەس نییە بۆ ئەوەی سیفەتی کۆلۆنیالی لەو فەرمانڕەوایانە دوور بخاتەوە.

شایانی ئەوەشە لێرەدا باس بکەین کە شەڕ لە کوردستان ئێستە لە هەموو کاتێك زیاتر هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایشی ڕۆژهەلاتی نێزیك دەکات و لەبەر ئەو هۆیانەی لەمەوبەر باسمان کردن و لەبەر ئەوەی حکوومەتەکانی عێراق لە چارەسەرکردنی کێشەکە لە ڕووی سیاسی و سەربازییەوە شکستیان هێنا، ئەو شەڕەی ئەمڕۆ لە ئارادایە دژی

گەلەکەمان، پرسێکی ناوخۆیی نییە وەك ڕێـژیمی حـوکمی عێـراق دەڵێـت، چـونکە چۆن دەکرێت شەرێکی وێرانکەرانە کە هەشتساڵ درێژە بکێشێت بەرپرسێکی ناوخۆ دابنرێـت تەنیا پێوەندیی بە خاوەنەکانیانەوە هەبێ؟

ڕێگەی ئەوەم پێ بدەن کە داواکارییەکانم بۆ نەتەوەیەکگرتووەکان و لیژنە و دەسـتە و ئەندامەکانی تازە بکەمەوە بۆ ئەوەی پاڵەپەستۆ بخەمە سەر دەوڵـەتی عێـراق و ناچـاری بکەن شەڕی قڕکردنی ڕەگەزپەرستانە لە کوردستان بوەستێنێ، یان بەلای کەمەوە لیژنەیەك بنێرن بۆ گەڕان بە دوای ڕاستیدا و نێوانکـارێکی نێودەوڵـەتی بنێـرن بـۆ کوردسـتان بـۆ کارکردن بۆ چارەسەری ئەو ناکۆکییە کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تاوی سەندووە.

خاوەنی خامەت، قووڵترین ڕێزو و تەقدیرم قەبووڵ بفەرموون.

**مستەفا بارزانی**

**سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش- کوردستان**

**تشرینی یەکەمی ١٩٦٩**

سەرچاوە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەرگی سێیەم — بەشی یەکەم، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١ — ١٩٧٥، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، چـاپی یەکەم، ل٤٢٦-٤٢٩.

## پاشکۆی سێیەم

**بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان**

**خاوەن شکۆ و سیادەتی پاشا و سەرۆکە بەڕێزەکانی دەوڵەتە ئیسلامییەکان**

مایەی شەڕەفە بۆ من کە بەبۆنەی گرتنی کۆنگرە بەرزەکەتان گەرمترین سڵاو و جوانترین ئاواتتان پێشکێش بکەم و، لە خوای گەورەش داوا دەکەم کە سەرکەوتووتان بکات بۆ هەموو شتێك کە خێری گەلانی ئیسلامی و پاراستنی یەکەتیی و پارێزگاری کردنی بەرژەوەندییەکانی گەلانی ئیسلامی و بەرزکردنەوەی وشەی هەق و دادپەروەریی لە هەموو لایەکدا تێدابێت، دوای ئەوە من بەستنی ئەم کۆنگرە پیرۆزە دەقۆزمەوە، تا ئەو زوڵم و زۆریەی لە گەلێکی موسڵمان دەکرێت بخەمە بەرچاوتان کە لەوەتی چووەتە سەر ئەو دینە پیرۆزە، لە پێشەوەی ئەو کەسانەدا بووە کە بەرگرییان لێ کردووە و پابەندی بیروباوەڕە راستەکانی و ڕێنوێنییە باڵاکانی بووە.

خاوەنانی شکۆو سیادە، بێگومان ئێوە ئاگاتان لە واقیعی ئازاراوی گەلی کورد لە عێراق هەیە، ئەوەتەی دەوڵەتی عێراق پێش نیو سەدە زەمان دامەزراوە و چەندان شۆڕشی دژی زوڵم و زۆرداری کردووە، هەروەها شەڕی براکوژی کە لە ساڵی ١٩٦١ ەوە بە سەرماندا سەپێنراوە، هەروەها داکۆکیکردن لە بوونی خۆمان کە هەمیشە کەوتووەتە بەر زوڵم و چەوسانەوە و هێشتاش هەر وایە لەبەر ئەو سیاسەتی دووبەرەکی نانەوە و جیاوازیخوازییەی

حکوومەتە یەك لە دوای یەکە عێراقییەکان لــە دژیــدا پێڕەویــان کــردووە و دەیکــەن بــە پێچەوانەی ئەو چەمکی برایەتی ئیسلامی و گەلاڵەی مافەکانی مرۆڤ و ئەو بنەمایانەی لە ڕووی نێودەوڵەتییەوە دانیان پیانراوە.

ئــەو شــەڕە داخاوییــە دڵتەزێنــە لــە ١١ی ئــاداری ١٩٧٠دا لــە ئــەنجامی ئــەو ڕێککەوتننامەیەی لە نێوان ئێمە و حکوومەتی عێراقدا بەسترا، وەستا. حکوومەت بەپێی ئەوە دانی بە مافەکانی گەلی کورد  دانا لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆی لەنێو چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا و وەدیهێنانی ئەوە لە ماوەی چــوار ســاڵ و لــەو ماوەیــەدا چاکســازیی گشتی لە هەموو لایەکی ژیان لە کوردستان دێتە جێبەجێکردن بۆ قەرەبووکردنەوەی ئــەو زیان و ماڵوێرانییەی تووشی هاتووە و، ئەو پێشکەوتن و ئاوەدانییەی لە کیسی چــووە و، ئامادەکردنی وڵات بۆ جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا لە یازدەی ئاداری ئەمساڵ.

ئێمە لەم ماوەیەدا لە دوایین ئەو ڕۆژانەی تەمەنی مایەوەی ڕێککەوتننامەی ئــاداردا دەژین و ئەوەی دەبێتە هۆی تالاّوو هیوابڕاوی ئەوەیە ئاماژە بەو ڕووداوە ورووژێنەروزوڵمە زۆرانە  بکەین، کە لە ماوەی ئەو چوار ساڵەی ڕابردووەدا بەسەر گەلەکەمان هاتن و هیچ نیشانەیەکیش دیارنییە، کە حکوومەتی عێراق ئامادەییی ئەوەی هەبێ بەڵێنەکانی خــۆی بەجێ بهێنێ، بگرە بە پێچەوانەی ئەوەوە، هەموو بەڵگەو نیشانەیەك جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە حکوومەت نیازی وایە ئۆپەراسیۆنی ســەربازی دژمــان دەســت پــێ بکاتــەوە و بگەڕێتــەوە بــۆ پێڕەوکردنــی سیاســەتی زۆرداری و هێــزی داگیرکەرانــە و لــە نێــوبردنی موسڵمانانی بێ بەرگری و، ئەوانەی نایانەوێ کوێرانە گوێڕایەڵیی ڕەفتارەکانی بن کە بــە تــەواوەتی لــە ڕێنــوێنیی ئاینەکــەمان دوورن و دژی ئــەو دەقانەشــن کــە لــە نێوانماندا ڕێککەوتنیان لەسەرکرابوو و دژی هەموو شەریعەت و بەهایەکن کە لە نێوان مرۆڤایەتیدا لە سەریان پێك هاتوون و ڕێگەی ئەوەشمان پێ بدەن ئەو نموونانەی خوارەوەتان وەك نموونە، بۆ بێنینەوە:

١- ڕێککەوتننامەکە ئەنجامدانی سەرژمێرییەکی بێ گەردی دانیشتوانی تێــدابوو بە مەبەستی چەسپاندنی ئەو ناوچانەی ئۆتۆنۆمی دەیانگرێتەوە، بە مــەرجێك ئەمــە لــە

ساڵی یەکەمی بەستنی ڕێککەوتننامەکەدا ئەنجام بدرێت، بەڵام حکوومەت لە کاتی خۆیدا نەیویست هاوکاریمان لە گەڵدا بکات و ئەو سەرژمێرییەی دواخست بۆ کاتێکی دیاری نەکراو و دەستی کرد بە قۆستنەوەی ئەو هەلە بۆ بەزۆر دەرکردنی هاولاتییە کوردەکان لەسەر ماڵ و حاڵ و گوندەکانی خۆیان، بەتایبەتیش لەو ناوچانەی نەوتیان زۆرە و، نیشتەجێکردنی لایەنگرانی خۆی لە خێڵە عارەبەکان کە لە دەرەوەی ناوچەکانی کوردەوارییەوە هێنابوونی، بۆ ئەوەی لەو گوندانە دانیشن بە پێچەوانەی هەق و دادپەروەری و بۆ هەڵایساندنی ڕق و کینە لە نێوان موسڵمانی عارەب و کورد لە عێراقدا.

٢- حکوومەتی عێراق لە ماوەی ١٩٧٢ زیاتر لە ٥٠هەزار هاوولاتی پەنجا هەزار هاوولاتی کوردی لە خەڵکی بغداد و ناوچەکانی تر عێراقی بە شێوەەکی دڕندانە بۆ دەرەوەی سنوور دەرکرد، بە جۆرێك کە دژ دەوەستێ لە گەڵ ئەو بنچینانەی لە نێوان ئێمەو ئەواندا ڕێککەوتنیان لە سەر کرابوو، لە مامەڵەکردن لە گەڵ ئەو هاولاتیانەداو، هەروەها لە گەڵ کەمترین بیرو باوەڕو مافی مرۆڤ ڕێك ناکەوێت بە بیانووی ئەوەی ئەمانە لە بنەچەی ئێرانین.

٣- دەسەلاتدارانی عێراق لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا چەندان شالاوی سەربازی و بەسەردادانی بۆ سەر ناوچە جیاجیاکانی کوردستان ڕێك خستووە، کە سەدان کورد بوون بە قوربانی و هەزاران کوردیش دەربەدەرکران و چەندان گوندی بێ دیفاع و بێ تاوانیش سووتێنران، هەروەك لە شارو شارۆچکەکانی مووسڵ و کەرکووك و خانەقین و بارزان و شنگار و هی تردا ڕووی دا.

٤- دامودەزگاکانی دەولەتی عێراق گەلێك پیلانیان ساز کردووە بۆ تیرۆرکردنی سەرکردە و بەرپرسانی کورد و ڕەنگە دیارترین و ڕیسواترینی ئەو پیلانانە هەوڵدانە سەرنەگرتووەکەی حکوومەت بوو بۆ تیرۆرکردنی من لە ساڵی١٩٧١ و بە ڕێگەیەکی شەڕخوازانە، کە مرۆڤێکی خاوەن ئینساف بیری لێ ناکاتەوە و، دەسەلاتداریەتی، خوشەویستی و ڕێزی ئێمەی بۆ پیاوانی ئاینی و بەگەورەگرتنیانی بەکارهێنا ئەوە بوو شاندێکی پێك هێنا تێکەڵ لە هەندێك زانایانی ئاینی و هەندێ تاوانبار و پیاوکوژ کە جلوبەرگی پیاوانی ئاینییان پۆشیبوو و، ناردنی بۆ لای من، بە بیانووی ئەوەی پڕۆژەیەکی

ڕێکەوتن دەخەنە پێشمان، لە کاتێکدا چەندان جۆرە بۆمباو تەقەمەنیی جیاجیایان لە ژێر جلەییەکاندا شاردبووەوە، بۆ ئەوەی لە کاتی کۆبوونەوەدا بیانتەقێننەوە و ئەوەیان بەوردی و لێزانانە ئەنجام دا، بەلاّم خوای گەورە لە فڕوفێڵەکەیان پاراستمی و تەقەمەنییەکان شاندە شەڕانییەکەی لە کاتی کۆبوونەوەکەدا لە نێوبرد و، هەندێ پاسەوانی بەری و بێ تاوان بوون بە قوربانی ئەم پیلانە و بۆ هەولێکی تر بۆ هەمان ئامانج، دەسەلاّتداریەتی کەسێکی بە سیفەتی پەیامنێری ڕۆژنامەنووسی نارد کە جانتایەکی پڕ تەقەمەنیی پێ بوو، بەلاّم پێش ئەوەی لە ١٥ی تەمموزی ١٩٧٢دا تاوانەکەی جێبەجێ بکات، کارەکەی ئاشکرابوو.

٥- دەسەلاّتداریەتی بۆنەی هاوکاریکردنی خۆی لەگەڵ حزبی شیوعی عێراقی لە ناوەراستی پار بەهەل زانی بۆ فیتنە و ئاژاوەنانەوە لە کوردستان و بوونی ڕێکخراوی حزبی ناوبراوی لە ناوچەی کوردەواریدا بەکارهێنا بۆ تێکدانی ئاسایش و ئارامی لە ناوچەکەدا و دروستکردنی کەشوهەوای بارگرژی و تەنگژە نانەوە بۆ ئەوەی پاساو بدۆزێتەوە و شەڕێکی تازە دژی گەلەکەمان هەڵیسێنێ.

ئێمە لە کاتێکدا ئەو حاڵە خراپەی کە گەلی کوردمان بەدەستیەوە دەناڵێنێ دەخەینە ڕوو بۆ پایەبەرزیتان، بە پێویستی دەزانین ئاماژە بەوە بکەین کە برا عارەبە موسڵمانەکانیش لە عێراقدا هەروەها دووچاری شوێنەواری سیاسەتی ئەو حوکمە بوونەتەوە لە ئازادی و بژێوی خۆیان لەبەر سروشتی ئەو حوکمە ناباوە و هەوڵ و تەقەلادانی بۆ ئەوەی دەسەلاّتی خۆی بەزەبری هێز بەسەر گەلی عێراقدا بسەپێنێ دوور لە شوراو شێوازی دەستووری و دیموکراسی لە هەڵسوڕاندنی جلەوی حوکمدا.

لە ڕێی خستنەرووی ئەو ڕاستیيانەی سەرەوە، من هەست بەوە دەکەم و هەروەها خەڵکێکی زۆری تریش دەرك بەوە دەکەن، کە بارودۆخی گشتی عێراق سەرلە نوێ بەرەو خراپی و ئاڵۆزی و شیمانەی شەڕ هەڵگیرسانەوە و خوێن ڕشتنی موسڵمانان دەچێت و، ئێمەش لە بەرامبەر ئەوەدا ناچارین ڕو لە ئێوە بکەین لەبەر ئەو دەسەلاّتە مەزنە و پایەبەرزییەی لە جیهانی ئیسلامەتیدا هەتانە، تکامان وایە هەوڵ و تەقەلای چاکە و خێرخوازانەی خۆتان بدەن، تاکو ئەو بەڵێنانە لە ڕێککەوتننامەی ئاداردا بە گەلی کوردی دابوو جێبەجێیان بکات و، بەگشتیش بەدەنگ داواکارییەکانی گەلی عێراقەوە بێت لە

ئاشتی و برایەتی و دادپەروەری و یەکسانیی لـە مـاف و ئەرکـدا (انما المؤمنـون اخـوه، فأصلحوا بين أخويكم واتقوا الله لعلكم ترحمون) صدق الله العظيم.

لە کوتاییدا لە خوای گـەورەمان داوایـە کـە سـەرتان بخـات و قاچـتان بچەسـپێنێ و سەرکەوتووتان کات بۆ ئەوشتانەی خێریان بۆ موسـڵمانان تێدایـە و خـوا پشـت و پـەنای سەرکەوتنە.

**والسلام عليكم ورحمه الله وبركاته**

**دڵسۆزتان**

**مستەفا بارزانی**

**١٩٧٤/٢/١٦**

سەرچاوە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەرگی سێیەم — بەشی یەکەم، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١ — ١٩٧٥، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، چـاپی یەکەم، ل٥١٩ — ٥٢١.

## پاشکۆی چوارەم

یاداشتی بارزانی بۆ دەوڵەتانی بیٚ لایەن

سەرۆکایەتی لوتکەی چوارەمی دەوڵەتانی بێلایەن

گەلانی جیهان و گەلی کوردمان روویان لە پایتەختی جەزائیرە کاتیٚ کۆنگرەی چوارەمی دەوڵەتانی بێلایەن لە بارودۆخێکی زۆر گرنگدا دەبەسترێت، کە داوا دەکات کۆشش بکرێت بۆ چارەسەری مەسەلە نێودەوڵەتی و نیستیمانیە هەنوکەییە پێویستیەکان کە رووبەڕووی گەلانی ئەم دەوڵەتانە دەبێتەوە، بە گوێرەی بەرژەوەندی هاوبەشی نیشتیمانی.

ئەوانەی بە شێوەیەکی تایبەتی روویان لە کۆنگرەکەتانە، چاوی گەلانی زوڵملێکراوو بێدەرەتانە، لە کاتێکدا خۆتان نوێنەرایەتی ئەو گەلانە دەکەن کە ژیاون و دەژین لە بارێکی وێك چووی ئەوەی کە ئەمڕۆ گەلانی چەوساوەی تێدا دەژین. بزووتنەوەی بێلایەن دەستکەوتی زۆر گرنگی بۆ بەرژەوەندی گەلانی جیهان لە میانەی کۆنگرەکانی پێشوو بە دەست هێناوە کە لە بەلگرادو قاهیرەو لوساکا بەسترا، هەروەها بەرپرسیارێتی گەورەی لە جیهاندا هەیە و لە توانایدایە کەشێکی نێودەوڵەتی کراوە بێنێتە دی تا زۆر لە گەلانی جیهان بتوانن بگەنە خواستە نەتەوەیی و ئازادی و سەوبەخۆکانیان.

گەلانی جیهان روویان لە کۆنگرەکەتانەو هیوا دەخوازن کە پرینسیپە بەبەهاکان لە دژایەتی ئیمپریالیزم و ئەو هەڕەشانەی کە رووبەڕووی ئاسایشی گەلان و چەوساندنەوەو

زەوت کردنیان دەبنەوە  وەرگەڕێننە سەر ئەرزی واقیع و، هەروەها لە پێناو هاریکاری نێودەوڵەتی بۆ چارەسەری بابەتە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان وە بۆ پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ گەلان بۆ بەدیهێنانی ئاواتە رەواکانیان کە خۆی لە ئازادی و سەربەخۆییدا دەبینێتەوە بۆ ئەوەی کەشێك بێتە ئاراوە کە بنەمای نویٚ بۆ پەیوەندیە نێودەولەتیەکان و هاریکاری نێوان گەلانی تازە گەشەسەندوو لە جیهاندا وە لەسەر ئاستی خودی  یەك دەولەتیش کە زیاتر لە نەتەوەیەکی تێدا دەژێت بێتە ئاراوە.

زۆر لە دەولەتانی بێلایەن، زیاتر لە نەتەوەیەکی تێدا  دەژی و نەتەوە بچوکەکان چەوساندنەوەی زۆریان تێدا دیتووە (دوو لایەنە) لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا. تا ئێستاش ئەم گەلە بچووکانە بە دەست چەوساندنەوەی نەتەوەیی دەناڵێنن کە دوای ئازادی دەولەتەکە لە دەستی چەوساندنەوەی ئیمپریالیزم چەوساندنەوەیان هەر بەردەوام بووە، نەك هەر ئەمە بەڵکو بە هۆی بەرتەسکی ئاسۆی فەرمانڕەوایان و فەشەلهێنانیان لە بۆ وەڵامی داواکاریەکانی ژیانی هاوچەرخ و دەرکەوتنی مەسەلەی نیشتیمانی وەك مەسەلەیەکی بەپەلەو خێرا، ئەم چەوساندنەوەیە لە هەندیٚ لە دەولەتان شێوازی مەترسیدارتری بە خۆوە دیتووە لەوەی کە لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا هەبوو، ئەمەش بوو وە دەبێتە  هۆی بە بن دەستگەیشتنی ئەم دەولەتانە لە وەی روو بکەنە چارەسەری هەڵە بۆ مەسەلە نیشتیمانیەکان لە جیاتی دۆزینەوەی چارەسەرێکی دروست و باش بۆ ئەم مەسەلانە بە تایبەت مەسەلە نەتەوەییەکان.

گەلی کوردمان کە یەکێکە لە گەلە سەرەکیەکانی ناوچەی رۆژهەلاتی ناوین، زۆری بەد ەستی چەوساندنەوەی بێگانە چەشتووە ، بەردەوام لە حاڵەتی شۆڕش و تێکۆشانی بەردەوامدا بووە لە پێناو مافە نەتەوەیی و دیموکراتیەکانی، ئەمڕۆش چاوی لە گەلانی جیهانە، بەتایبەت لە دەولەتەکانتان و گەلەکانتان کە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەن لە پێناو بەدیهێنانی ئاواتەکانی کە ئاواتی هاوبەشی نێوان هەموو گەلانە.

گەلی کوردمان لە عێراقدا خەباتی بێوچانی کردووە  شۆڕش و بەرخۆدانەکانی سالەهایە بەردەوام بوون و قوربانی زۆری پێشکەش کردووە.. دوایەمینیان شۆڕشی بەرگری بوو کە دە ساڵ بەردەوام بوو کە سەرئەنجام توانی دانپێدانانی حکومەتی عێراقی بە دەست بێنێت کە خاوەنی حوکمی زاتی بێت لە چوارچێوەی دەولەتی کۆماری

عێراقدا، بە مەرجێك لە ماوەی چوار ساڵدا جێبەجێ ببێت لە ڕۆژی بەستنی ڕێككەوتننامەدا كە لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤دا كۆتایی پێ دێت.گەلی كوردمان و بەڵكو گەلی عێراق بە گشتی و هەموو گەلانی عەرەبی دڵخۆشییان بەم دەرئەنجامە دەربڕی وەك ڕێگەیەكی دروستی توندوتۆڵكردنی پەیوەندی هاوبەشی هەردوو گەلی كورد و عەرەب كە لە باریدا هەیە پشتگیری بەرەی نیشتیمانی بكات و خەباتی هاوبەشی هەردوو گەل بۆ گەیشتن بە ئامانجە هاوبەشەكان بە هێز بكات.

لە كاتێكدا لە یادی بیرەوەری چوارەم ساڵی ڕێككەوتننامەی ئازار و وادەی كۆتایی جێبەجێكردنی حوكمی زاتی نزیك دەبینەوە، ئەوا مەسەلەی گرنگ و گرفتی حەقیقی ڕووبەڕووی ئەم جێبەجێكردنە دەبنەوە بەڵكو ڕێگریشن لە جێبەجێكردنی. لە نێوان ئەو كێشەو گرفتە مەترسیدارانەیە كە هەوڵ و بەرنامەڕێژی وورد دەكرێت بە مەبەستی گۆڕانی حەقیقەتی بوونی نەتەوەیی لە وولاتەكەماندا بە هۆكاری نەتەوەیی بەرتەسك، هەروەها پشت گوێ خستنی گەشەپێدانی ناوچەی كوردی و هەوڵدانی لاوازكردنی ڕۆڵی بزووتنەوەی كوردی و پارتی دیموكراتی كوردستان لە ژیانی سیاسی وولاتدا.

ئێمە لە كاتێكدا ئەم یاداشتەتان پێشكەش دەكەین، دەمانەوێ سەرنجتان بۆ ئەم مەسەلەیە رابكێشین و هیوادارین كە كاریگەری و هێزو تواناتان لە پشتگیری ئاواتەكانی گەلی كوردستان كە بریتییە لە حوكمی زاتی بۆ كوردستان لە چوارچێوەی كۆماری عێراقدا بخەنە كارو لە پێناو گەشەپێدانی وولات و بەشداری كارا لە بەڕێوەبردنی، ڕەخساندنی دەرفەتی بە هێزكردنی برایەتی كوردو عەرەب دوور لە داواكانی هەڵمەتی ڕەگەزپەرستی كە بەشێكە لە سیاسەتەكانی سەردەمی ئیمپریالیزم و بەردەوامبونی، وە لە پێناو ئاراستە كردنی تواناكانی وولات بۆ گەشەپێدان و بە دیهێنانی بەرژەوەندی هەردوو گەل.

ئێمە پێمان وایە كە كۆنگرەی دەوڵەتانی بێلایەن لە سەریەتی چاو بخشێنێتەوە لە مەسەلەی نەتەوەیی لە دەوڵەتانی بەشداربوو گفتو گۆكردنی هۆو كاریگەریەكانی لە پێناو گەیشتن بە دارشتنێكی گونجاو بۆ هەموو ئەم مەسەلانە بە شێوەیەك كە بۆ دەوڵەتانی پەیوەندار كۆشش و تێچونی زۆر دابین دەكات كە زۆر پێویستیەتی بۆ سەرف

کردنــی لــه پرۆژەکــانی گەشــەپێدان بــۆ تــەواوکردنی ئەرکــەکانی ئــازادی ئــابووری و دامەزراندنی دەوڵەتی هاوچەرخ لە هەموو رووبەکەوە.

لە کاتێکدا بە بایەخەوە چاوەدێری کۆنگرەکەتان دەکەین، باوەڕی قوڵمان وایــە کــە بەستنی لەم رۆژانــەدا وەك هــەنگاوێکی گەورەیــە بــۆ پێشــەوە لــە پێنــاو چەســپاندنی پرینسیپەکانی بێلایەنی و دابین کردنی ژیانێکی باشتر لە جیهانێکدا کە گیانی برایــەتی لە سەر ئالای ئاشتی بشەکێتەوە.

**دڵسۆزتان**

**مستەفا بارزانی**

**سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان**

**ئابی ١٩٧٣**

سەرچاوە: گۆڤاری الکادر، مجلة نظرية يصدرها الحزب الديموكراتي الكردستانى، العدد ٢٠، السنة الخامسة، تشرين لثانى ١٩٧٣، ص١٧-٢٠.

❖ لەلایەن دانەرەوە لە عەرەبییەوە وەرگێڕراوە.

- **عوسمان عەلی حەسەن وەیسی.**
- بەرواری ٣٠-١١- ١٩٧٣ لە گوندی ئەشكەنەی بناری پشدەر لە خانەوادەیەكی جوتیاری ناسراوی ناوچەكە لە دایك بووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی بە سەركەوتوویی لە پشدەرو سلێمانی تەواو كردووە.
- لە پێنجەمی ئامادەییەوە پەیوەندی سیاسی لە گەڵ پارتیدا دروست دەكات و (بەدرێژایی خوێندن دەرچووی یەكەم و مەعفوی عام دەبێت)، بە هۆی گومانی سیاسی بڕوانامەی پێنجەمی ئامادەیی پێ نادرێت، دوای گواستنەوەی لە دەڤەری پشدەر لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە نمرەكان وەردەگرێت.
- بە پلەیەكی باڵا دەردەچێت، بەڵام ناتوانێ لە زانكۆ نمرە بەرزەكان بخوێنێت و دوای راپەڕین ساڵی ١٩٩٥ بكالوریوس لە یاسا لە زانكۆی سەلاحەددین وەردەگرێت.
- ساڵی ١٩٩٥-١٩٩٦ دەبێتە ئەندامی لیژنەی یاسایی و مافی مرۆڤی پارتی دیموكراتی كوردستان.
- ساڵی ١٩٩٨ پلەی یەكەم لە پەیمانگەی كادیرانی پارتی بە دەست دێنێت.
- ساڵی ٢٠٠٥ بە پلەی یەكەم ماستەری لە یاسای گشتی وەرگرتووە.
- ئەم كتێبانەی بە چاپ گەیاندووە:
  - تیرۆری نێودەوڵەتی بە زمانی عەرەبی، نامەی ماستەر، ٢٠٠٦.
  - تیرۆر - جۆرەكان و شێوازەكانی رووبەڕووبوونەوە، ٢٠٠٦.
  - بەشداری سیاسی پارتە سیاسییەكان (ئامادەیە بۆ چاپ)، ٢٠٠٨.
  - دەروازەیەك بۆ یاسای گشتیی نێودەوڵەتی.
- لە ساڵی ١٩٩٢ـەوە لە رۆژنامە و گۆڤارەكان دەنووسێت.

چەند توێژینەوەیەکی هەیە، لەوانە:

- الآرهاب الدولي والتدخل في الدول،، **مجلة** پارێزەر، **العدد ٧**، ٢٠٠٥.
- العولمة الآقتصادية والكورد، **مجلة** تەرازوو، **العدد ٢٠-٢١**، ٢٠٠٤.
- جريمة الرشوة، **مجلة** تەرازوو، **العدد ٢٤**، ٢٠٠٥.
- الوضعية القانونية، **مجلة** پارێزەر، **العدد ٩**، ٢٠٠٥.
- رووبەرووبوونەوەی توندو تیژی، تاك – كۆمەڵ – دەسەڵات ، **مجله** پارێزەر، **العدد** ٢٠٠٦.
- البعد القانوني لحقوق الآنسان، **مجلة** تەرازوو الآكاديمي، **العدد ٢٩ – ٣٠**، ٢٠٠٦.
- دەسەڵاتەكانی سەرۆكی هەرێمی كوردستان لە روانگەی یاسای دەستوریەوە، گۆڤاری توێژینەوەی ئەكادیمی، ژمارە ١٠، ٢٠٠٧.
- رووە لێكچوو جیاوازەكانی نێوان یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی و یاسای نێودەوڵەتی بۆ مافەكانی مرۆڤ، گۆڤاری تەرازوو، ژمارە ٣٢- ٣٣، ٢٠٠٨.
- وەزیفەكانی حزبی سیاسی، گۆڤاری شرۆڤە، ژمارە ٤، ٢٠٠٨.
- كادر رایەڵەی پەیوەندی حزب و جەماوەر، گۆڤاری شرۆڤە، ژمارە (٥)، ٢٠٠٨.

- پاڵێوراوی لستی هاوپەیمانی كوردستانە بۆ ئەنجومونی نوێنەرانی بەغداد.
- بەشداری راهێنانی یاسایی و دیموكراتیەتی كردووە لە ناوخۆو دەرەوەی وولات.
- لە ساڵی ٢٠٠٥ەوە مامۆستایە لە كۆلێژی یاساو وانە بێژ بووە لە كۆلێژی زانستە رامیاریەكان و بەشی كارگێڕیی یاسای پەیمانگەی تەكنیكی.